ئەریك فرۆم

40



# قەیرانی دەروونشیکاری

چاپی یەكەم
2005

وەرگێڕانی:
هەژار جوانڕۆیی

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە (٤٠)

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب:قەیرانی دەروونشیکاری

نوسینی:ئەریك فرۆم

وەرگێڕانی: هەژار جوانرۆیی

شوێنی چاپ : چاپەمەنی گەنج

نەخشەسازی: فوادکەوڵۆسی

ساڵی چاپ : 2005

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠دانە

# پێرست

# پێشەکی

ئەم کتێبە زەنجیرە وتارێك لە خۆدەگرێت کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٢- ١٩٦٢ نوسراوە وناواخنی هاوبەشیان پەیوەندی بەرانبەری نێوان هۆکارەکانی کۆمەڵناسی ودەروونناسییە . من بۆ ئەوە بڕیارم دا ئەم وتارانە کە سەرەتا بە زمانی ئەڵمانی بەڵاو کرابوونەوە، دوبارە بڵاو بکەمەوە کە هێشتاش بنج و بناغەی دواین بەرهەمم لەم بوارانەدا بە باشترین شێوە دەخرێنە روو . لە لایەکی ترەوە هێشتاش گفت و گۆیەکی زۆر لەم بارەیەوە، بە تایبەت سەبارەت بە بۆچوونەکانی مارکس و فرۆید لە ئارادایە و بە داخەوە ئەم گفت و گۆیانە ئاماتۆری و پڕلە هەڵە دێنە بەر چاو. من زۆر دەستم وەرنەدایە ناوەڕۆکی ئەم وتارانە ، بەڵام ئەگەر لەم کاتەدا بمنوسیبا، بە گوێرەی تیوری لیبیدۆی فرۆید نەمدەنوسین، بە هەر حاڵ ئەم کارە تا ئەو شوێنەی گرێدراوی پرسی گشتی بێت، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکەدا نییە. لە هەمبەر ئەم فیکرە کە گۆڕانکارییەکی ناوەڕۆکی لەم وتارانەدا ئەنجام بدەم ، خۆڕاگریم کرد . بەڵام ئەو گۆڕانکارییانەی کە بە درێژایی ئەم ساڵانە لە شێوازی بیرکردنەوە وتیورییەکانمدا روویان داوە وەك تێبینی لە خوارەوەی لاپەڕەکەدا باسم کردون. تەنها گۆڕانکارییەك کە ئەنجام دراوە کورتکردنەوەی وتارەکانە لەو شوێنانەدا کە زۆر بە تێرو

تەسەلی باس کراون و یا خود لەو شوێنانەدا کە هەندێك خاڵی نا پێویست و کەم بایەخ هاتووە کە لەم سەردەمەدا گرنگی خۆیانیان لە دەست داوە. سەرەڕای ئەمەش بڕگەکانی ئەم کتێبە نە تەنها لە لایەنی شێوازی نوسینەوە هەندێك لێك جیاوازن، بەڵکولە هەندێك شوێنیشدا دوپات بوونەوەی تێدایە.

وتاری یەکەم " قەیرانی دەروونشیکاری" تایبەت بەم کۆمەڵە وتارە نوسراوە (هەر وەها وتاری هەشتەم لە بن ناوی گرنگی مافی دایك لەم سەردەمەدا ). ئەم وتارە کە سەبارەت بە تیوری چارەسەری دەروونشیکارییە، هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی پێگەیشتن و فراوانبوونی دەروونشیکاری لێك دەداتەوە. و هەروەها وتاری دووهەمیش لێك دانەوەیەکە سەبارەت بە "مرۆڤی مودێلی فرۆید".

بڕگەکانی ئەم کتێبە بە گوێرەی ناوەڕۆك لە یەك جیاوازن ،چوونکە لە هەل و مەرجی جۆراوجۆردا نوسراون. هەر بەم بۆنەیەوە لە هەندێك نمونەدا دەستێوەردانی بڕگەکان بەر چاو دەکەوێت، هەڵبەت دەمانتوانی بابەتە تیکرارییەکان بە لاوە بنێن ، بەڵام لەو حاڵەتەدا وتارەکە تێك دەچوو، بە تایبەت کە بابەتە دوپاتکراوەکان یەکچەشن نین و ئەو بۆچوونانە کە سەبارەت بە شتێکی تایبەت باس کراوە زیاتر شرۆڤە دەکەن، لەم رووەوە لە ڕوانگەی شرۆڤەکردنی بابەتەکانەوە تەواوکەری یەکدین.

وتارەکەی "قەیرانی دەروونشیکاری " کۆ کراوەی ئەو ئەندیشەگەلەیە کە بە شێوەی کتێبێکی تێرو تەسەلتر لە بن ناوی "دەروونشیکاری مرۆیی" لە داهاتوودا بەلاو دەکرێتەوە. هەندێك لە

بەشـەکانی ئـەم کتێبـە لـە لایـەن ڕێکخـراوی نەتـەوەیی تەندروسـتی دەروونی، گرێدراوی وەزارەتی تەندروستی ئەمریکاوە پەسەند کراون.

لە کۆتاییدا سپاسی جەنابی جۆزف کۆیین دەکەم کە لە هەڵەبڕی دەست نوسەکانمدا یارمەتی دام. وهەر وەها سپاسی دوکتۆر جرۆم برامز دەکەم بە بۆنەی ئەو یارمەتییە پڕ بایەخەی کە لە دەروونناسی نەفسدا پێشکەشی کردم.

***ئەریك فرۆم***

# ١- قەیرانی دەروونشیکاری

لەم سەردەمەدا دەروونشیکاری توشی قەیران هاتووە. ئاماژەی ڕواڵەتی ئەم قەیرانە کەمبوونەوەی ژمارەی خوێندکاران و هەر وەها دابەزینی ڕێژەی چوونی نەخۆشەکانە بۆ لای دەروونشیکار بە مەبەستی چارەسەری. لە هەمبەر دەروونشیکارەکان هەندێك ڕکەبەر سەریان هەڵداوە کە لافی ئەوە لێدەدەن دەتوانن بە خەرجێکی کەمتر ولە ماوەیەکی کورتتردا نەخۆشینەکان چارەسەر بکەن. دەروونشیکار کە تا ١٠ ساڵ لەمەوبەر تەنها کەسی متمانەپێکراو بۆ چارەسەری تێکچوونە دەروونییەکانی چینی مامناوەندی شارنشین لە قەڵەم دەدرا، هەنووکە لە هەمبەر ڕکەبەرەکانیان هەڵوێستی بەرگری کردنیان وەرگرتووە و پۆستی قۆرخکراوی خۆیانیان لە دەست داوە.

بە مەبەستی تێگەیشتن لەم قەیرانە دەبێ سەرەتا چاوێك بە مێژوویی چارەسەری دەروونشیکاردا بخشێنینەوە. نیزیکەی نیو سەدە لەمەوبەر دەروونشیکاری سەری هەڵدا و لە لایەنی ئابوورییەوە بازاڕێکی تازەی کردەوە. تا ئەو کاتە تەنها بۆ چارەسەری شێتەکان یاخود نەخۆشینە توندەکانی دەروونی سەردانی دەروونناس دەکرا. چارەسەر کردنی نەخۆشەکانی دیکەی دەروونی لە لایەن پیاوە ئایینییەکان ویاخود دوکتۆری بنەماڵەوە ئەنجام دەدرا، و لە زۆربەی نمونەکاندا نەخۆش ناچار بوو ئازارو نارەحەتی خۆی لە بێدەنگی و گۆشەگیریدا تەحەمول بکات.

فرۆید لە سەرەتای کاری خۆیدا سەرقاڵی هەندێك نەخۆش دەبوو هەرچەند کە گیرۆدەی هەندێك نارەحەتی وەك نیگەرانی، دڵەراوکێ و هیستری بوون، بەڵام ناوی نەخۆشیان لێنەدەنرا وبە نەخۆشی پسیکۆز Psychotic لە قەڵەم نەدەدران. وردە وردە چوارچێوەی دەروونشیکاری پەرەی سەند و سەبارەت بەو کەسانەش کە بە نەخۆش لە قەڵەم نەدەدران بە کار هات. نەخۆشەکان لە نەبوونی هەستی خۆشحاڵی وچێژ وەرگرتن لە ژیان، لە زەواجی سەرنەکەوتوو، لە نیگەرانی گشتی، لە هەست بە ئازارو تەنیایی، لە نەبوونی توانای ئەنجامدانی کار و...هتد گازەندەیان دەکرد. بە پێچەوانەی رابردوو ئەم نارەحەتییانە "نەخۆشی" لە قەڵەم دەدران و"یارمەتیدەرێکی"نوێ کە هەمان دەروونشیکارە، دەبوایە " گرفتەکانی ژیان " ی ئەوان چارەسەربکات. لە حاڵێکدا تا ئەوکاتە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە یارمەتی پسپۆڕانە پێویست نەبوو.

ئەم پەرەسەندن وکامڵ بوونە بەشەوێك دروست نەبوو، بەڵام بوو بە هۆکارێکی گرنگ لە ژیانی چینی مامناوەندی شارنشین، بە تایبەت لە ئەمریکادا . تا چەند ساڵ لەمەوبەر بۆخەڵکی چینی ناوەڕاست، سەردانی دەروون شیکار وەك سەردانی کڵێسا یان شوێنێکی پیرۆز کارێکی ئاسایی لە قەڵەم دەدرا .

تێگەیشتن لە هۆکارەکانی گەشەوبرەوی دەروون شیکاری دژوار نییە . ئەم سەدەیە ( **سەدەی نیگەرانیەکان** ) تەنیایی و گۆشەگیرییەکی زیاتری لە گەڵ خۆی هێناوە . هەڵوەشانەوەی ئایین ، هیچ وپوچی و بێهودەیی سیاسەت، دەرکەوتنی "مرۆڤی رێکخراوەیی لە

خۆ بێگانە"ی(Alienated organizion man ) چینی مامناوەندی شارنشینی لە هەڵوێستو هەستی ئاسایش لە جیهانی بێواتاو بێ ناوەڕۆکدا، بێ بەش کردوە. هەر چەند کە ژمارەیەکی کەم هەڵوێست وئاراستەیەکی تازەیان لە سورریالیزم ، سیاسەتی رادیکاڵو زەنی بودیزمدا دۆزیوەتەوە، بەڵام، بە شێوەیەکی گشتی تاکی لیبراڵی ریالیست بە دوای فەلسەفەیەکدا دەگەڕێت کە لە ئایدۆلۆژیای ئەودا گۆڕانکاری بنەڕەتی دروست نەکات، واتە لە هاوڕێو هاوچەشنەکانی خۆی"جیاواز" نەبێت.

دەروونشیکاری ئەم خواستەی دابین کرد. تەنانەت ئەگەر نەخۆشیش چارەسەر نەدەبوو، گفتو گۆ لە گەڵ کەسێکدا کە بیسەرێکی بە سەبر بوو و کەم تا زۆر بە هەستی هاوخەمی گوێی لە کێشە وقسەکانی نەخۆش دەگرت، دەبووە هۆی هێوربوونەوە و سووکبوونی باری رۆحی ئەو کەسە. و ئەو پارەیە کە بە دەروونشیکار دەدرا زەرەرێکی ئەوتۆ نەبوو، ورەنگە بە زیانیش لە قەڵەم نەدرابا، چوونکە دانی پارە ،خۆی هۆکارێکی جیدیبوون ،رێزدار بوون وهیواداری بە چارەسەری بوو. دیسان سەردانی دەروونشیکار خۆی جۆرە پرستیژێك بوو، چوونکە لە لایەنی ئابورییەوە راقی دەژمێردرا.

دەرونشیکاری ئەڵترناتیڤێکی بۆ ئایین، سیاسەتو فەلسەفە خستە روو. فرۆید بە گوتەی خۆی تێکڕای نهێنیەکانی ژیانی دۆزیبوەوە. نەست، گرێی ئودیپ، دوپات کردنەوەی ئەزموونی سەردەمی منداڵی لە هەنووکەدا، ئەگەر لەم شتانە تێبگات ئیدی هیچ شتێك لە ڕوانگەی ئەوەوە گوماناوی نییە. و ئەم کەسە دەبوە ئەندامی گروپی (**باتنی** )

کە دەروونشیکار پیاوی ئایینی ئەوە وکەمتر هەست بە تەنیایی و سەرلێشێواوی دەکات .

ئەم کارە بە تایبەت سەبارەت بەو کەسانەی کە نەخۆشییەکی دیاریکراویان نەبوو، بەڵکو ئازاری گشتییان هەبوو راست بوو. ئەوان بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگایەکی راست ودیاریکراو دەبوایە لە چەمکی مرۆڤی لە خۆ بێگانە تێبگەن وبۆیان دەرکەوتبا کە ژیان لە سەر تەوەری **"بوون"** لە باتی ژیان لە سەر تەوەری **"هەبوون"**و**"بەکارهێنان"** چە تایبەتمەندییەکی باشی هەیە ؟ بۆچوونێکی وەها پێویستی بە رەخنەیەکی توند وبنەڕەتی لە کۆمەڵگا هەبوو کە لە پێوەرو بنەما دیار و شارەوەکانی بگیرێت، و بۆ دەستەبەر بوونی ئەم پرسە پێویستە ئەوەندە بوێر بین کە پەیوەندییە هێورکەرەوە وپارێزگاری کەرەکان تێك بدەین و خۆمان بخەینە نێو ریزی کەمینەوە. لە لایەکی ترەوە پێویست بوو رێژەیەکی زۆرتر دەروونشیکارمان هەبێت کە لە نێو تۆڕی دەروونی و رۆحی ژیانی پیشەیی رێکخراوەی قاڵبی وسیبرنتیك[1] دا سنووردا نەبن.

---

[1] cybemtics لە ماشێن و ئاژەڵاندا". ئەم وشەیە بە واتای سیستەمی کاریگەری بەرانبەر لە یەکدی یان گەڕانەوە بۆ کارە کۆنەکانە . بە پەیوەندی بەشە جۆراوجۆرەکانی ماشێنیش سیبرنتیك دەڵێن . لە تێکڕای ئەو بوارانەدا کە کاریگەری بەرانبەری کار و دیسپلین بوونی هەیە ، بە کار دێت . بە تایبەت لە بوارەکانی هونەری ،پزیشکی، دەروونناسی و.... ئەم وشەیە لە لایەن نوربرت وینەرەوە Norbert winer بەم شێوەیە پێناسە کراوە "توێژینەوەی سیستەمەکانی فەرماندەر وپەیوەندی لە نێو ماشێن و ئاژەڵاندا".

بە زۆری دەتوانین "رێکەوتنێکی رێزدارانە" لە نێوان نەخۆش و دەروونشیکاردا ببینین، لە راستیدا ئەم دوانە هیچکامەیان نایانەوێت ببنە هۆی ئەزموونێکی بنەڕەتی تازەی ناسەقامگیر، هەر دوانیان لە چاکبوونەوەیەکی کەمیش رازین وناوشیارانە سپاسی یەکدی دەکەن، چوونکە" رێکەوتنی" نهێنی وناوشیارانەی خۆیان ئاشکرا ناکەن . تا کاتێك نەخۆش سەردان دەکات، قسە دەکات وپارە دەدات ودەروونشیکار گوێی لێ دەگرێت وشرۆڤە ولێکدانەوە دەکات ،یاساکانی **"یاری"**جێ بە جێ کراوە ئەم یارییە بۆ هەر دوو لایەن گونجاو و چێژ بەخشە، بەڵام پێشتر سەردانی دەروون شیکار دەبووە هۆی دورکەوتنەوە لە راستی حاشاهەڵنەگرو ترسناکی ژیان : بڕیار دان وقەبووڵ کردنی مەترسی . کاتێك کە بڕیاردانێکی دژوار – یان تەنانەت ئازاراویی – حاشا هەڵنەگر بوو ئەو کەسەی کە بەسەردان کردنی دەرون شیکار ڕاهاتبوو ململانێیەکی راستە قینەی دەروونی بۆ "نیروتیك" کە پێویستی بە لێکدانەوەیەکی زیاترهەیە دەگواستەوە ، ئەم لێکدانەوەیە ئەوەندە درێژەی کێشا تائەو بارودۆخەی کە بۆ بڕیار دان پێویست بوو لە ناوچوو. نەخۆش و دەروون شیکار دژایەتی یەکدیان نە دەکرد، ئەوانەی کە رێکەوتنێکی نهێنی و ناوشیارانەدا بەشدار بوون ، دژایەتی یەکدیان نە دەکرد . تەنانەت بەڵگەیەکیشیان نەدەهێنایەوە ، چونکە نابێ هیچ شتێك ژیانی ئارامی ئەوان تێك بدات . دیسان چوونکە مشتەری دەروون شیکارەکان رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوون ، لەم رودوە زۆربەی دەرون شیکارەکان کەمتەرخەم بوون ولافی ئەوەیان لێدا کە چوونکە **"بەهای بازاری"** یان زۆرە ، دەبێ "بەهای کاری" شیان

زیاتر ببێت . پشتیوانی کردنی **"یەکێتی ناونەتەوەیی دەروون شیکاری"**[1] فیکرێکی وەهای لە زۆربەی دەروون شیکارەکاندا دروست کردبو کە دوای ئەوەی خوێندنەکەیان تەواو کرد، لە بوارەکەی خۆیاندا گەیشتونەتە**"راستی"** . لە جیهانێکدا کە گەورەیی و هێزی رێکخراو گەرەنتی راستیە، ئەوانیش لە بۆچوونەکەی خۆیاندا تەنها ئەم راستییە گشتییەیان جێ بە جێ دەکرد.

ئایا دەبێ لەوشتانەی کە لەسەرەوە باسمان کرد دەرئەنجامێکی وەها دەربخەین کە دەروون شیکاری گۆڕانکاری پێویست و بنەڕەتی سەبارەت بە خەڵك دروست نەکردوە؟ وئایا دەروون شیکاری خۆی ئامانج بووە نەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجی باڵا ؟ قەت وانییە . ئەم بۆچوونە تەنها بۆ ئەو دەروونشیکار و نەخۆشانە راستە کە لە دەروون شیکاری خراپ کەڵك وەردەگرن نەك لە کارە سەرەکەوتوە جیدییەکانی کەسانی دیکەدا . لە راستیدا نکوڵی کردنی سەرکەوتنی چارەسەری دەروون شیکارانە زیاتر ئاماژە بە گرفت و کێشەی هەندێك نوسەری (مۆدی رۆژ ) لە تێگەیشتن لەو زانیارییە ئاڵوز وپێشکەوتوانە دەکات کە دەروون شیکاری پێیەوە خەریك دەبێت ، نەك ئاماژە بەگرفتی خودی دەروون شیکاری بکات . رەخنەی کەسانێك کە لەم بوارەدا خاوەن ئەزموون نین ناتوانێ ئەو شاهیدانە بێ کاریگەر بکات . کە دەروون شیکار لە چارەسەرکردنی کەسانی گیرۆدەی جۆرە ئازارێکی دەروونی لە بەر دەستیان دایە . گەلێك نەخۆش دوای چارە سەری

---

[1] . International Sychoanalytic Association

هەستی خۆشحاڵی وئاسودەیی وچێژیان بەدەست هێناوە کە جگە لەدەروون شیکاری هیچ شێوازێکی دیکە ناتوانێ گۆڕانکاری وەها پێك بهێنێت . هەڵبەت هەندێکیش چارەسەر نەکراون ویا خود گۆڕانکارییەکی کەمیان تێدا دروست بووە، بەلاّم ئێرە شوێنی لێکدانەوەی ئامارەکانی سەرکەوتنی چارەسەری دەروون شیکاری نییە .

جێگەی سەر سوڕمان نییە کە گەلێك کەس کەوتونەتە بەر کاریگەری ئەوپڕوپاگەندەیە کە بەڵێنی چارەسەری خێراتر وهەرزان تر دەدات . دەروونشیکاری سووك کردن و هێور کردنەوەو چارەسەر کردنی داماوییەکانی مرۆڤی لە ڕێگای یارمەتی پسپۆڕانەوە هەموار کردووە. بە گۆڕینی شێواز بە " کارامەیی" زیاتر و "خێرایی" و"چالاکی گروپی "و بەرفراوان بوونی پێویستی بە" چارەسەری"، ئەو کەسانەی کە داهاتەکەیان بەشی کۆبوونەوەی راوێژکاری درێژخایەنی نەدەکرد، بە ناچاری ئەو شێوازە چارەسەرییە نوێیەیان قەبووڵ کرد. و لە ئەنجامدا گەلێك لە نەخۆشەکانی دەروونشێکارەکانیان بەرەو لای خۆیان ڕاکێشا.

تا ئێرە من تەنها ئاماژەیەکی کورتم بە ئاشکراترین و بەرچاوترین هۆکارەکانی قەیرانی دەروونشیکاری کرد: خراپ بەکار هێنانی دەروونشیکاری لە لایەن ڕێژەیەکی زۆر لە دەروونشیکاران و نەخۆشەکان . هۆکارەکانی قەیران ، لانی کەم لەم ئاستەدا، لە سەداسەد گرێدراوی هەڵبژاردنی وردتری دەروونشیکار ونەخۆشە.

پێویستە ئەم پرسیارە بخرێتە روو: خراپ کەڵك وەرگرتن چۆن بەرێوە دەچێت؟ هەوڵمداوە وڵامێکی زۆر سنووردار بۆ ئەم پرسیارە بخەمە روو، وڵامی تێرو تەسەل تەنها کاتێك ئامادە دەبێت کە هۆکارە رواڵەتییەکان، بە هۆی قووڵبوونی قەیران لە دەروونشیکاریدا لێك بدەینەوە.

هۆکارەکانی ئەم قەیرانە قووڵە کامانەن؟

لە ڕوانگەی منەوە هۆکاری سەرەکی گۆڕینی دەروونشیکاری لە تیۆرییەکی ڕادیکاڵەوە بۆ تیۆرییەکی ریفۆرمخواز[1]. دەروونشیکاری لە بنەڕەتدا تیۆرییەکی رادیکاڵ و رزگارکەر بوو. بەڵام وردە ئەم تایبەتمەندییەی لە دەست دا و تووشی وەستان هات و نەیتوانی تیۆرییەکەی خۆی لە وڵامی پێگەی گۆڕدراوی مرۆڤ دوای شەڕی جیهانی یەکەم فراوانتر بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەڵگەڕایەوە بۆ سازشکردن و ملکەچ بوون وگەڕان بە دوای رێز وحورمەتدا.

داهێنەرترین و رادیکاڵترین دەستکەوتی تیوری فرۆید، بونیادنانی " **زانستی دژە عەقڵ**[2]"یان بە دەربڕینێکی دیکە تیوری نەست بوو. بە شێوەیەك کە خودی فرۆیدیش دەیزانی کە ئەم دۆزینەوە درێژە پێدەری کاری کپرنیكو دارڤین ومارکس بوو. ئەوان ئەساسەکانی وەهمی مرۆڤیان سەبارەت بە پێگەی زەوی لە گەردوون وهەروەها پێگەی خودی مرۆڤ لە سروشت وکۆمەڵگادا تێکەڵ کردو فرۆید دوایین

[1]. Conformist

[2]. Science of Isrational

سـەنگەری واتـە-ئاگـاهی مرۆڤـی وەك "دۆزراوەی کۆتـایی"[1] لـە ئـەزموونی دەروونیـدا داگیر کـرد. فرۆیـد نیشـانی دا کـە زۆربـەی ئـەو شـتانە کـە ئێمـە وەك زانسـتو زانیـاری خۆمـان لـە قەڵـەمیان دەدەیـن راسـتەقینە نـین و زۆربـەی راسـتییەکان لـە هـ ەسـتی ئێمـەدا نـین. ئیـدەیالیزمی فەلسـەفی و دەروونناسـی نـەریتی رووبـەڕوی پرسـیارو ڕەخنـە بوویـەوەو هـەنگاوێکی دیکـە لـە زانسـت بـۆ ئـەوەی "بەراسـتی راستییە" هاوێژرا. ( فیزیکی تیوریکیش هەنگاوێکی جیدی لە هێرش بۆ سەر دڵنیاییەکی دیکە، واتە چییەتی مادە، هەڵگرت).

فرۆید نە تەنها هەبوونی پرۆسەکانی ئاگاهی بە گشتی خستە روو (بەر لە ئەویش کەسانی دیکە ئەم بابەتەیان خستبووە روو) بەڵکو بە شـێوەیەکی کـرداری شـێوازی کارەکـەیانی لـە دیـاردە بابـەتیو بـەر چـاوەکاندا نیشـان دا: ئامـاژەکـانی خـەمۆکی دەروونـی[2]، خـەون وْخەیاڵەکان ، کارە بچوکەکانی رۆژانە.

تیـوری نەسـت یـەکێك لـەو هـەنگاوە جیـدیو قورسـانە بـوو کـە بـۆ مرۆڤناسـی ئێمـە، وتوانـای جیاکردنـەوەی ڕواڵەتـەکان (ناڕاسـت ) لـە ڕاسـتییەکان لـە هەڵس‌وکـەوتی مرۆڤـدا هـەڵگیراوە. ئـەم تیوریيـە لـە راسـتگۆییدا ڕەهەنـدێکی تـازەی دروسـتکرد وبـۆ بیرکردنـەوەی ڕەخنەگرانە بونیـادێکی تـازەی دامەزرانـد. بەر لـە فرۆیـد ئاگـا بـوون لـە

[1]. Ultimate Datum
[2]. Neurotic symptom

مەبەستی وشیارانەی مرۆڤ بە مەبەستی دادوەری لە راستگۆیی ئەودا بەس بوو، بەڵام دوای ئەو ئەم ئاگاهییە نەتەنها بەس نەبوو ، بەڵکو لاوەکی وکەم بایەخیش بوو. راستی لە پشتی نەستەوە خۆی حەشار داوە، ئەم راستییە هەمان مەبەستی سەرەکی تاکە. بە دەروونشیکاری ئەو کەسە (یان بە بەکار هێنانی دەروونشیکاری لە لێکدانەوەی هەڵس وکەوتەکانیدا ) پابەندی رێزو حورمەتە باوەکەی ئەو کەسە بۆ بورژوازی ، لە گەڵ دووروویی ودرۆزنی ئەو تووشی هەژان دەکات[1] . ئیدی ئەوە بەس نەبوو کە کاری کەسێك بە گوێرەی مەبەستی باشی ئەو هەڵبسەنگێندرێت. ئەم مەبەستە باشانە تەنانەت ئەگەر خاوەنی پەیوەندی گەرم و گوڕی زەینی و کامڵیش بن، پێویستیان بە

---

[1] بە گشتی بیروباوەڕێکی وەها هەیە کە شۆڕش وئازادی لە پەیوەندی جنسی دەرئەنجامی تیوری فرۆیدە. ئەم بۆچوونە لە ڕوانگەی منەوە جێی پرسیارە، بەتایبەت کە بەشێك لەم ئازادی پەیوەندی جنسییە دەرئەنجامی کۆمەڵگای پیشەسازی هەنووکەیی ئێمەیە بە هەمان شێوە کە "ئالدۆس هاکسلی" بە شێوەیەکی رازی کەرانە لە کتێبی "دونیای دلێری نوێ"دا ئاماژەی پێکردوە . بەڵام بە هەر حاڵ لایەنێکی دیکەی کاریگەری فرۆید بوونی هەیە کە بە زۆری لە بەر چاو نەگیراوە . یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی ناڕەزایەتی دەربڕینی گەنجە ڕادیکاڵەکان رەخنە گرتن لە لاسایی کردنەوەی ساختەو هەڵخەڵەتێنەری بورژوازییە، کە لە کردار ،بیرکردنەوە وزمانی ئەم کۆمەڵگایەدا دەبینرێت. دەتوانین ئەو راستگۆییەی کە فرۆید خستیەروو ،یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ناڕەزایەتی گەنجان بە لاسایی کردنەوەی ساختە بزانین.

لێکدانەوەو هەڵسەنگاندن هەیە. بە شێوەیەك کە دەبێ ئەم پرسیارە سەبارەت بە هەموو کەسێك بخرێتە روو: "لە سەرەوەی ئەوەوە چی هەیە؟" یان ئەگەر باشتر بڵێین "**روەکەی دیکەی تۆ کامەیە؟**" لە راستیدا فرۆید ئەم دەرفەتەی بە رۆحی ریالیزمی نوێوە ئامادە کرد تا بتوانین بپرسین "ئێوە کێن و من کێم؟"[1]

بەڵام سیستەمی تیوریکی فرۆید دوولایەنە بوونێکی قووڵی تێدایە. ئەو فرۆیدەی کە بۆ تێگەیشتن لە "ویژدانی ناوشیاری درۆینە" و خۆ فریو دانی مرۆڤ رێگایەکی تازەی کردەوە، بیرمەندێکی ڕادیکاڵ بوو (هەر چەند شۆڕشگێڕ نەبوو) کە چوار چێوەی کۆمەڵگای سەردەمی خۆی تێپەڕاند. فرۆید تا ڕادەیەك لە کتێبی " داهاتووی بیرکردنەوەیەك" دا ڕەخنەی لە کۆمەڵگا گرتووە. بەڵام لە لایەکی ترەوە بە قووڵی پابەندی پێش داوەرییەکان و فەلسەفەی سەردەم وچینی مێژوویی خۆی بوو. ویژدانی نا وشیاری فرۆید شوێنی ئارەزۆ جنسییە سەرکوتکراوەکان و ئەو راستییەیە کە دەبێ بنج وبنەواکەی لە گۆڕانکارییە لیبیدۆییەکانی سەردەمی منداڵی دا بدۆزینەوەو ڕەخنەکانی لە کۆمەڵگا تەنها لە چوارچێوەی سەرکوتکردنی ئارەزۆ جنسییەکاندا سنووردار دەبێتەوە. فرۆید لە دۆزینەوە گەورەکانی

---

[1] —مەبەستی مارکس لە "ئایدولۆژیا" هەمان دەستەواژەی "لۆژیکی بوونە" . لە چەمکی فرۆیددا ، هەر چەند کە مارکس هەوڵی تاقیکردنەوەو لێکدانەوەی میکانیزمی سەرکوتکردنی نەداوە. سەیری کتێبی ئەو پەڕی زەنجیرەکانی بیرکردنەوەی ئەم نوسەرە بکەن.

خۆیدا بیرمەندێکی بوێرو توندرەو بوو. بەلام ئەم بیرکردنەوە بێ قەیدو مەرجەی ئەو، کە کۆمەڵگا شێوەی کۆتایی پێشکەوتنی مرۆڤە و ئیدی هیچکام لە روخسارەکانی ناتوانێ کامڵ ببێت، لە بەردەم دۆزینەوەکانی ئەودا ئاستەنگی دروست دەکرد.

بە بۆنەی ئەم دژایەتییە سروشتییە لە خودی فرۆیدو تیۆرییەکەیدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە: شوێن کەوتووکانی دەبێ کەسایەتی ویاخود تیۆرییەکانی هەڵبژێرن وتەواوی بکەن؟ ئایا دەبێ شوێنی ئەو فرۆیدە بکەون کە درێژە پێدەری کارەکانی کوپرنیك ، دارڤین ومارکسە، ویاخود فرۆیدێك کە ئەندێشە و هەستی ئەو لە چوارچێوەی بابەتە ئەزموونیەکان وئایدولۆژی بورژوازیدا سنوردار ماوەتەوە ؟ ئایا دەبێ تیوری ویژدانی ناوشیاری ئەو ، کە گرێدراوی ئارەزۆ جنسییەکانە ، پەرەی پێبدەن و بیکەنە تیورییەکی گشت گیر کە تێکرای ئەزموونە دەروونییە سەرکوتکراوەکان لە خۆ بگرێت ؟ یان دەبێ تیوری ئازادی جنسی ئەو لە رێگەی پەرەپێدانی هەستەوە تا ئازادی گشتی، پەرە پێ بدەین وگشت گیری بکەن ؟ وبە کورتی ئەم پرسیارە هەمەکییە دێتە ئاراوەکە : ئایا شوێن کەوتوەکانی فرۆید دەبێ بیرکردنەوە شۆڕشگەرانەوبە هێزەکانی ئەو، کامڵ بکەین ، یان لەسەر ئەو تیوریانە پێدا گری بکەن کە بەدڵی کۆمەڵگای بەکار هێنەرە؟

شوێن کەوتنی هەردو لایەنەکەی فرۆید مومکین بوو، بەلام بڕوامەندانی راستەقینەی ئەو، فرۆیدی ریفورمخوازیان لە فرۆیدی توندڕەو پێ باشتربوو. ئەوان نەیانتوانی دەستکەوتەکانی خۆیان لە تیوری دایڕژراو، لەسنورداری کات رزگار بکەن ولە چوارچێوەیەکی

ڕادیکـاڵی فـراوانتردا جـێگیری بکـەن . ئـەم شـوێن کەوتوانـە شـەیدای دەرکـەوتنی ڕادیکالیزمێـك بـوون کـە دەروون شـیکاری بـەر لـە شـەڕی جیهانی یەکەم خاوەنداریەتی دەکرد. واتە سەردەمێك کە ئاشکراکردنی دو ڕوویـی جنسـی کـارێکی بوێرانـەو شۆڕشـگەرانە لەقەڵـەم دەدرا . باڵادەسـتی و بـاڵابوونی شـوێن کـەوتوانی ریفورمخـواز تارادەیـەك کارلێکراوی تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی فرۆید بوو . فرۆید نـە تـەنها بیرمەنـدودەرمان نـاس بـوو ، بـەڵکو کەسـێکی **ریفـورم خوازReformer** بوو کە بە ئەرکی سەر شانی خۆی بۆ بونیادنانی بزوتنەوەیـەکی چاکسازی ئـەخلاقی عاقلانـە لـە مرۆڤدا بڕوای هـەبوو) [1]فروید بیرمەندێك بوو بەڵام سەرەڕای حەزو خۆشەویستی بۆ تیوری ، قەت لـە "**جوڵانەوە**" وسیاسەتی گرێدراوی ئـەو تیورییە چاوپۆشی نـەدەکرد. زۆربـەی ئـەو کەسـانەی کـە لـە لایـەنی ئـەوەوە سـەرۆکایەتی بزوتنەوەیان بە دەست هێنا نەیاندەتوانی ڕەخنەی توند تەحەمول بکەن ، فرۆید خویشی لەم پرسە ئاگادار بوو، بەڵام تایبەتمەندییەکی دیارو بەرچاوی ئەوان دەبووە هۆی هەڵبـژاردنیان بۆ ئـەم پۆسـتە : وەفا داری بێ قەیدومەرج بە کەسایەتی فرۆید وبە جوڵانەوە ، لـە ڕاستیدا زۆربەی هـەرە زۆری ئـەوانیش وەك هـەر بزوتنەوەیـەکی سیاسـی دیکـە خـاوەن تایبەتمەندییەکی بروکراتیزمانە بوون. بۆئەوەی بزوتنەوە، هـەم تیوری

---

[1] لە ساڵی ١٩١٠دافرۆید هێشتا بیری لەوە دەکردەوە کە لایەنگرەکانی بۆ ناو" ئەنجومەنی ناونەتەوەیی برایی وئەخلاق"ڕابکێشێت، ئەو ئەنجومەنەی کە دەبوایە لە داهاتوودا ببێتە ڕێکخـرای خـەباتکارانی دەروونشـیکار. بـەڵام دواتـر ئـەم بیرکردنـەوەی بـە لاوە نـا و ویستی"یەکێتی ناونەتەوەیی دەروونشیکاران " دابەرزێنێت.

وهــهم كــرداری دەرمــان ناســی كــونترۆڵ دەكــرد ، لــەم روەوە ئــەوجۆرە هەڵبژاردنــەی رێبــەرەكان كاریگەرییــەكی بەرچــاوی لەپەرەســەندن وفراوانبوونی دەرون شیكاری هەبوو .

هەندێكی دیكە لە لایەنگرانی فرۆید پشتیان تێكرد : وەك (یـونگ) Jung كە سەرە ڕای هۆكارەكانی دیكە رۆمانتیستێكی محافزەكار بوو، (ئــادلر) ، (هەرچــەند كــە كەســێكی هۆشمەندوبــە توانــا بــوو ) عەقڵگەرایــەكی[1] روەكــی بــوو. (رانــك) ســەرە ڕای ئــەوەی تیۆرییــە سەرەتا ییە كانی فرۆیدی كامڵ كرد بەڵام دواتر تا ڕادەیەك لـە ئـەنجامی دوگم بـوونی فرۆیـد ، وزیـاتر بە بۆونـەی ئێرەیـی رەكەبـەرەكانی ، پاشـە كشــەی كــرد . (فرنجــی) Ferenczi یــەكێك لــە خۆشەویســترین ولێهاتوترین شوێن كـەوتوەكانی فرۆیـد ، كە نـە بیری لـە سـەرۆكایەتی دەكردەوە ونە دە وێرا لە فرۆیـد دور بكەوێتـەوە ، لـە ساڵەكانی كۆتـایی تـەمەنیدا تووشی هەنـدێك لادان بوو وبـە توندوتیژییـەوە دەركـرا ، وهـەر چەندە –ویان چوونكە – تیوری جنسی فرۆیدی تا دەرئەنجامی كۆتـایی پـەرە پێـدا بـوو ، نمونـەی سـرنج ڕاكێش، تـرس لـە بوركراتیزمی دەرون شـیكاری (بەتاییـەت لـە خـودی فرۆیـد) لـە گواسـتنەوە بـۆ هەڵوێسـتی ڕادیكـاڵ بــوو ، كــە ســەنتەر وناوەنــدی سیســتەمەكەی فرۆیــد بــوو. ســەركەوتوەكان لــە قوتابخانــەی فرۆیــددا بــە تونــدی كونترۆڵیــان بەدەستەوەگرت ، هەرچـەندە لـە نێـوان خۆیانـدا هەسـتی ئێرەیـی وركـە بەرایەتی بوونی هەبوو . بەرچاوترین سـەمبولی ئـەم دژایەتیـە ناوخۆییـە

---

[1] .Soperficial Rationalist

لە نێوان ئەندامەکانی گروپە کەدا ، لە کتێبی ئێرنست جونز بە ناوی (**بیوگرافی قوتابخانە** ) بە دی دەکرێت ، لەم کتێبەدا نوسەر دوکەس لە رکەبەرە سەرەکییەکانی خۆی (فرنجی ورانك) بە توندی دەخاتە بەر شالاوی رەخنە وپاشەکەشە کردنیانی بە هۆکاری نەبوونی هاوسەنگی دەروونی ئەوان زانیوە.[1]

زۆربەی دەروون شیکارانی"ئەرزەدۆکس" [2] لە سەر کونترۆلی بروکراتیزمی شیکردنەوەیی پێداگری دەکەن وملکەچی یاساکانی بوون ویان لانی کەم بە زمان وەفادار بوونی خۆیانیان دەربڕیوە . بەلام هەندێکیش لە ناو رێکخراوەکەدا مانەوە وگەلێك هاوکاری بنەڕەتی و بەبەهایان لە تیوری دەرماننانسی دەروون شیکاری دا ئەنجامدا . لەوکەسانە دەتوانین رادو، ئەلکساندر، فریدا فرۆم رایشمەن، بالنیت ، سیپیتنر، ئەریکسۆن و... ناو ببەین . زۆربەی هەرەزۆری دەروون شیکارەکانی نێو رێکخراوەکە تەنها چاوەڕوانی دیتنی ئەوشتەیان دەکرد کە چاوە ڕوان بوون بیدۆزنەوە . یەکێك لە سەرسوڕهێنەرترین نمونەکان ئەمەیە کە لە زۆربەی نوسراوەکانی دەرون شیکارە

---

[1] بەراوردی بکەن لە گەڵنامەکەی Michael Blint بۆ سەرنوسەری Internatinal Journal Of Psycho -Anslysis لە ساڵی ١٩٥٨داهەروەها باسەکەی من سەبارەت بە هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە هەمبەر فرنجی لە کتێبی Sigmond Freud,s Mission ,Pogma of Christ .

[2] ئەرزەدۆکس بە کەسانێك دەڵێن کە گیرۆدەی دوگمن و سەبارەت بەنەریتوبیروبۆچوونە کلاسیکەکان دەمارگرژن ولە گەڵ فیکرو ئەندێشەی تازە وهەموو جۆرە داهێنانێك دژایەتی دەکەن ..و.

ئەرزەدۆكسەكاندا ئەم راستیە كە بەرلە خرانە رووی گرێی ئودیپی منداڵان چە كوڕوچە كچ، گرێدراوی دایك بوون ، لە بەر چاونە گیراوە . هەندێك لە دەرون شیكارە بیرمەند و بوێرەكان وەك فرنجی لە لێكۆڵینەوەكانی دەروونناسی كەوتەیی خۆیدا ئەم پەیوەندییەی بۆدەركەوتوە وبەیانی كردوە ، بەڵام لە نوسراوەكانی خۆیدا سەبارەت بە تیوری ، فرموڵەكانی فرۆیدی دوپات كردەوەتەوە ولە لێكوڵینەوە كەوتەییەكانی خۆی كەڵكی وەر نەگرتوە[1]. نمونەیەكی دیكەی كاریگەری ئیفلیج كەری كونترۆڵی بوروكراتیزمی هاوئاهەنگی دەروون شیكارە ئەرزەدۆكسەكان ئەمەیە كە لەوبڕوایەدان ژنان پیاوانی خەسێنراوان، هەرچەندە كە زانیارییە كەوتەیی و زیندەوەرناسی ومرۆڤ ناسییەكان پێچەوانەی ئەم لافەیان سەلماندوە. ئەم پرسە بۆ وتووێژ سەبارەت بە توندوتیژی[2] راستە. چوونكە فرۆید بایەخێكی ئەوتۆی بەتوندوتیژی مرۆڤ نەدەدا، كار بەدەستانی بزوتنەوەی دەروون شیكاریش پشت گوێیان خست . بەڵام دوای دۆزینەوەی "خوغدەی (غەریزە) مەرگ" لەلایەن فرۆیدەوە پرسی وێرانگەری بایەخی پێدرا. لە لایەكی ترەوە هەندێك لەوانە لە قبووڵی چەمكی خوغدە (غەریزە) ی مەرگ توشی هەڵە بوون (چونكە بەبڕوای من، ئەوان ئەوەندە بە تیوری

---

[1] . John Bowlby لە وەتارەكەی خۆیدا بەناوی " چییەتی پەیوەندی دایكومنداڵ " شرۆڤەیەكی تێروتەسەل سەبارەت بەتیوری دەروون شیكاری دەخاتە روو وهەروەها ئامارەی بە ناكۆكییەكانی لێكوڵینەوە كەوتەیی و تیورییەكانی نێوان دەروون شیكارانی كردوە.

[2] Aggression.

خوغدەی میکانیکی پابەند بوون کە نەیانتوانی لە قووڵایی ئەم تیورییە تازەیە تێبگەن). بەڵام ئەم کۆمەڵە هەوڵیان دا بە روون وئاشکرا لە قەڵەمدانی "خوغدەی وێرانگەری " لە ئاراستەی پێچەوانە ودژی خوغدەی جنسی لە گەڵ کەسانی دیکەدا هاوئاهەنگ ببن، لەم رووەوە دولایەنە بوونی رابردویان لە نێوان خوغدەی جنسی و پاراستنی زاتیان بە لاوە ناو ولە هەمان حاڵدا چەمکی کۆنی خوغدەیان (غەریزە)پاراست.[1]

---

[1] باشترین نمونەی ئەم شێوازە بۆچوونە لە نامەی (مایکڵ بالینت)بۆ سەرنوسەری International Journal Of Psyho- Analysis بەر چاو دەکەوێت.

**جەنابی سەرنوسەر:**

بەرگی سێهەمی بیوگرافی فرۆید لە نوسینی دوکتۆر جۆنز کە بەم دواییانە بەڵاو کراوەتەوە لە روانگەی منەوە کارێکی ناشیانەیە وجوانیی تێدا نییە. لەم بەرگەدا دوکتۆر جۆنز بە توندی رەخنەی لە فرنجی گرتووە ، وبە تایبەت لە ساڵەکانی دوایی ژیانیدا بەوە تاوانباری کردووە کە گیرۆدەی نەخۆشی" هەمووان بە دوژمن بین" Paranoia و رەشبینی و خواستی قەتڵ ومرۆڤ کوشتن بووە . جۆنز بە کەڵك وەرگرتن لە روانگەی خۆی نوسراوە زانستییەکانی فرنجی لێك دەداتەوە و بە کەسێکی لە قەڵەم دەدات کە بەشداری بزوتنەوەی دەروونشیکاری بووە .

بێ گومان دەتوانین بڵێن کە ساڵەکانی کۆتایی ژیانی فرنجی هەندێك ئاماژەی حەزی Genital Theorie لە ویدا پەیدابوون بە هاوکاری رانك کتێبێکیان نوسی بە ناوی Devlopmental Aims. ئەم کتێبە زۆر توند تیژ بوو ودیسان لەم ساڵانەدا فرنجی هەندێك فیکری تازەی خستە روو کە لەو کاتەدا زۆر خەیاڵی ،شۆرشگێرانە ، زێدەرەوانە وبێ بنەمابوون. دیسان لە هەندێك نموونەدا خۆی فیکرەکانی کێشایەوە ویا خود گۆرنکاری تێدا دروست کرد. ودیسان هەمووان دەزانن کە خودی فرۆیدیش بە چاوێکی رەخنەگرانە سەیری ئەو فیکرانەی دەکرد.

تێکرای ئەم شتانە زەمینەیەکی نالەباری خولقاندوە کە ناتوانین سەبارەت بە بۆچوونەکانی فرنجی هەڵسەنگاندنێکی گونجاو ئەنجام بدەین. من بۆ نوسینی ئەم بیوگرافییە تێکرای

نامەکانی فرۆیدو فرنجیم لە بەر دەستدایە ، ئەگەر لە هەمبەر بۆچوونەکانی دوکتۆر جۆنز سەبارەت بە بارودۆخی دەروونی فرنجی پەرچەکردارم نیشان نەدایە ، بەم جۆرە لێك دەدرایەوە من کە جێگری ئەدەبیو یەکێك لە قوتابی وهاوڕی نزیکەکانی فرنجیم ، لە گەڵ ئەم بۆچوونانەدا هاوڕام. بە دڵنیاییەوە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لایەنگرانی دەروونشیکاری بەم جۆرە بیر بکەنەوە کە نوسینەکانی کۆتایی ژیانی ئەو -واتە ئەو سەردەمەی کە بە بۆچوونی دوکتۆرجۆنز بارودۆخی دەروونی فرنجی تێك چووبوو- جێگای سرنجدان وبایەخ نین. لە ڕوانگەی منەوە پێچەوانەی ئەم بیرکردنەوەیە راستە . دوایین نوسراوەکانی فرنجی نەتەنها ١٥-٢٥ ساڵ لە پێش کامڵبوونی تەکنیکی دەروونشیکارییەوە بووە ،بەڵکو هێشتا گەلێك ئەندێشە و فیکری تیدایە کە دەتوانین بڵێن پرسە لێڵو نادیارەکانی هەنووکە وتەنانەت داهاتووش روون دەکاتەوە.
لەم رووەوە پێویستە بڵێم من لە رۆژانی نەخۆشبوونی فرنجیدا بەردەوام سەردانم دەکرد-لە حەفتەیەکدا جارێك یان دوو جار- ئەو تووشی کەم خوێنییەکی کوشندە ببوو کە بە خێرایی سیستەمی دەماری تێکدا. لە ئەنجامدا فرنجی تووشی Ataxie ببوو ، بە شێوەیەك کە لە چەند حەفتەی کۆتاییدا توانای جمو جوڵی نەمابوو و تەنانەت دەبوایە پەرەستارەکەی خواردنیشی پێبدایە . و ئیفلیج بوونی سیستەمی هەناسەدان بووە هۆی مەرگی. سەرەڕای ئەوەی جەستەی رۆژبەرۆژ لاوازتر دەبوو ، بەڵام لە لایەن زەینی وفیکرییەوە تەندروست بوو ، چەندین جار سەبارەت بە ناکۆکییە فیکرییەکانی نێوان خۆی وفرۆید و هەر وەها بەرنامە جۆراوجۆرەکانی سەبارەت بە پێداچوونەوەو پەرەپێدانی دوایین نامیلکەی بە ناوی Congress لە گەڵ مندا بە تێروتەسەلی قسەی دەکرد-هەڵبەت ئەگەر دوبارە بتوانێ قەڵەم بە دەستەوە بگرێتەوە وبنوسێت- من رۆژی یەکشەممە بەر لە مردنی سەردانم کرد، تەنانەت ئەو رۆژەش سەرەڕای لاوازی وئیفلیجبوونی جەستەیی ،زەینو فیکری تەندروستو ئاسایی بوو.
بەڵام فرنجیش،تا رادەیەك گیرۆدەی خەمۆکی دەروونی بوو ،کە دەتوانین بە پێویستی لە رادە بەدەری بە خوشەویستبوون و دەستخۆشی لێکردن ئاماژە بکەین. دیسان ڕەنگە دوکتۆر جۆنز وەك دوکتۆرێك لە کاتی پشکنیندا ئاماژەی هەندێك نەخۆشی دیکەشی بە دیکردبێت. بە هەرحاڵ بە بڕوای من جیاوازی وناکۆکی سەرەکی من ودوکتۆر جۆنز لە بەیان کردنی راستییەکاندا نییە ، بەڵکوو لە شرۆڤە کردن ولێکدانەوەی ئەو

راستییانەدایە . هەرچەند کە ڕەنگە ناکۆکییەکانی ئێمە سەرچاوەیەکیتری هەبێت یان نا ، بەلاّم پێشنیار دەکەم کە هەر کامەمان هۆکاری دژایەتی کردنەکەمان تۆمار بکەین ودیاری کردنی راستییەکان بۆ جیلەکانی داهاتوو بهێڵینەوە.

## مایکڵ بالینت

## بۆچوونی دوکتور ئێرنست جۆنز

بە دڵنیاییەوە من خۆم بە هاوبەشی بارودۆخی ئازاراوی دوکتۆر بالینت دەزانم . و لە وەفاداری و وردبینی بۆچوونەکانی هیچ گومانێکم نییە.بەلاّم ئەو سرنجی نەداوەتە ئەم بابەتە لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی، ئاماژەکانی نەخۆشییەکی کوشندە دەخاتە روو، چوونکە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی تووشبوانی " هەمووان بە دوژمن بین" ئەمەیە کە هاوڕێیان وکەسانی نزیکی خۆی لە رێگای خۆ بە رووناکبین و هوشیار لەقەڵەم دانەوە بە لاڕێدا دەبات.

لە دوکتۆر بالینت چاوەڕوانی ئەوە ناکەم کە لەمەبەستی خێرێ، من گومان بکات. ئەوەی کە سەبارەت بە رۆژانی دوایی تەمەنی فرنجی نوسیومە لە سەر بنەمای ئەو شتانە بووە کە بە چاوی خۆم بینیومە. هەروەها کە دوکتۆر بالینت دوپاتی کردوەتەوە کە بەهای دوایین نوسینەکانی فرنجی زێدەرەوانەیە. هاوڕا بوونی من لە گەڵئەودا تەنها لە سەر بنەمای بۆچوونەکانی فرۆید، ئای تین گتۆن Eitington و ئەو کەسانەیە کە لە ساڵەکانی ١٩٣٢دا دەمناسین(ئێرنست جۆنز)

نامەکەی بالینت پێویستی بە لێکدانەوە نییە. ئەو کەسێکی شەریف وهۆشمەندە کە قوتابی و هاوڕێی نزیکی فرنجییەو بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت کەراستییەکان، بەو شێوەیە کە بینیویەتی بخاتە روو و بۆچوونەکانی دوکتۆر جۆنز سەبارەت بە تەندروستی دەروونی مامۆستاکەی راست بکاتەوە(نەخۆشی پارانۆیدۆسکیزوفرنیا).ئەو دوپاتی دەکاتەوە کە فرنجی تا دوایین رۆژەکانی ژیانی خاوەنی زەینییەتێکی روون ووشیار بووە. ئەمە دەربڕینێکی روون وبێ پەردەیە کە ئاماژە بە راست بوونی لافەکەی جۆنز دەکات.

بەلاّم دەبێ بزانین کە بالینت راست کردنەوە وگۆڕینی بۆچوونەکانی خۆی چۆن بەیان دەکات؟ ئەو بەم شێوەیە دەست پێ دەکات کە نوسینەکانی سەردەمی کۆتایی ژیانی فرنجی زۆر جێگای مشتو مڕە ، و شۆڕشگەرانە، خەیاڵی ، زێدەرەوانەو بێ بنەمایە. دواتر ئەڵێ کە ئەم راستکردنەوەیە تەنها بەم بۆنەیەوەیە کە جێگری ئەدەبی فرنجییەو دیسان

ڕەنگە ئەو بۆچوونانەی سەرەوە بەم شێوەیە پاساو بدرێت کە دەبێتە هۆی نەزۆك بوونی ئەندێشە دەروونشیکارییە ڕاستەقینەکانی فرۆید. بەڵام ئەمە ئەنجام وەرگرتنێکی بێهۆیە. ئەو دەروونشیکارانەی بە ناچاری بەو ڕێگایەدا نە ڕۆیشتن بەڵکوو لە بۆچوون وشێوازی تێگەیشتنی خۆیاندا بە تەواوەتی ئازاد بوون. نالەبارترین هەلومەرجێك کە ڕووبەڕوی بوونەوە : دەرکردنیان بوو لە ڕێکخراوەکە. لە ڕاستیدا تەنها ڕێژەیەکی کەم توانیان هەندێك هەنگاوی بوێرانە هەڵبگرن، جگە لەوەی بروکراتیزمەکەیان لە لایەن دەروونشیکارییەوە

---

دەیەوێت لە کەم بایەخ لە قەڵەمدانی نوسینەکانی ساڵانی کۆتایی ژیانی فرنجی لە لایەن خەڵکەوە پێشگیری بکات . دواتر باس لە ئامارژەکانی خەمۆکی دەروونی دەکات ودەڵێ ڕەنگە دۆکتۆر جۆنز هەندێك ئامارژەی نەخۆشی دیکەی بینیوە بەڵام بەیانی نەکردوە. ودواتر بە خستنە ئەستۆی داوەری بۆ جیلەکانی داهاتوو ناکۆکی نێوان گوتەکانی خۆی ئاشکرا دەکات. ئەم ئامارژەکردنە بە سەرچاوەی بێناو ئیدی چەمك وواتایەك بە دەستەوە نادات . ئەگەر بالینت، کە دەروونناسە، لە تەندروستی فرنجی بە گومان نەبوو، چۆن لەو بڕوایە دایە کە ڕەنگە هەندێك سەرچاوەی دیکە لە گەڵ بۆچوونەکانی ئەودا ناکۆك بن، بوونیان هەبێت، بە تایبەت کە جۆنز هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەم سەرچاوانە نەهێناوەتەوە. ئەگەر سەرچاوەگەلێکی وەها بوونیان هەبوو، دەبوایە بە لانی کەم بە بێ نوسینی ناوەکەی ئامارژەی پێبکردایە.

ئەگەرئەم نامە ئاڵۆزە لە لایەن کەسێکی کەم بایەخ، نە بالینتەوە بنوسرابا، یان ئەگەر لە سیستەمێکی دیکتاتۆریدا بە مەبەستی ئاڵۆز نەبوونی کۆمەڵگا ومەترسی بۆ ئازادیو خەیانەت، نوسرابا پاساو دەدرا. بەڵام بە سرنجدان بەوەی کە نوسەری ئەم نامەیە دەروونشیکارەو لە بەریتانیا دادەنیشێت تەنها ئەم دەرئەنجامەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم نامەیە ئامارژە بەو گوشارە توندە دەکات کە تەنها ڕەخنەیەکی ئارامو هێدی لە ڕێبەری( ڕێکخراو) بە ڕەوا دەزانێت.

قەبووڵ نەکرا ، رووبەرووی ئازارێکی دیکە نەبوونەوە. هۆکاری ئاستەنگ نانەوە  لە بەردەم چالاکییە  بوێرانەکان چی بوو؟

یەکێك لەو هۆکارانەی کە هەمووان دەیزانن ئەمە بوو کە فرۆیدسیستەمێکی خولقاند کە بووە بابەتی گاڵتەی زۆربەی هەرەزۆری ئاکادمیستە پسپۆڕەکان. چوونکە ئەو سیستەمە لە دژی **"تابۆکان"** وبیرکردنەوە نەریتییەکانی ئەو سەردەمە کاری دەکرد و ئاسایشی دەروونشیکاری رووبەرووی هەڕەشەی دوژمنکارانە دەکردەوە، لەم رووەوە دەروونشیکار ناچار بوو پشت بەو رێکخراوە ببەستێت کە پشتیوانی لێدەکرد وبەم جۆرە لە هەستی تەنیایی رزگاری دەبوو و بە فەرمانبەری تەواو لە رێکخراوەکە ،پاڵپشتێکی بە دەست دەهێنا. هەروەها بە متمانە وبڕواکردن بە رێکخراوەکە، بە شێوەیەکی سروشتی "کاریزما پەرەستی" دروستو بەرفراوان دەبێت.

دەبێ سرنج بدەینە هۆکارێکی دیکەش: دەروونشیکاری لافی ئەوەی لێدەدا کە وڵامێکی بۆ نهێنی و مەتەڵی زەینی مرۆڤ پێیە. و لە راستیدا لایەنێکی ئەم نهێنییەشی روون دەکردەوە. ئەگەر بڕوامان پێبێت. بەڵام بە لە بەرچاو گرتنی فراوانی و بەربەڵاوی ئەم پرسە گەلێك بابەت بوونی هەیە کە هێشتاش روون نەبوتەوە. ئەگەر دەروونشیکار لە پێشێل کردن وپەرژو بەڵاو بوونی زانیارییەکانی خۆی –چە لە لایەنی تیوریکەوە وچە لە لایەنی دەرماننناسییەوە– ئاگادار ببوایە تێدەگەیشت کە بۆ چی بە بۆنەی رەدکردنەوە ویا خودگاڵتە کردن بە زانیارییەکانی، هەڕەشەی لێدەکرێت.

لەم رووەوە ئایا ئاسایتر وعاقڵانەتر نەبوو ئەگەر بەر بەم چیرۆکە ببەستیت: تێکڕای راستییەکان لە لایەن فرۆیدەوە بونیاد نراوە وئەویش بە ئەندامبوونی لەم رێکخراوەدا لەم راستییە دا بەشدارە؟ هەڵبەت ئەو دەیتوانی کەمو کوڕی و تێست بوونی زانیارییەکانی خۆی قەبووڵ بکات، بەڵام ئەم دانپێدانانە نەتەنها پێویستی بە سەربەخۆیی وبوێرییەکی تەواو هەبوو، بەڵکوو بیرکردنەوەیەکی عاقڵانەشی پێویست بوو. هەر دەروونشیکارێك دەبوایە لە هەمان حاڵدا توێژەرەوەیەك بێت، نابێ تەنها کەسێکی پسپۆڕ بێت کە ئامانجی ئەوە بێت بە بە کار هێنانی ئەم تیورییانە ژیانی بە سەر ببات.

روون وئاشکرایە کە ئەم پرۆسەی بروکراتیزمو بێگانە بوونی ئەندێشەیە، کە من لە بابەتی جوڵانەوەی دەروونشیکایدا باسم کرد، دەتوانین لە مێژووی گەلێك لە بزوتنەوە سیاسی، فەلسەفی وئایینییەکاندا ببینین. بەڵام ئەم پرۆسەیە لە مێژووی زانستدا زۆر دەگمەنە، چوونکە لەم حاڵەتەدا زۆربەی بیرکردنەوە زانستییە داهێنەرییەکان دەکەونە قوڵایی تاریکییەوە وجەوهەری بروکراتیزمو دوگماتیزم، گەشە کردنەکەی لە ناو دەبات[1]. من تا رادەیەك چۆنییەتی

---

[1] لەناو چوون ولادانی تیورییەکانی ماکس لە لایەن ستالینیزمەوە وهەروەها وێرانبوونی کاتی زانستی ژنتیك لە لایەن قوتابخانەی Lysenko سەبارەت بە تێکدەری بروکراتیزم لە زانستدا نموونەگەلێکی باشن.

بزوتنـەوەی دەروونشـیکاریم شـرۆڤە کـرد، چـوونکە هۆکـاری بنـەڕەتی قەیرانی دەروونشیکارییە[1].

لـە راڤـەکردنی کاریگەرییـە نیگەتیڤـەکانی چییەتی بروکراتیزمـی دەروونشیکاری، تەنها رووبەڕوی یەك هۆکاری قەیرانی دەروونشیکاری دەبینـەوە. گـرنگترین هۆکـار، ئـەو گۆڕانکارییـە کۆمەڵایەتیانەیەکـە بـە شێوەیەکی روو لە زیـاد بوون دوای شـەڕی جیهانی‌یەکـەم روویان داوە. لـە حالێکدا کـە بـورژوا-لیبرالیـزم لـە سـەرەتای ئـەم چـەرخەدا( چـەرخی بیستەم) خاوەن هێزی تـازەی سیاسـی وئـابووری بـوو. خـەڵکی چـینی ناوەڕاسـت بـە بۆنـەی ئـەو هەڕەشـەیە کـە رووبـەڕوی خـۆڕاگری و سەقامگیری هێزە سیاسیو ئابوورییە نوێکان دەبوەوە وزیاتر دەبوونـە محافیزەکار، سیبرنتیك، ودەرکەوتنی "مرۆڤی رێکخراوەیی"[2] لە گەڵ لە ناو بردنی تاك ، سەرەڕەوی ودیکتـاتۆری لـە زۆربـەی وڵاتـانی جیهانـدا،

---

[1] دەبێ لـە بیرمـان نەچێت کـە بروکراتیزمـی دەروونشـیکاری لـەم سـاڵانەی دواییـەدا لـە بەراورد لە گەڵ رابردوودا لیبراڵتر بووە. رەنگە هۆکاری سەرەکی ئەم پرسە لادانـی ئەندامـە سـەرەکییەکانی لـە نەریتـەکانی" بیرکردنـەوەی دروسـت"بێت کـە ماوەیەکـە بـە سـەریاندا سـەپێنراوە. ئەگـەر ئـەم گەڕانـەوە بـۆ لیبرالیـزم ورزگـاری زانسـتی نـەبوو، بزوتنەوەکـە ژمارەیـەکی زۆر لـە ئەندامـە سودبەخش وکاریگـەر و بەنرخـەکانی خـۆی لـە دەسـت دەدا و ئیدی نەیدەتوانی درێژە بە هەبوونی خۆی بدات. هۆکـارێکی دیکـەی گەڕانـەوە بۆ لیبرالیزم ئەو هەڕەشەیە کە لە لایەن دەروونشیکارە سەربەخۆکان وهـەوەها رێکخراوەکـانی پـەروەردە رووبەڕوی‌دەبوونـەوە. بـەم حاڵەشـەوە کـونترۆڵ کردنـی بروکراتیـزم بـە تـەواوەتی لـە نـاو نەچـووە، لـەم رووەوە زۆربـەی دەروونشـیکارەکان یـان"رێکخـراوی لەنـدەنیان"بـە جـێ هێشـتووە یـان لێـی دەرکـراون ویـاخود وەرنـەگیراون. " فیدراسـیۆنێکی نانەتـەوەیی دەروونشـیکاری " کـە یـەکبوونی تیـوری دەروونشـیکاری تێـدا نـەبێتو تـەنها ئامـانجی گۆڕینەوەی زانیارییە زانستییەکانە لەم ساڵانی دواییەدا دەمەزراوە.

[2]. Organization man

وهەرەشەی شەڕی ناوەکی ئەو هۆکارانە بوون کە چینی ناوەڕاستی ناچار دەکرد هەڵوێستی بەرگری کردن وەربگرن. زۆربەی دەروونشیکارەکان هاوبەشی نیگەرانی چینی ناوەڕاست بوون، ولە هەڵوێستی بەرگریکردن ووشیار کردنەوەی ئەو توێژەدا بەشدار بوون.

لە هەمبەر ئەم زۆرینەیە، کەمینەیەکی بچوك لە دەروونشیکارانی ڕادیکاڵ- دەروونشیکارانی چەپ- بوونیان هەبوو کە هەوڵیان دەدا سیستەمی"فرۆیدی ڕادیکاڵ " پەرەپێبدەن، و دویانەویست هاوئاهەنگییەك لە نێوان بۆچوونە دەروونشیکارانەکانی فرۆید وبۆچوونە کۆمەلاّیەتی ودەروونناسییەکانیدا پەیوەندی دروست بکەن. برنفلّد وویلهلم رایش لەو کەسانەن کە هەوڵیان دەدا لە نێوان فرۆیدیزم ومارکسیسزمدا سەنتەزێك دروست بکەن[1] نوسراوەکانی منیش لە هەمان بواردا بە نامیلکەی دەروونشیکاری و کۆمەڵناسی و"بنەماکانی ئایینی مەسیحییەت" دەست پێدەکات.[2] بەم دوایانە لینگ[3] ، یەکێك لە کەسە داهێنەر وبەناوبانگەکانی دەروونشیکاری هاوچەرخ، لە

[1] دواتر رایش لەو سەردەمەدا کە لە ئەمریکا دەژیا بە تەواوەتی لە تیورییەکانی مارکسیزم وازی هێنا وتێکڕای پەیوەندییەکەی لە گەڵ سوسیالیزم، کە وەها بیری دەکردەوە لە بەراورد لە گەڵ سیاسەتە لیبراڵەکانی رۆزوڵت وئایزنهاور کەم بایەخترە ،پچڕاند.

[2] ئەم بۆچوونانە لە بڕگەکانی ٧ و٩ی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین.

[3] R.D. Laing.

ڕوانگەی هومانیستی و سیاسی ڕادیکاڵەوە پرسەکانی دەروونشیکاری لێکدەداتەوە.

نابێ گرنگی دزەکردنی دەروونشیکاری لە ئەدەبیات وهونەریشدا لە بەر چاو نەگرین. زۆر سرنجڕاکێشە کە دەرفەتە رادیکاڵەکانی تیوری فرۆید، کە دەروونشیکارە پسپۆڕەکان پشت گوێی دەخەن، لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا بزوتنەوە ڕادیکاڵەکانی بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە. ئەم کاریگەرییە لە نێو سور ریالیستەکاندا زۆر بەر چاوە، هەر چەند کە تەنها بە ئەوان سنووردار نامێنێتەوە.

لەم دە ساڵەی دواییەدا هەندێك لە فەیلەسوفە سیاسییە رادیکاڵەکانیش خۆیانیان بە دەروونشیکارییەوە سەرقاڵ کردوە[1]. ژان پۆل سارتر لە لایەنی پەرپێدانی ئەندێشەی گرێدراوی دەروونشیکاری لە چوارچێوەی فەلسەفەی ئیگزیستانیسالیزم دا خاوەن ڕۆلێکی گرنگە. جگە لە ئەوو " نورمان ئوبراون" بەناو بانگترین کەسایەتی نێو ئەم گروپە"هربرت مارکۆزە" یە کە لە گەڵ ئەندامەکانی دیکەی " ڕێکخراوی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی فرانکفۆرت"وەك" ماکس هورکهایمر"و"تیودۆر ئادۆرنۆ" لە دەروونشیکاری دا بایەخێکی زۆریان بە پەیوەندی نێوان بیرکردنەوەی مارکس وفرۆیددا. هەر وەها کەسانی دیکەش بوونیان هەیە، بە تایبەت لە نێو مارکسیست وسور ریالیستەکاندا، کە لەم ساڵانەی دواییەدا، بایەخێکی زۆریان بە

---

[1] بۆ نموونە رۆژنامەی فەرەنسی L, Homme etla socete ژمارەیەکی تایبەتی لە بن ناوی Freudo- marxisme etsociologie del, alientation بلاو کردەوە.

دەروونشیکاری داوە ولەم بارەیەوە گەلێك وتار وکتێبیان نوسیوە. بە داخـــەوە ئـــەم نوســـەرانە "فەیلەســـووفەکانی دەروونشـــیکارین" وزانیارییەکی ئەوتۆیان لە سەر بنەما کلینیکییەکان نییە. تێگەیشتن لـە تیۆرییەکانی فرۆید پێویستی بە دەروونشیکاربوون نییە، بەڵکو شارەزا بوون لـە سـەر بنـەما کلینیکییـەکانیان پێویسـتە، ئـەگینا تێگەیشـتن لـە تیۆرییـەکانی فرۆیـد دژوارە و تـەنها قسـەکانی بـە بـێ شـارەزابوون لـە سیستەم هەڵدەبژێردرێت.

مـارکۆزە، کــە لــە فەیلەســۆفەکانی دیکــە زیاترســەبارەت بــە دەروونشیکاری شتی نوسیوە، نموونەیەکی بەرچاوی ئەو لادانەیە کە " فەلســـەفەی دەروونشـــیکاری" بـــە ســـەر تیـــۆری دەروونشـــیکاریدا دەیسەپێنێت. ئـەو لافـی ئـەوە لێـدەدات کـە بـواری کـارکردنی تـەنها لـە چوارچێوەی تیۆریدایـە وبە تـەواوەتی لـەو دیسپلینە تەکنیکییەی کە دەروونشیکاری گیرۆدەی بووە خۆی دوور گرتووە. ئـەم لافـە قسـەیەکی فریـــو دەرانەیەوبـــەم واتایـــە دێـــت کەدەروونشـــیکاری لـــە ســـەرەتادا سیستەمێکی تیۆریك بووەو دواتر گیرۆدەی دیسپلینی تـەکنیکی بـووە، هەڵبـەت راسـتی ئەمەیـە کـە دەروونشـیکاری فرۆیـد لـە سـەر بنـەمای توێژینـەوە کلینیکییەکان بووە.

مەبەستی مارکۆزە لە" دیسیپلینی تـەکنیکی" چییە؟ هەنـدێك جار وا دیارە کە بەم دەستەواژەیە ئاماژە بە پرسـەکانی چارەسـەری دەکـات، بـــەڵام لـــە شـــوێنێکی دیکـــەدا ســـەبارەت بـــە " ئامـــارە"[1] کلینیکـــی وئەزموونییەکان بە کار دێت. ئـەو زانسـتەی کە تیـۆری وبۆچوونەکانی

---

[1] .Data

بە بێ گرنگی دان بە دیاردە کلینیکییەکان کە شوێنی دەرکەوتن وکامڵ بوونیانە تێگەیشتنیان دژوار بێت ناتوانێ فەلسەفە وتیوری شرۆڤە کردن لە یەك جیابکاتەوە وجیاوازییەکانیان دیاری بکات." فەلسەفەیەکی دەرونشیکاری" کە نکوڵی لە بنەما ئەزموونییەکان بکات دەبێتە هۆی گەلێك هەڵەی جیدی لە تێگەیشتنی تیوریدا. دیسان دوپاتی دەکەمەوە کە مشت ومڕ لە سەر پرسەکانی دەروونشیکاری پێویستی بە دەروونشیکار بوون یاخود چارەسەربوون لە رێگەی دەروونشیکارییەوە نییە. بەلام بۆ تێگەیشتن لە چەمکەکانی دەروونشیاری دەبێ بایەخ بەو بابەتە بدرێت و بتوانین بە ئامارە ئەزموونییەکانی تاك وکۆمەڵگەوە سەرقاڵ ببین. مارکۆزە و کەسانی دیکە بۆ کەوتنە نێو هەندێك بابەتی وەك" گەڕانەوە بۆ دواوە"[١] خۆپەرەستی"[٢] و "لادان "[٣] پێداگری دەکەن بەلام لە دونیای ئینتیزاعی رووت دا ماونەتەوە. ئەوان لە دروست کردنی دونیای خەیاڵیدا "ئازادن" چوونکە زانیاری ئەزموونیان نییە تا بتوانن ئەوەی کە دایدەرێژن، هەڵیبسەنگێنن. بە داخەوە زۆربەی خوێنەران زانیارییەکانی خۆیان لە هەمان رێگای لادانەوە بە دەست دەهێنن، و لادانی فیکری لێدەکەوێتەوە.

لێرەدا ناتوانین سەبارەت بە نوسراوەکانی مارکۆزە لە بواری دەروونشیکاریدا، کە" خۆشەویستی و شارستانی"، "مرۆڤی یەك ساحەتی" و"نامێلکەیەك دەرباری ئازادی"لە خۆ دەگرێت بە شێوەیەکی تێر وتەسەل قسە بکەین، لەم رووەوە تەنها چەند تێبینییەك

---

(١). Regression
(٢) .Narcisism
(٣) Perversion

دەخەمەروو. لە هەموو گرنگتر ئەمەیە کە مارکۆزە، کە لە هەموو بوارێکدا خوێندنەوەی قوڵی هەیە، لە خستنە رووی فیکرەکانی فرۆیددا تووشی هەڵەی زەق بووە. بۆ نموونە لە باسی"بنەچەی راستی"[1] و"بنەچەیچێژ"[2]"ی فرۆید تێنەگەیشتوە (هەرچەند کە لە نموونەیەکدا بە دروستی بە کاری هێناون) وگریمانەی کردوە کە چەندین " بنەچەی راستی" بوونی هەیە کە یەکێکیان بە سەر شارستانی رۆژئاوادا زاڵە: "بنەچەی جێ بەجێ کردن."[3]رەنگە مارکۆزەش لەم تێگەیشتنە هەڵە گشتییەدا هاوبەش بێت کە : مەبەست کە " بنەچەی چێژ" هەمان رەوتی چێژخوازی[4] (واتە ئەو بۆچوونەیەکە پێی وایە چێژ وەرگرتن لە پێش هەموو شتێکەوەیە.و.کوردی) وئامانجی ژیان تەنها چێژە، و بنەچەی راستی ئاماژە بە نەریتی کۆمەڵایەتی دەکات، بەم واتایە کە هەوڵدان و کۆششی مرۆڤ پێویستە بۆ ئەنجامدانی کار و جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی بێت. بەڵام مەبەستی فرۆید بە هیچ شێوەیەك ئەمە نەبوو، لە ڕوانگەی فرۆیدەوە بنەچەی راستی نەرم کراوێکە لە بنەچەی چێژ ودژایەتی ناکات. بۆچوون وتێگەیشتنی فرۆید لە بنەچەی راستی ئەمەیە کە هەر کەسێك توانای بینینی راستییەکانی هەیە و دەتوانێ لە هەمبەر زیانەکانی سەرچاوەگرتوو لە بەرەڵایی دامرکاندنی غەریزەکاندا خۆی بپارێزێت. ئەم بنەچەی راستییە بە تەواوەتی لە گەڵ نەریتە

---

(1) .Reality principle

(2) .Pleasure principle

(3) .Performance Prnciple

(4) .Hedonism

کۆمەڵایەتییەکاندا جیاوازە: ڕەنگە کۆمەڵگایەك ئارەزۆ جنسییەکانی بە توندی سانسۆر ویاخود کونترۆڵ بکات، لە حاڵێکدا بنەچەی ڕاستی لە ڕێگای سەرکوتکردنی ئارەزۆکانەوە مرۆڤ لە زیانەکانی دەپارێزێت. ڕەنگە کۆمەڵگایەکی دیکە بە تەواوەتی پێچەوانە بێت ، لەم حاڵەتەدا ئیدی بنەچەی ڕاستی بۆ سەرکوتکردنی ئارەزۆ جنسییەکان هیچ خواستێکی نییە . لەو چەمکە دا کە مەبەستی فرۆیدە" بنەچەی ڕاستی" لە هەر دوو نموونەکەی سەرەوەدا یەك شتە، ناکۆکی لە بونیادی کۆمەڵگادا ئەو شتەیە کە من بە ناوی "خووی[1] (کاراکتەر) کۆمەڵایەتی" لە کەلتوورێك ویا خود چینێك دا ناودێری دەکەم.( بۆنموونە کۆمەڵگای شەڕکەر کاراکتەرێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی هەیە کە خواستی داگیر کەری پەرە پێدەدات و خواست و ئارەزۆکانی میهرەبانی وخۆشەویستی سەرکوت دەکات، لە کۆمەڵگای ئاشتیخواز وهاوکاریدا ، پێچەوانەی ئەو حاڵەتە بوونی هەیە. یان لەکۆمەڵگای توێژی ناوەڕاستی سەدەی ١٩ خواستی چێژخوازی وبەکار هێنان سەرکوت دەکرا، لە حاڵێکدا کە خواستەکانی پێکەوەنانی سامانی "ئانال"[2]کە سنووورداری لیّ دەکەوتەوە وهەستی چێژوەرگرتنی لە کۆکردنەوەدا دەدیتەوە، پەرەی پێدەدرا. هەنووکە کاراکتەری کۆمەڵایەتی حەزی لە بە کار هێنان و دژی کۆکردنەوەیە، و پاشەکەوت

---

[1] وەرگێڕی فارسی بۆ وشەی کاراکتەر"منش"ی داناوە بەلاّم منش بە زۆری بە واتای خوو دێت . لە سەر ئەم بنامایەش من (وەرگێڕی کوردی) لەزۆربەی شوێنەکانی ئەم کتێبەدا لە باتی خوو هەمان کاراکتەری ئینگلیزیم داناوە کە بە ڕاستی نزیکتربووە. و.

[2] سەبارەت بە ئارەزۆ جنسییە ئانالی، دەمیو زاوزێکان لە بڕگەی نۆهەمدا لێی دەدوێین.

کردن کارێکی خراپ ودژی خواستەکانی کۆمەڵگا لە قەڵەم دەدرێت. لە حاڵێکدا لە هەر کۆمەڵگایەکدا هێزی گشتی مرۆڤ دەبێتە هێزی تایبەت کە کومەڵگا بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی بە کاری دەهێنێت. لەم رووەوە ئەوەی کە پێویستە سەرکوت بکرێت زیاتر پەیوەندی بە سیستەمی خووی کۆمەڵایەتییەوە هەیە تا بە "بنەچە راستی"یە جۆراوجۆرەکان. بەڵام چەمکی کاراکتەر لە واتا دینامیکەدا کە فرۆید بە کاری هێناوە ، بە هیچ شێوەیەك لە نوسراوەکانی مارکۆزەدا نابینرێت ، ڕەنگە هۆکارەکەشی ئەمە بێت، کە ئەو چەمکە ئەزموونییە، نەوەك فەلسەفی.

لادان لە بەکار هێنانی تیوری فرۆید لە لایەن مارکۆزەوە لە کەڵك وەرگرتن لە چەمکی سەرکوتکردنیشدا جێگای سرنج وبایەخە. ئەو دەنوسی" دەستەواژەکانی سەرکوت وسەرکوتگەرانە لە لێکدانەوەیەکی ئاماتۆرانەدا پێناسەیەکە لە پرۆسە رێگرەکان و گوشار و سەرکوتکردنی وشیارانەی ناوخۆیی ودەرەکی ."[1] بەڵام لە سیستەمی فرۆیددا سەرکوتکردن لە چەمکی دینامیکی وشەدا بە واتای سەرکوتکراوی ناوشیارانەیە. بە بەکارهێنانی " سەرکوتکردن " لە هەر دوونموونەی وشیارانەو ناوشیارانەدا، تێکڕای تایبەتمەندییەکانی بۆچوون و تێگەیشتنی فرۆید لە سەرکوتکردن وناوشیاریدا لە ناو دەچێت. لە راستیدا وشەی "سەرکوتکردن " دوو واتای هەیە : واتای یەکەم هەمان واتای باو و برەوداره، واتە گوشار خستنەسەر، ئازاردان، یان

[1] لە کتێبی خۆشەویستیوشارستانی ، لە نوسینی مارکۆزە.

دامرکاندن ولە ناو بردنە، واتای دوهەم: کە لە دەروونناسییدا لە لایەن فرۆیدەوە بە کار هاتووە (هەرچەند کە پێشتریش لە دەروونناسییدا بە کار هاتووە) واتە دوورکردنەوەی شتێك لە زەینی وشیار"هەست". ئەم دوو واتایە هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە. مارکۆزە بە بەکار هێنانی لێڵ ونادیاری وشەی سەرکوتکردن پێگەی سەرەکیو ناوەندی دەروونشیکاری تێك دەدات. ئەو یاری بە هەر دوو واتای وشەکە دەکات، بە شێوەیەك کە هەر دوو واتاکە، یەك واتا دەبەخشن ولە ئەنجامدا واتای دەروونناسانەی وشەکە لە ناو دەچێت —فورمولێکی باش دۆزراوەتەوە، بە لێڵ بوونی واتا ، چەمکی سیاسی ودەروونناسانەی وشەکە تێکەڵ دەبێت.

نموونەیەکی دیکەی شێوازی تێگەیشتنی مارکۆزە لە تیۆرییەکانی فرۆید چییەتی محافیزەکارانەی "جۆش وخرۆشی ژیان" و غەریزەی ژیانە. مارکۆزە لەو بڕوایە دایە کە فرۆید هەمان چییەتی پاوانخوازانەی جۆشو خرۆشی ژیانی" بۆ غەریزەی مەرگ" یش بە کار هێناوە. بەڵام لەوە دەچێت نەزانێ کە فرۆید دوای گومانەکانی لە کتێبی " بنەماکانی دەروونشیکاری " ئەنجامێکی پێچەوانەی بە دەست هێناوە، بەم شێوەیە کە جۆشو خرۆشی ژیان خاوەن چییەتییەکی محافیزەکارانە نییە.

جگە لەو وشانەی کە لە کتێبی "ئوروس وشارستانییەت" دا بە کار هاتوون، مارکۆزە لەم کتێبە دا ئێدەئاڵی مرۆڤی تازە لە کۆمەڵگای سەرکوتنەکراودا ، بە رەنگدانەوەی ئارەزۆ جنسییەکان بە تایبەت

بۆچـــوونە سادیســـتی وكوپرفیلیكـــەكان[١] دەزانـــێ. لـــە راســـتیدا " ئیـــدەئاڵی" مـــاركۆزە لـــە كۆمـــەڵگای ســـەركوتنەكراودا لـــە بەهەشـــتە منداڵانەیـە دەچێت كـە تێدا تێكڕای كارەكان وەك یاریین وهـیچ جـۆرە ناكۆكی وڕووداوێكی ناخۆشی جیدی بوونی نییە . (ئەو قـەت باسـی لـە ناكۆكی نێوان ئیدەئاڵ وڕێكخراوی پیشەیی ئوتوماتیك ی نەكردوە ). ئـەم ئیدەئاڵـە گەڕانەوەیـە بـۆ ڕێكخـراوی لیبیـدۆی منـداڵی لـە گـەڵ ناڕەزایـەتی دەربڕین و هێـرش كردنـە سـەر زاڵبـوونی ئـارەزۆ جنسـییە زاوزێ كان بە سەر خواست وحەزەكانی پێشگەیشتنی بەر لە قۆنـاغی زاوزێ. لـەم كتێبـەدا بـە هەنـدێك وشـە دواكـەوتنی شـەهوەتی دەمـی(بـە دەم)[٢] ، پاشـی ( بـەپاش)[٣] و لـە بـەراورد لـە گـەڵ شـەهوەتی زاوزێی یەك هاوسەری، و ئەم بنەمایە كە چێژی جنسی تەنها كاتێك ڕەوایـە كـە ئامانج زاوزێ بێت، ئاشكرا دەبێت. ماركۆزە بـە هێرشـی خـۆی بـۆ سـەر زاڵبـوونی شـەهوەتی زاوزێ ئـەم ڕاسـتییە حاشـا هەڵنـەگرە پشـت گـوێ دەخات كـە دامركانـدنی ئـارەزۆ شـەهوەتییەكان بە ئەندامی زاوزێ هـیچ پەیوەندییەكی بە مناڵبوونەوە نییە، ژن وپیاو هەمیشە لە تێكەڵاو بوون چێژیان وەرگرتووە بە بێ ئەوەی هەمیشە لەم تێكـەڵاو بوونـە مەبەسـتی زاوزێ یان هەبووبێت. شێوازەكانی بـەرگرتن لـە دووگیـانی(حاملـەبوون) لـە مێـژوودا بوونیـان هـەبووە. لـە لایـەكی تـرەوە مـاركۆزە دەیـەوێت ئـەم خاڵـە بـەیان بكـات كـە بـۆ ئـەوەی لادانـەكان —وەك سـادیزموكۆپرفیدا—

---

[١] . Coprophilic

[٢] .Oral

[٣] (كوم).Anal

ناتوانــێ زاوزێی لێبکەوێتــەوە، لــەم رووەوە لــە رێگــای ئاســایی وسروشتییەوە "ئازادانە ترە" لە نزیکبوونە جنسییەکان. لێکدانەوەی شۆڕشگەرانەی مارکۆزە ، تایبەتمەندی نالۆژیکی ونا شۆڕشگەرانەی ئەو دەشارێتەوە. ئەویش وەك هەندێك لە نووسەر وهونەرمەندە پێشڕەوەکان، لە "دوساد" و"مارینتی" یەوە تا هەنووکە. شەیدایی گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی، لادانەکان، وێرانگەری ونەفرەت بووە. لێکدانەوە وڕاڤەکردنی گەندەڵی لە ئەدەبیات وهونەری کۆمەڵگا وهەر وەها شی کردنەوەی زانستی ئەو دیاردانە گرنگە، بەڵام بەشداری نووسەر وهونەرمەند لە قەبوڵ کردنی گەندەڵی کە خۆی خوازیاری گۆڕین ولە ناو بردنیە بە کارێکی ناشۆڕشگەرانە لە قەڵەم دەدرێت.

خاڵی نزیك بەم پرسە کە مارکۆزە لە "نارسیسۆس"[1] و "ئورفیوس"[2] دەریدەخات، لە حاڵێکدا کە "پرومتوس"[3] کە (لە روانگەی مارکسەوە شەریفترین شەهیدی مێژووی فلسەفەیە) وەك پاڵەوان و نموونەی سەرەتایی چاو لێدەکات. ئورفیك نارسیستیك نیشان و هێمایەکە لە جیهانەکەی دیکە ومەرگ. ئورفیوس بە گوێڕەی

(1) Narcissus لە میتولوژی یونانندا ئەو گەنجەیە کە کاتێك وێنەی خۆی لە ئاودا بینی شەیدای خۆی بوو ، لە خۆشەویستی خۆیدا لاواز بووەوە بوو بە گوڵی نێرگز.

(2) ORPHEUS لە میتولۆژی یونانندا کوری ئاپۆلۆیە کە گۆرانیبێژ بوو و سازی لێدەدا،پلۆتر رێگەی پێدا کە بە دوای تەرمی هاوسەرەکیدا بڕوات بە مەرجەی ئاوڕ نەداتەوە. بەڵام لە دوایین ساتدا لەم فەرمانە سەرپێچی کرد هاوسەرەکەی لێ وون بوو.

(3) PROMETHOUS یەکێك لە پاڵەوانەکانی یونانی کۆنە

نەریتە کلاسیکەکان پەیوەندی بە هاو ڕەگەز بازییەوە هەیە. مارکۆزە دەڵێ " من وەك نارسیس خۆشەویستی وشەهەوەتی ئاسایی رەد دەکەمەوە وئەمە بۆ ئەوە نییە کە باەڕمەند وپاك داوێن بم، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە خۆشەویستی وشەهوەتێکی زیاتر وکاملتر بە دەست بهێنم". ئەویش وەك نارسیس لە هەمبەر دیسپلینی سەرکوتکەری تێکەڵاوی جنسی بە ئامانجی زاوزێ ناڕەزایەتی دەردەبڕێت. ئەم ئارەزۆ شەهوەتیانەی ئورفیك نارسیستیك رەتکردنەوەی ئەم سیستەمەیە- سەرپێچی گەورە!؟. دیسان ئەم سەرپێچییە بە واتای خۆ دورگرتن لە جیابوونەوە تایبەتییەکانیش لێك دەدرێتەوە، کە هەمان سەرپێچی کردن لەگەشە کردن، جیابوونەوەی یەکجارەکی لە دایك وخاك وهەر وەها ئەزموونی چێژی جنسییە (ئاسایی نە سادیستیك).( جێگەی سەرسوڕمانە کە لە کتێبی مرۆڤی یەك ساحەتیدا سەرپێچی گەورە بە تەواوەتی واتاکەی گۆڕدراوە، بە بێ ئەوەی هۆکارەکەی بەیان بکرێت، واتا تازەکەی لەو کتێبەدا خۆ دورگرتن لە بەکار هێنانی ئەو چەمکانەیە کە کەلەبەری نێوان ئێستا و داهاتوو پڕ دەکاتەوە). روون وئاشکرایە کە ئەم ئیدەئاڵە دژی بۆچوون ومەبەستی فرۆیدە لە گەشەکردن و کاملبوونی مرۆڤدا و گرێدراوی تێگەیشتنی ئەوە لە خەمۆکی دەروونی و پەرێشانی دەروونی. ئەم ئیدەئاڵە رزگار بوونە لە دەسەلآتی ئاروزۆ جنسییە زاوزێ کان، هەڵبەت دژی ئەو ئازادییەیە کە رایش پێشنیاری کردوە وهەنووکە مشتومڕی لە سەر دەکرێت.

ماركوزە نايەوێت سرنج بدات كە لە ڕوانگەی فرۆيدەوە گۆڕانكاری وكاملْبوونی ليبيدۆ لە خۆ پەرەستی سەرتاييەوە بۆئاستی چێژی جنسی دەمی (بە دەم) پاشی (بە پاش)و دواتر زاوزێ گرێدراوی سەركوتی لە ڕادە بەدەر نييە، بەڵكو پرۆسەی بيولۆژيكی پێگەيشتنە كە بەرتری وبالاٌ بوونی چێژی جنسی زاوزێی لێدەكەوێتەوە. لە ڕوانگەی فرۆيدەوە كەسی تەندروست كەسێكە كە گەيشتوەتە ئاستی پێگەيشتنی زاوزێ و لە نزيكی وتێكەلاٌو بوون چێژ وەردەگرێت. تێكڕای سيستەمی كاملْبوونی فرۆيد لە سەر گەيشتن بە توانای تێكەلاٌوی جنسييە كە دواين گەشەی ليبيدۆيە. من دژی لادانی ماركۆزە لە ئاستەكەی فرۆيد نيم بەڵكو نەتەنها دژايەتی ئەو هەلاٌنە دەكەم كە لە خراپ بە كار هێنانی مەبەستی فرۆيددا ئەنجامی داوە، بەڵكو ئەو لافانەش ڕەد دەكەمەوە كە دەڵێ بە پێداچوونەوەيەكی كەم ولاوەكی نوێنەرايەتی فيكرەكانی فرۆيد دەكەم. لە ڕاستيدا ماركۆزە هەندێك تيوری دادەڕێژێت كە بە تەواوەتی دژی ئەندێشە سەرەكييەكانی فرۆيدە، ئەم كارە بە بەكار هێنانی هەندێك ڕەستە لە نوسراوە وگوتەكانی فرۆيد كە دواتر لابراون، و بە لەبەرچاو نەگرتنی تەواوەتی پێگە يان مەبەستەكانی ئەو ئەنجامدراوە. كەم تا زۆر ئەو بەلاٌيە كە بە سەر فرۆيددا هێناويەتی بە سەر ماركسيشدا دەيهێنێت. هەر چەندە ئەم ڕەخنەيەش ئاراستەی ماركس دەكات كە نەيتوانيوە ڕاستی تەواو سەبارەت بە مرۆڤی نوێ پەيدا بكات، بەلاٌم بە گشتی خۆی وەك لايەنگری ئامانجەكانی كۆمەڵگای سوسياليستی ئەو نيشان دەدات. بەلاٌم نايەوێت دان بەوەدا بنێت كە مرۆڤە تازە ( منداڵگەراكەی ) ئەو بە

تـەواوەتی پێچـەوانەی مرۆڤـە بەهرەمەنـد وبەتواناکـەی مارکسـە. ئـەو مرۆڤـەی کـە دەتوانێت لـە هـەموو شتێك حـەز بکـات و عاشقی تێکڕای شـتەکانی دەوروبـەری بێـت. مـارکۆزە لـە خۆشەویسـت بـوونی مـارکس وفرۆیـد لـە نێـو جیلـی گـەنجی ڕادیکاڵـدا بـە مەبەسـتی سـرنجڕاکێش نیشاندانی بۆچوونە دژە مارکس و فرۆیدییەکانی خۆی لە مرۆڤـی تـازە کەڵك وەردەگرێت.

چـۆن دەبـێ بیرمەنـدێکی لێهـاتووی وەك مـارکۆزە بـەم شـێوەیە وێنەیـەکی بـە لارێـدا بـراو لـە دەروونشـیکاری بـە دەسـتەوە بـدات؟ لـە ڕوانگەی منەوە وڵامی ئەم پرسیارە گرێدراوی ئەو بایەخ وحەزەیە کە — ئەو ورووناکبیرەکانی دیکـە— بۆ دەروونشـیکاری هەیانـە. لـە ڕوانگـەی ئەوەوە دەروونشیکاری شێوازێکی ئەزموونی نییە بۆ پەردە هەڵماڵین لـە ئارەزۆ و خواستە ناوشیارەکانی تاك کـە دەمامکی لـۆژیکی بوونیـان بـە سـەر خـۆدا داداوە، و هـەر وەهـا تیۆرییـەکیش نییـە کـە سـەرقاڵی هەڵس‌وکەوت وخوو بێت ووروژاندنی ناوشیاری جۆراوجۆر بۆ کارە بە ڕواڵـەت لۆژیکییـەکان نیشـان بـدات. لـە ڕوانگـەی مـارکۆزەوە دەروونشـیکاری کۆمـەڵێك ئەندێشـەی متاپسیکۆلۆژیکە[1] سەبارەت بـە مـەرگ، غـەریزەی ژیـان، پرسـە جنسـییەکانی منـداڵی و.... یـەکێك لـە دەسـتکەوتە گرنگـەکانی فرۆیـد هێنـانی هەنـدێك لـە پرسـەکانە بـۆ نـاو چوارچـێوەی توێژینـەوەی ئـەزموونی کـە پێشـتر لـە فەلسـەفەدا بـە شێوەیەکی ئینتیزاعـی لێـك دەدرایـەوە. مـارکۆزە بـە گەڕاندنـەوەی ئـەم پرسیارە بۆ نـاو ئەندێشـەی فەلسـەفی ئـەم دەسـتکەوتەی فرۆیـدی بـە بـا دا.

---

(1) .Metapsychological

جگە لە گروپی توێژینەرەوانی چەپ کە لە ڕێکخراوەکەی فرۆیددا مانەوە (کە پێشتر باسمان کردن) باسی چوار کەس لە دەروونشیکارەکان دەکەم کە بە شێوەیەکی سیستەماتیکتر بەشدارییان کردوە و کاریگەرییەکی زیاتریان لە سەر کەسانی دیکە داناوە(دژبەرانی وەك ئادلر، رانك و یونگ بە لاوە دەنێم).

"کارن هۆرنای" یەکەم کەس بوو کە لە دەروونناسی ژنان کە لە لایەن فرۆیدەوە خرابووە روو ڕەخنەی گرت و دواتر شێوازێکی بونیادنا کە بە بەلاوە نانی تیوری لیبیدۆ و پێداگری لەسەر هۆکارە کەلتورییەکان هەندێك بۆچوون وڕوانگەی سودبەخشی خستە روو.

" هاری ستك سالیۆن" لە داننان بە گرنگی کەلتووریدا لە گەڵ هۆرنای دا کۆکە، و لە چەمکە دەرونشیکارییەکەی خۆیدا، بە کەڵك وەرگرتن لە تیوری "پەیوەندی نێوان کەسەکان" تیوری لیبیدۆی فرۆید رەت دەکاتەوە. لە حاڵێکدا کە لە ڕوانگەی منەوە تیوری ئەو سەبارەت بە مرۆڤ تا ڕادەیەك بەم راستییەوە کە مرۆڤی مۆدێلی ئەو، نوێنەری مرۆڤی لە خۆ بێگانەی هەنوکەییە، سنووردار دەبێتەوە، دەستکەوتی سەرەکی ئەو بۆچوونەکەیەتی سەبارەت بە جیهانی خەیاڵ وپەیوەندی پرۆسەکان لە نەخۆشە توندەکاندا بە تایبەت تووشبوانی سکیزۆفرێنیا.[1]

---

[1] هەر چەندە کە هۆرنای و سالیۆن ومن لە گروپی فەرهەنگ گەرا وفرۆیدییە تازەکان لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام ئەم ریزبەندییە راست نییە. سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە پێکەوە هاوڕێ وهاوکاربووین وهەندێك ڕوانگەی هاوبەشمان هەبوو –بە تایبەت ئەو ڕەوتە ڕەخنەگرانە سەبارەت بە تیوری لیبیدۆ – بەڵام ناکۆکی نێوان ئێمە لە خاڵە هاوبەشەکانمان زیاترە، بە تایبەت لە ڕوانگەی" کەلتوورییەوە "هۆرنای وسالیۆن مودێلە کەلتوورییەکەیان بە واتای مرۆڤ ناسی نەریتی لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام بۆچوونەکەی من پشت بە توێژینەوەی هێزە سیاسی، ئابووری ودەروونناسیەکان دەبەستێت کە بنەما وکۆڵەکەی کۆمەڵگان.

" ئەریك ئەریكسۆن" لە تیوری سەردەمی منداڵی وكاریگەری كۆمەڵگا لە گەشەی منداڵدا خاوەن ڕۆڵێكی گرنگە. ئەو بەم تویژینەوە لە سەر پرسەكانی ناسنامە ونوسینی بیوگرافی لوتر وگاندی لە ڕوانگەیەكی دەروونشیكارانەوە، ئەم زانستەی پەرەپێداوە. لە ڕوانگەی منەوە ئەو دەیتوانی لە بواری دەروونشیكاریدا پێشكەوتنی زیاتر بە دەست بهێنێت، بەلام لە قۆناغی بە دوادا چوونی توندرەوانەی دەر ئەنجامی تیورییەكانی خۆیدا مایەوە.

" ملانی كلاین" و رێبازەكەی بە خستنە رووی دژایەتی كردنی قووڵی لە لایەن مرۆڤەوە لە رێگای پیشاندانی لە منداڵدا ، كارامەیی ولێهاتوییەكی گەورەی لە خۆی نیشانداوە. لە حاڵێكدا كە بەڵگەكانی ئەو و زۆربەی دەروونشیكارەكان تەنانەت منیشی رازی نەكردووە، بەلام لانی كەم تیورییەكانی ئەو دژە ژەهرێكە لە هەمبەر خواستی عەقڵگەری كە لە بزوتنەوەی دەروونشیكاریدا بە شێوەیەكی بەر بلاو دەبینرا.

خواستی ملكەچ بوون بە داب ونەریت [1] لە نێوان زۆربەی دەروونشیكارەكاندا واتای خۆی لە قوتابخانەیەكدا دەبینییەوە كە بە تێر وتەسەلی شرۆڤەی دەكەم، چوونكە ئەم قوتابخانەیە كاریگەرترین وگرنگترین هۆكارە لە بزوتنەوەی دەروونشیكاریدا. قوتابخانەی دەروونناسی خۆ"من" Ego ئەو قوتابخانەیە [2] كە لە لایەن گروپێك لە

---

[1] .Conformist

[2] دامەرزێنەری ئەم قوتابخانەیەئەمانە بوون

R.M.Loewenstein و E.Kris و H.Hartmann و ئەمانەش نوێنەرەكانی بوون R. W. while- و D rapaport و G. Helein و B .Gill و R.R . Holt

دەروونشیكارەكانەوە دامەرزێنرا، ئەوان بە هاوكاری یەكدی سیستەمێكیان دامەزراند كە تەواوكەری تیوری كلاسیك بوو، هەروەها دەستكەوتەكانی رابردویشان قەبووڵ دەكرد.

ناوی قوتابخانەكە ئەوە دەگەیەنێت كە دامەزرینەرانەكەی زیاتر سرنجیان بە (خۆ) داوە وپشتیان كردە ناوەندی سرنجی فرۆیدەوە واتە "ناخی مرۆڤ". (چالاكییەكانی دژە عەقڵ كە وروژێنەری مرۆڤن، بەلام ناوشیارانەن " . ئەم سرنج دانە بە "خۆ" شەجەرەیەكی برەوداری هەیە . بە تایبەت كە دابەش كردنەكانی فرۆید لە بن ناوی "ناخی مرۆڤ" بە من ومنی بالاsuperego شوێنی دوو لایەنە بوونی سیستەمی كۆنی واتە هەست ونەست گرتەوە وچەمكی خۆ(من) بو بەچەمكێكی ناوەندی لە دەروون شیكاریدا . شارەزایی فرۆید لە لێكدانەوەی دەستە واژەكاندا ، تا ڕادەیەك لە زات وجەوهەری وشەكاندا، سەرەڕای هۆكارەكانی دیكە بە دۆزینەوەی روخسارەكانی نەستی خۆ(من) كە تاڕدەیەك دا بەش كردنەكانی رابردو رەت دەكاتەوە سرنجڕاكێشترە . وبەرهەمەكەی ئانا فرۆید بە ناونیشانی "منومیكانیزمەكانی بەرگری"[1] . ١٩٦٤بو بە خاڵێكی گرنگی سەلماندی ئەم لافە كە دەروون شیكاری من ، بەڵاوبوونەویەكی ئورگانیكە و لە تیوری كلاسیكی فرۆیدەوە سەرچاوە دەگرێت .

دەروون ناسەكانی (من) دوپاتی دەكەنەوە كە قەت نوسراوەكانی ئانا فرۆید یەكەمین بەڵگەی ئەوان نییە ، بەڵكو درێژەپێدەری

[1] من و میكانیزمەكانی بەرگری لە لایەن ئەم وەرگێڕەوە كراوە بە كوردی.

لێکۆڵینـەوە سـەرەتاییەکانی فرۆیـدە سـەبارەت بەلایەنـە ناوشـیارەکانی "مـن" . بەهـەرحاڵ سـەرەڕای ئـەو قسـانەی کـە فرۆیـدی کـردە بـاوکی دەروونناسـی (مـن) ، پۆسـتی بـاوك بـوونی ئـەو بـەو ئەندازەیـەی کـە هارتمەن وگروپەکەی لافـی لێدەدەن، بەنرخ نییـە. سـەرەڕای ئـەوەی کـە فرۆیـد لـە ڕادە بـەدەر بایـەخی بـە "مـن " دەدا بـەڵام دەروونناسـی شـیکردنەوەیی ئـەو بەهەنـدێك خواسـتی ناوشـیار کـە وروژێنـەری هەڵسوکەوتن گەمارۆ دراوە، لەم ڕووەوە ئەو وەك دەروونناسـی "دەرونـی مرۆڤ " "ویژدان" مایەوە .

دەروونناسـی "خـۆ" (مـن) لـە نامێلکەیەکـدا کـە هارتمـەن ، دامەزرێنەری ئەو ڕێبـازە نوسیوەتی وساڵێك دوای کۆچی دوای فرۆید لـە چـاپ دراوە لـەم نامێلکەیـەدا، (دەروونناسـیخۆ و پرسـی پێکـەوە گونجـان )[1] . هارتمـەن سیسـتەمێکی تـازە بـە بایـەخێکی تایبـەت بۆپرۆسـەی پێکـەوە گونجـان بونیـاد دەنێـت. ئـەو بەباشـی ئامـانجی توێژینەوەکـەی خـۆی ڕوون دەکاتـەوە: "دەروونشـیکاری بە لێکۆڵینـەوە لـە سـەر خەسـار ناسـی وئەودیاردانەی کـە لـە سـنوری دەروون ناسـی و سایکۆپاتۆلۆژی Psycho-Pathology دان دەستی پێکرد. لەو کاتەدا کـاری ئـەم زانسـتە لـە سـەر "نـاخی مـرۆڤ " وخواسـتی غـەریزی ورد دەبـوەوە ... بـەڵام ئێسـتا هـیچ گومـانێکم نییـە کـە دەروونشـیکاری بـە

---

[1] Ego psychology and the problof adaptation بۆ ئەوەی کە خستنە ڕووی دەروونناسی"خۆ" کورت بێت لەم ڕووەوە لێرەدا من تەنها نامێلکەکە دەخەمە بەر باس، لەم نامێلکەیەدا سەبارەت بە دەروونناسـی "خۆ" گەلێك بۆچوونی گرنگ خراوەتە ڕوو، بەڵام ئاماژە بەو شتانە نەکراوەکە دواتر هارتمەن وئەندامانی گروپەکەی پێیان زیاد کردووە.

گـوێرەی واتـای بـەرفراوانی وشـەوبە گـوێرەی تێگەیشـتنی ئێمـە لـەو شـێوازانەی کـە بـەربلاوتر و قـوڵتر ودیـار تـرن"[1]. **دەروونناسـیەکی گشتیە .**

چـەمکی نـوێی دەروونشـیکاری بـە واتـای دەروونناسـی گشـتی، دەروونناسەکانی (خۆ) ناچار دەکات تا سرنج بدەنە ئەو دیاردانەی کە دەروونشـیکارانی ڕابـردوو پشـت گوێـان خسـتبوو و لـەم سـاڵانەی دواییـەدا ڕێژەیـەکی کـەم لـە دەروونشـیکاران بایـەخیان پێـداوە: واتـە ڕەوت وشـێوازەکانی کـاری ئورگـانی زەیـن کـە هەنـدێك دەسـتکەوتی گونجـاو وسـازگاری لێدەکەوێتـەوە.[2] ئـەو تیـزەی کـە بوەتـە بنـەمای پەرەپێـدانی زیـاتری دەروونناسـی "خـۆ" ئەمەیـە کـە هـەر جـۆرە پێکـەوە گونجانێك لە گـەڵ ژینگـە یـان هـەر جـۆرە فێربوونێـك لـە گـەڵ پرۆسـەی پێگەیشـتن دژ بـە یـەك نـین. پەرەپێـدانی پێگەیشـتن ، مەبەسـەت، تێگەیشـتن لـە بابـەت ، زمـان، بیرکردنـەوە، بـە بـیر هێنانـەوە، گـرتن، خۆکاش کردن بە سەرزەویدا، ڕۆیشتن وهەر جۆرە پێگەیشتن وهەروەها پرۆسەکانی فێربوون دژ بە یەك نین. دەروونناسـی "خـۆ" لـە سـەر ڕۆڵـی ئـیرادە ولیبیـدۆی " دامـاڵراو لـە ئـارەزۆ جنسـییەکان"[3] و هێـزی وێرانگـەری "دامـاڵراو لـە هەڵچـوون"[4] کـە بـە "خـۆ" هێـزی کـارکردن وئیرادە دەبەخشێت، پێداگری دەکات.[5] لە حاڵێکدا کە ئەم چەمکانە بە

---

[1] نامێلکەی دەروونناسی خۆ و پرسی پێکەوە گونجان
[2] هەمان نامێلکە

[3] . De-sexwalize
[4] .De- ggressived

[5] R.H .White نیشـانیدا کـە نـاتوانین بـە سـرنجدان بـەو زانیارییانـەی کـە هەنووکـە سەبارەت بە کاری سیستەمی دەماری لە بەر دەستماندایە لە بۆچوونی بە کاریگەرکردن و بێ کاریگەر کردنی هێزی لیبیدۆ بەرگری بکـەین. ئـەو لـە بـاتی ئـەوە، هێـزە سـەربەخۆکانی "خۆ" پێشنیار دەکات کە لە ڕۆژی لە دایك بوونەوە بوونیان هەیە و لـە فراوان بـوون و کار وچالاکییەکانی "خۆ"دا بە کار دەهێنرین.

واتای دڵنیا نەبوونە لە بۆچوونەکانی فرۆید سەبارەت بە هێزە دژە عەقڵەکان، کە ئیرادە دیاری دەکەن و کاری "خۆ" سنووردار دەکەنەوە، وسەبارەت بە" ناخ" و"خۆ" لادانێکی بنەڕەتی زیاتریان هەیە. فرۆید وەك" مەنجەڵێك سەیری ناخ دەکات کە هەمیشە لە حاڵی کوڵاندایە".
"گیل" وزۆربەی دەروونناسانی "خۆ" لەو بڕوایەدان کە ناخ خاوەن شێوە وبونیادێکە، هەر چەندە کە عەقڵ گەراش نەبێت"خۆ" و ناخ ئیدی دژی یەکدی قەڵەم نادرێن، بەڵکو پێکەوە گرێدراون. لەم رووەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامە کە دوولایەنە بوونەکان لە ڕوانگەی فرۆیدەوە لە نێوان چێژ وبنەچەی راستیدا ، هێزە جموجۆڵ دار وپابەندەکان وپرۆسەی یەکەم ودووهەمیش پێکەوە گرێدراون. ئەمانەش وەك " ناخ" و"خۆ" لە گەڵ ئەو زەنجیرە پلەی هێز وبونیادانەدا گرێدراوە کە لە تێکڕای ئاستەکاندا خاوەن زەنجیرە پلەن. بە گریمانەی گرێدراوی وزەنجیرە پلە توخمی دیالیکتیك لە بۆچوون و تیورییەکانی فرۆیددا لە ناو چووە. ئامانجی سەرەکی فرۆید لەم نموونەیەش دا وەك نموونەکانی دیکە نیشاندانی ناکۆکی لە نێوان دژبەرەکان ودیاردە تازەکانی سەرچاوەگرتوو لە ناکۆکییە. ئەم شێوازەی دیالیکتیك بیرکردنەوەیەکی تیوریك دەخاتەروو کە بە گوێرەی ئەوە، چەمکی ناکۆکی نێوان دژبەرەکان شوێنی خۆی بۆ گەشە کردن لە نێو ڕێکخراوی زەنجیرە پلەدا چۆڵ دەکات.
تایبەتمەندی پێکەوە گونجانی دەروونناسی "خۆ" لە پێداچوونەوەی دوبارەی فرۆید بە دەروونناسی "خۆ"دا باشتر وشەفافتر لەم خاڵە تیوریکانە نیشان دراوە. فرۆید ئامانجی خۆی بۆ

چارەسەركردن وگەشەی مرۆڤ بە هەندێك فورمولی بوێرانە وشاعیرانە بەیان دەكات:

" لە هەر شوێنێك كە ناخێك هەبێت، "خۆ"یەكیش بوونی هەیە ".
ئەم ڕەستەیە نیشان دەری باوەڕی فرۆید بە عەقڵ و لۆژیكە وهۆكاری پراكتیزە كردنی شێوازی ئازاد كردنی مرۆڤ لە ڕێگای وشیار كردنەوەی هەستەوەیە. بەڵام هارتمەن دەڵێ كە لە گوتەكانی فرۆید بە زۆری خراپ كەڵك وەردەگیردرێت : "... ئەوە بەم واتایە نییە كە هەمیشە مرۆڤێكی عاقڵ بوونی هەیە ویا ڕەنگە بوونی هەبێت ، بەڵكو ڕەوتێكی كەلتوری ومێژوویی وئامانجێكی چارەسەری بەیان دەكات "[1].

ئەم گوتەیە وەرگێڕانێكی پوزتیڤە لە ئامانجی ڕادیكاڵ . ئەم خاڵە كە قەت مرۆڤێكی بەتەواوەتی عەقڵ گەرا بوونی نییەو بوونی نابێت، وەسف كردنی ئەو خواستەیە كە بە پشت بەستن بە وشەی "بە تەواوەتی "، دەبێتە ڕاستی ڕەها. ئەوەی لە ڕوانگەی فرۆیدەوە گرنگ بوو، لانی زۆری كامڵ بوونی خۆ نەبووە بەڵكو"ئاستی گونجاو" ی مرۆڤێكی تەواوە. ئەو بنەمایەكی " نەریتی " دامەزراند كە بە گوێرەی تیوری مرۆڤ بوو، واتە مرۆڤ دەبێ هەوڵ بدات تا لە ئاستی گونجاودا" خۆ" لە شوێنی " ناخ" دا بنێت، چوونكە هەر چەندە لەم هەوڵدانەدا سەركەوتن بە دەست بهێنێت كەمتر تووشی خەمۆكی دەروونی و نەخۆشیەكانی دیكە دەبێت. لێرەدایە كە ناكۆكی نێوان فرۆید وفەیلەسوفە پوزوتیڤیستەكان روون دەبێتەوە. فرۆید پەیوەندی و پێوەرێك بۆگەشە وكامڵ بوونی مرۆڤ دیاری دەكات لە حاڵێكدا كە

---

[1] هەمان نامێلكە

پوزوتیڤیستەکان قسەکانی فرۆید وەك ڕەوتێکی مێژوویی لە قەڵەم دەدەن .و نکوڵی لە جەوهەری پێوەری گوتەکەی ئەو- کە وشە دەبێ لەوێوە کونترۆڵ بکرێت-دەکەن.

هەر ئەم خواستە ڕیفورمخوازانە لە گوتەی هارتمەن سەبارەت بە چەمکی تەندروستی دەروونیشدا بەر چاو دەکەوێت. ئەو، ئەو کەسانەی کە سەبارەت بە نیشانەکانی " تەندروستی هەرە باش"بۆچوونی ڕوەکی دەردەبڕن، ڕەخنە دەکات ولافی ئەوە لێدەدات کە ئەوان ئەو کەسایەتییە جۆراوجۆرانەی کە بە کرداری تەندروست لە قەڵەم دەدرێن و گروپێك لە خەڵك کە لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە پێویستن لە بەر چاو ناگرن.

لە قسەکانی سەرەوەدا واتای "کرداری" چییە؟ هارتمەن بەو لێڵی ونادیارییە کە لە قسەکانیدا بوونی هەیە، یەکێك لە پرسە جێی مشت ومڕەکانی ئێمە لە بەر چاو ناگرێت، وئەمە هەمان دوولایەنە بوونی تەندروستی دەروونە. یەکێك لەم دوو واتایە ئاماژە بە کاری سیستەمی دەروونی بە گوێرەی گەشەی گونجاو دەکات. من ئەم واتایە بە " هومانیستی" ناو دەبەم، چوونکە ناوەند وسەنتەرەکەی مرۆڤە. فورمولی فرۆید سەبارەت بەوەی کە خۆشەویستی نیشانەی تەندوستییە، تاڕادەیەك گشتییە، بەڵام بە ڕوونی ئاماژە بەم خاڵە دەکات کە کەسی لێوانلێو لە نەفرەت ووێرانگەری خۆشەویستی تەندروستی تێدا نییە. ویا خود فرۆید ئەو کەسە بۆ قۆناغی ئانالی-سادیستیك دادەبەزێنێت و بە تەندروست لە قەڵەمی نادات. بەڵام ئایا کەسێکی وەها لە کۆمەڵگایەکی تایبەت دا ناتوانێت پیشەیەکی هەبێت و ئەرکەکانی

جێبەجێ بکات ؟ ئایا کەسی سادیست لەسیستەمی نازییەکاندا کارامەو سودبەخش نەبو؟ ویان کەسێك کە خۆشەویستی دەر دەبڕێت لەو سیستەمە دا بە ناسازگار لە قەڵەم نەدەدرا ؟ ئایا کەسێکی لە خۆبێگانە بە هەستی خۆشەویستی کەموناسنامەی زیاترلە کەسێکی هەستیاروسۆزدار شایستەی کۆمەڵگای تەکنولۆژیکی هەنوکەیی نییە؟ لە وت وویژ سەبارەت بە تەندروستی لە کۆمەڵگایەکی نەخۆشدا چەمکی تەندروستی لە واتای دووهەمیدا، واتا کۆمەڵناسییەکەی بەکار دێت کە مەبەست سازگار بوونە لە گەڵ کۆمەڵگادا . پرسی راستەقینە لێرەدا ناکۆکی نێوان تەندرستی مرۆڤ وتەندروستی کۆمەڵگایە. رەنگە کەسێك بتوانێت لە کۆمەڵگایەکی نەخۆشدا بە شێوەیەکی رێك وپێك کاربکات، چوونکە بەناومرۆڤێکی نەخۆشە. لەم رووەوە وشەی"کرداری" ئەوە دەگەیەنێت کە لەروانگەی کومەڵگاوە سەبارەت بە کەسێیەتی داوەری دەکرێت، بەڵام تاك لەلایەنی دەروونشیکارییەوە داوەری لە سەر دەکرێت .

هارتمەن لێرەدا گرنگترین وڕادیکاڵترین توخمی سیستەمی فرۆیدی بە لاوە ناوە: رەخنە گرتن لە داب و نەریتە ئاکارییەکانی توێژی ناوەڕاست و نارەزایەتی دەربڕین بە ناوی گەشە وکامڵبوونی مرۆڤ . ئەو بە جیاکردنەوەی تەندروستی" مرۆڤ" و " کۆمەڵگا" لە یەکدی و نکوڵی ناراستەوخۆ لە زیان ناسی کۆمەڵایەتی لە هەمبەر فرۆید وەستاوەتەوە، کە باسی " خەمۆکی دەروونی هاوبەش" و "زیانناسی کۆمەڵگا شارستانییەکان " دەکات. هارتمەن ئاگای لەوە نییە کە سەرکوتکردنی ئارەزۆ جنسییەکانی توێژی ناوەڕاستی چەرخی"

ڤیکتوریا" تەندروست" نەبووە. چوونکە توێژی ناوەڕاست بۆ کۆ کردنەوەی سامان، دژی چێژ و دژی بە کار هێنان وەك بونیادی کۆمەڵگا بۆ کەڵەکەی کردنی سەرمایە کە بۆ ئابووری سەدەی ١٩ پێویست بوو، خوویەکی کۆمەلایەتیان لە خۆگرتبوو. فرۆید بە ناوی مرۆڤەوە قسەی دەکرد و لە سەرکوتکردنی نەریتیی ئارەزۆ جنسییەکان کە نەخۆشی دەروونی لێدەکەوێتەوە ڕەخنەی دەگرت.

لە ناوەڕاستی سەدەی ٢٠دا ئیدی گرفت، سەرکوتکردنی ئارەزۆ جنسییەکان نییە، چوونکە لە گەڵ گەشەکردنی کۆمەڵگای بە کار هێنەر " سیکس" خۆی بووەتە کالایەکی بە کار هێنەری ، وخواستی بەختەوەری جنسی بەشێکی مۆدێلی بە کار هێنانە کە شایستەی ئابووری کۆمەڵگای سیبرنێتیکە: لەم کۆمەڵگایەدا هەندێك خواست وغەریزەی دیکە سەرکوت دەکرێن: وشیاری کامڵ ، ئازادی ، خۆشەویستی. لە راستیدا ئەگەر خەڵك، مرۆڤی تەندروست بوون زیاتر دەیانتوانی ڕۆڵە کۆمەلایەتییەکانی خۆیان جێ بە جێ بکەن، دژی کۆمەڵگای نەخۆش ناڕەزایەتیان دەردەبڕی و چاوەڕوانی گۆڕانکاری گەلێکی کۆمەلایەتی–وئابووری بوون کە بتوانێ دوولایەنە بوون لە نێوان تەندروستی لە واتای کۆمەلایەتی وتەندروستی مرۆوایەتیدا کەم بکاتەوە.

دەروونناسی "خۆ" پێداچوونەوەیەکی جیدییە لە سیستەمی فرۆیددا، پێداچوونەوەیەك لە جەوهەری ئەو سیستەمەدا نەك لە چەمکەکانیدا. ئەم جۆرە پێداچوونەوەیە چارە نووسی هەر تیۆرییەکی ڕادیکاڵە. "بڕوای نەگۆڕ" بەرنامەکانی پەروەردەی لە شێوەی سەرتایی

خۆیدا هێشتوەتەوە ولە دەستدرێژی ورەخنە دەیپارێزێت، بەلاّم هەر ئەوانەی دوبارە لێکداوەتەوە، هەندێك شتی تازەی پێ زیاد دەکات لە حالێکدا کە لافی ئەوە لێدەدات ئەم زیاد کردنانە گوتەی سەرەکیین. ئەم شێوازەی پێداچوونەوە جەوهەری پەروەردەی سەرەکی تووشی گۆڕان دەکات. جۆرێکی دیکەی پێداچوونەوە، کە پێشنیار دەکەم ناوی دیالیکتیکی لێ بنرێت، پێداچوونەوەیە لە ریزبەندییە" کلاسیکەکان " بە پاراستنی جەوهەرەکەیانەوە. لەم پیداچوونەوەیەدا هەوڵ دەدرێت کە جەوهەری پەروەردەی سەرەکی لە رێگای ئازاد کردنییەوە لە مەرجی بوونەوەی ( شەرتی بوونەوە) کاتی، وسنووردار کردنی گریمانە تیوریکییەکان بپارێزرێت، هەر وەها هەوڵ دەدرێت تا ناکۆکییەکانی نێو تیوری کلاسیك بە شێوازی دیالیکتیك چارە سەربکرێت و تیوری لە پرۆسەی بە کار هێنانی لە پرسە تازە ئەزموونییەکاندا چاك بکرێت.

رەنگە گرنگترین پێداچوونەوە سەبارەت بە ئەرك بێت کە دەروونناسی "خۆ" ئەنجامی نەداوە. ئەم دەروونناسییە "ناخی" کامڵ نەکردوە، بەم واتایە کە لەو شتەدا کە ناوەندی سیستەمی فرۆیدە بەشداری نەکردووە. و ئەمە "زانستی دژە عەقڵە"[1]. ودیسان لە پەرەپێدانی ئاگاهی ئێمە بۆ پرۆسەکانی ناوشیار، دژایەتی، خۆراگری، ولۆژیکی کردن و گواستنەوەکان هیچ رۆلێکی نەبووە.

و تەنانەت لەوەش گرنگتر ئەمەیە کە دەروونناسی "خۆ" لە چوارچێوەی خۆیشیدا شرۆڤە کردنی رەخنەگرانەی ئازادکردنی بە کار نەهێناوە. ئەو مەترسییە گەوریە کە هەڕەشە لە مرۆڤ دەکات زیاتر لە

---

[1] .Irrationd Science

ڕێگـەی ناتـەوانی لـە ناسـینی تایبەتمەندی سـاختەی "عـەقڵی تەندروست"[1] یان شعوری گشتییەوەیە.

زۆرینـە هێشـتا کۆنـە پەرەسـت و فیکرگـەرا ماونەتـەوە، شـعووری گشتی بە عـەقڵ لـە قەڵەم دەدەن. دەروونناسـی ڕادیکـاڵی "خـۆ" دەبـێ توێژینەوەی ڕەخنەگرانە سەبارەت بە ئاگاهی کۆمەڵایـەتی لە بەر چاو بگرێـت و بە ئامانجی سـەرەکی خۆی لە قەڵـەمی بدات. بەڵام خۆی بە توێژینەوە ڕادیکاڵەکانەوە خەریك نەکردوە. بەڵکو تەنها لە چوارچێوەی ئەندێشەی ئینتیزاعی و میتاسایکۆلۆژیدا ماوەتەوە کە هیچ شتێك بە زانیاری کلینیکی و دەروونناسی کۆمەڵایەتی ئێمە زیاد ناکات.

دەروونناسـی "خـۆ" لـە سـەر لایەنـەکانی لـۆژیکی لـە هـەڤهاتن، پەروەردە، ویستو... پێداگری دەکات.( ئـەم تێگەیشتنە نەریتییە ئەم خاڵە لە بیر دەکات کە مرۆڤی ئەم چەرخە لە نەبوونی کاریگەری خۆی لە سـەر داهـاتوو ئـازار دەبینێـت وپـەروەردە لـە بـاتی ئـەوەی وشـیاری بکاتـەوە ، بە زۆری لە وشـیاربوونی خۆیشـی کـەم دەکاتـەوە.) هەڵبـەت ئەمـە بوارێکی گرنگـە لـە توێژینـەوە کـە تێیـدا هەندێك توێژینـەری وەك پیـاژە، یونسـکی، بـوهلر و هەنـدێکی دیکـە بـە شـێوەیەکی بـاش بەشدارییان کردووە. بوهلر بەم گوتەیە کە ئێمـەش دەزانـین"لیبیـدۆ" لـە "خـۆ"دا نییە بـەڵکو لـە سیسـتەمی مرۆڤدایـە، ڕێزێکـی ئاکادمیکی بـە دەروونشیکاری بەخشی. بەم دانپێدانانەی ئەوان هەندێك لە زێدەڕەوییە تیوریکییـەکانی دەروونشـیکاری کـەم بویـەوە، بـەڵام هەنـدێك لـە

[1]. Common sense

بیرکردنـەوەکانی ئـەم توێژینەرانـە تـەنها بـۆ کەسـانێك تـازەن کـە لـەو بڕوایەدان تیوری لیبیدۆ هەموو شتێك بەیان دەکات.

پێداچـوونەوە لـە دەروونناسـی "خـۆ" تـەنها بـە توێژینـەوەی دەروونناسی سازگار بوو[1] (پێکەوە گونجان) کە خۆی لێکدانەوەیەکی زانستی کۆمەڵایەتی سەدەی بیستەم وجەوهەری کۆمەڵگای رۆژئاوایە، دەست پێ ناکات. هۆکاری گەڕانەوە وبایەخدان بۆ پێکەوە گونجان لە چـەرخی نیگەرانییـەکان وگونجـانی جـەماوەریدا بـە باشـی دەرك دەکرێـت، بـەڵام ئـەم گەڕانەوەیـە نابێتـە هـۆی پێشـکەوتنی تیـوری دەروونشیکاری، بەڵکو لە پاشکەوتنیدا کاریگەرە. لە ڕاستیدا پێکەوە گونجان وسازگاری، جۆش‌وخرۆش وجم‌وجۆڵی کە ماوەیەك هۆکاری کاریگەری کەلتووری هەنوکەیی بوو، بێ کاریگەر کردوە.

دەبێ ئـەم پرسـیارە بخرێتـە ڕوو، ئەگـەر شـرۆڤەکەی مـن ڕاسـتە، بۆچـــــی رێبـــــەرانی بزوتنـــــەوەی دەروونشـــــیکاری ، دەروونناسەکانی "خۆ"یان لە خۆ دوور نەخستوەتەوە؟ کوت ومت ئەو کارەی کە گەڵ پێداچوونەوەخوازەکاندا ئەنجامیاندا. و بە پێچەوانەوە دەروونناسـی "خـۆ" بـوو بـە قوتابخانەیـەك لـە نێـو بزوتنـەوەی دەروونشـیکاریدا، ئـەم ڕاسـتییە ، بـە هەڵبـژاردنی هارتمـەن بـۆ پۆسـتی سـەرۆکی " یـەکیتی ناونەتـەوەیی" لـە سـاڵی ١٩٥١دا بـە شـێوەیەکی هێمایی قەبووڵ کرا.

وڵامـی ئـەم پرسـیارە دوولایەنەیـە. لـە لایەکـەوە دەروونناسـەکانی "خـۆ" دەیانەویسـت ڕاسـتی خۆیان بە پشت بەستن بە بڕوانامەکانی

---

[1]. Psychology Of Adaptation

خۆیان بە ناوی " فرۆیدیستە راستەقینەکان" بسەلمێنن. لە لایەکی ترەوە وا دەهاتە بەرچاو کە ئەوان خواستە گشتییەکانی دەروونشیکاری رەسمییان سەبارەت بە گونجان وشایستەیی ریزلێنان دابین کردبوو. زانیاری و تواناکاری دەروونناسەکانی "خۆ" بە ڕواڵەت بەرەکەت وخێرێکی گەورە بوو بۆ ئەو بزوتنەوەیە کە هۆکاری هەبوونی خۆی لە دەستدابوو، بەرفراوانبوونی سودبەخشی" دەروونناسی ناخی ' لە بیرکردبوو وبە دوای ناساندنی تیوریکدا دەگەڕا. دەروونناسی "خۆ" وڵامێکی هەرەباش بوو بۆ قەیرانی دەروونشیکاری. ئەم هیوایە بۆ ئەمە بوو کە هیوای پێداچوونەوەی ڕادیکاڵ و سودبەخش کە دەبێتە هۆی گێڕانەوەی توانا سەرەکییەکانی دەروونشیکاری بە لاوە نرابوو.

دیسان هەندێك شتی نائاسایی سەبارەت بە قبووڵی دەروونناسی "خۆ" لە لایەن زۆربەی "ئەرزەدۆکسەکانەوە" بوونی هەیە. " ناخت" یەکێك لە دەروونشیکارە لێهاتووەکانی ئەرزەدۆکس، ڕەخنەیەکی لە دەروونناسی گرتووەکە لە ڕەخنەکانی من دەچێت. ئەو لە سەمپۆزیۆمێکدا سەبارەت بە"کاریگەری بەرانبەر لە کامڵ بوونی خۆ وناخدا" دەڵێ :" هەوڵدان بۆ بەرز کردنەوەی دەروونشیکاری بۆ ئاستی دەروونناسی گشتی... بەو شێوەیە کە هارتمەن، سۆسور و کەسانی دیکە مەبەستیان بوو، لە ڕوانگەی منەوە هەنگاوێکە بەرەو دواوە، ئەگەر ئامانجەکەی شێواز ناسی بێت". هەرچەندە کە من لە گەلێك بواردا دژی

ناختم[1]، بەڵام لەم بارەیەدا کە قوتابخانەی دەروونناسی لە جەوهەری دەروونشیکاری پاشەکشەی کردوە هاوڕام.

سەرەڕای هەندێك ئاماژەی نارەحەتکەر، دەروونشیکاری لە حاڵێکی لە ناو چووندا نییە. بەڵام دەتوانین چاوەڕوانی مردنی بین، مەگەر ئاراستەکەی گۆڕانی بە سەردا بێت. مەبەست لە " قەیرانی دەروونشیکاری"ئەمەیە. وەك هەر قەیرانێکی دیکە لەم بارەیەوە دوو لایەن بوونی هەیە: لە ناو چوونی وردەوردەیی یان نوێ کردنەوەیەکی داهێنەرانە. بە شێوەیەکی روو لە زیاد بوون ئاشکرا دەبێت کە قەیرانی هەنووکەیی مرۆڤایەتی پرسێکە کە پێویستی بە تێگەیشتن وچارەسەری وئاگاهی قووڵ لە پەرچەکرداری‌مرۆڤ هەیە ودەروونشیکاری دەتوانێت لەم بارەیەدا ڕۆڵی گرنگ بگێڕێت. دیسان ئەگەر کەسێك بە ڕاستی حەزی لە توێژینەوە بێت، دەروونشیکاری گۆڕەپانێکی گونجاوە کە لە زیندەوەرناسی وفیزیا کەمتر نییە. بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە دەتوانن توانایی کاریگەری وبیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لە گەڵ تواناکاری وردبینی پرۆسە دەروونییەکان تێکەڵاو بکەن.

دەرئەنجام، نوێ کردنەوەی داهێنەرانەی دەروونشیکاری کاتێك ئەنجامدەدرێت کە بە سەر گونجانی پوزوتیڤیستی خۆدا زاڵ ببێت ودوبارە وەك تیورییەکی ڕەخنەگرانە وڕۆحێکی هۆمانیستی ڕادیکاڵ

---

[1] لە قسەکانی ناخت لە سەمپۆزیۆمی "کاریگەرییە بەرامبەرەکان لە کامڵ بوونی خۆ وناخدا " لە کونگرەی ١٧ یەکییەتی ناو نەتەوەیی دەروونشیکاری کە لە ١٩٥١/٨/٨ لە ئامستردام ، هۆڵەندا بەرێوە چوو.

دەركەوێتەوە. ئەم دەروونشيكارييە چاوپێداخشێندراوە وچاك بووە تا قوڵايى نەست درەى كردوە ولە تێكڕاى داب ونەريتە كۆمەلايەتييەكان كە مرۆڤيان گەمارۆ داوە ولە شێوەى خۆى دوريان خستوەتەوە، ڕەخنە دەگرێت. يەكێك لە ئامانجەكانى ئەم دەروونشيكارييە ئەو پرۆسانەيە كە دەتوانن پێداويستييەكانى مرۆڤ لە گەڵ كۆمەڵگادا بگونجێنن، نەك ئەوەى مرۆڤ وەك كۆمەڵگا لێبكەن. بە تايبەت كە دەروونشيكارييەكى وەها ، ديياردە دەروونناسانەكان كە نەخۆشينەكانى كۆمەڵگاى ئەم چەرخەيە، وەك : لە خۆ بێگانەيى، نيگەرانى، تەنيايى، ترس لە هەستى قووڵ، نەبوونى چالاكى ونەبوونى شادى لێك دەداتەوە. ئەم نەخۆشينانە لە دەرئەنجامى سەركوتكردنى ئارەزۆ جنسييەكانى سەردەمى فرۆيددا رۆلێكى گرنگيان هەبووە، و تيورى دەروونشيكارى دەبێ بە شێوەيەك دابرێژرێت كە لە لايەنە ناوشيارەكانى نەخۆشينە باسكراوەكان وهەل‌ومەرجى چارەسەر كردنيان، لە كۆمەڵگا وبنەماڵەدا، كە سەرچاوەى ئەو نەخۆشينانەن تێبگات.

بە تايبەت دەروونشيكارى لە سەر "زيان ناسى ئاسايى" و سكيزۆفرنياى درێژخايەن وسوك كە بەرهەمى كۆمەڵگاى سيبرنتيك وتەكنۆلۆژيكى هەنووكە وداهاتووە ، لێكۆڵينەوە دەكات.

# 2-مرۆڤی مودێلی فرۆیدو یاسا وڕێسا کۆمەڵایەتییەکانی

بۆتێگەیشتن لە بنەما کۆمەڵایەتیەکانی بۆچوونەکانی فرۆید سەرەتا دەبێ سرنج بدەین کە ئەو ڕەخنە گەرێکی لیبراڵی کۆمەڵگای بورژوازی بوو ولەم ڕوانگەیەوە تێکڕای ریفۆرم خوازە لیبراڵەکان ڕەخنەگر بوون. فرۆید دەیبینی کۆمەڵگا هەندێك شتی ناپێویست بە سەر مرۆڤدا دە سەپێنێت، کە بە پێچەوانەوەی چاوەڕوانییەوە دەرئەنجامی خراپتری لێدەکەوێتەوە . ئەو دەیبینی کە ئەو دژوارییە ناپێویستە، کە لە بواری ئاکاری جنسیدا بوونی هەبوو، خەمۆکی دەروونی لێدەکەوێتەوە کە لە گەلێك نمونەدا بە لێك بوردن دەتوانێ دوری بخەیتەوە ( واتە بە لێك بوردن ڕێگە نەدەێت کە خەمۆکی دەروونی دروست ببێت ) دەستە واژە سیاسی وپەروەردەییەکان هاوتەریبن. بەڵام فرۆید قەت ڕەخنەی لە کۆمەڵگای سەرمایەداری نەگرتووەو قەت بنەمای کۆمەڵایەتی - ئابووری ئەم سیستەمەی نەخستوەتە ژێر پرسیارەوە، ولە ئایدولۆژییەکانی ڕەخنەی نە گرتووە - لەو نمونانەی کە پەیوەندی بە ئارەزۆ جنسیەکانەوە هەبورە.

سەبارەت بە تێگەیشتنی فرۆید لە مرۆڤ ، دەبێ بە بیری بهێنینەوە ئەو، کە شەیدای هۆمانیزمی ڕووناك گەریبوو، بە هەمان گۆشە نیگاوە

سەیری بوونی مرۆڤی دەکرد، – مرۆڤێکی تەواو، نە ئەو مرۆڤەی کە لەکەلتوورەکانـدا دەبینرێـت، مرۆڤێـك شایسـتەی تێکـڕای بـەها گشتی وئەزموونییەکان. فرۆیـدیش وەك سـپینوزا "مـودێلی سروشـتی مرۆیـی" دروست کرد کە نەتەنها لـە سـەر بنـەمای خـەمۆکی دەروونـی، بـەڵکو لایەنـە بنەڕەتییـەکان، دەرفەت وپێویسـتەکانی مـرۆڤ تێـدا دیـارو بەرچاو بوون.

مودێلی فرۆید چییە؟

فرۆیـد وەك سیسـتەمێکی داخـراو سـەیری مرۆڤـی دەکـرد کـە بـە دوهێز بەرەوپێش دەڕوات: خواستی پاراستنی زات وخواستی جنسی. بنـەڕەتی خواسـتی جنسـی لـە نێـو پرۆسـە کیمیـایی – فیزیولۆژیکیەکاندایـە و بـە شـێوازێکی قۆنـاغ بـە قۆنـاغ دەجوڵێنـەوە. قۆنـاغی یەکـەم "گـرژی"[1] زیـاد دەکـات وقونـاغی دوهـەم گـرژی کـەم دەکاتەوە دەرئەنجام حاڵەتێك درووست دەکات کە بە شـێوەیەکی زەینـی لێکدانەوەیەکی هەستی "چێژە". لـە لایەکەوە مرۆڤ بوونـەوەرێکی تـەنیا وگۆشـەگیرە[2] یەکـەمین خواسـت وحەزی ئـەوە دامرکانـدنی گونجـاوی "خۆ" وپێویستیە لیبیدوییەکانیـە[3]. مرۆڤی فرۆیـد (ڕۆبۆتـە[4] ) کە بە وروژێنـەری دەروونـی دەکەوێتـە جموجـۆڵ. لـە لایـەکی تریشـەوە مـرۆڤ

---

[1] – گـرژی کـە وەرگێڕانـی Tension ە. لـە دەروونناسـیدا بـە واتـای ئامـادە بوونـە بـۆ ئەنجامی کارێك ودابـەزینی ئـەم ئامادییـە دوای ئـەنجامی کارەکـە دێـت. بـە دەربڕینێکیـتر گـرژی بریتیـە لـە دەرکـەوتنی حاڵـەتی نـا هاوسـەنگی لـە ئۆرگانیزمـدا وناچـار کردنـی بـە ئەنجامدانی کارێك کە دوبارە هاوسەنگی لێدەکەوێتەوە. و.

[2]- Isolated

[3] – Libido لیبیدۆ بریتیـە لـە هێـزی سـەرەکی وژیانی بونـەوەرانی زینـدو کـە لـە ڕێگـەی غەریزە جنسییەکانەوە دەر دەکەوێت وفرۆید بەناوی غەریزەی ژیان ناوی دەبات. و.

[4] .Homme machine

بوونــەوەرێکی کۆمەڵایەتیشــە. چــوونکە بــە مەبەســتی دامرکانــدنی خواستەکانی لیبیدۆ وپاراستنی زات پێویستی بە کەسانی دیکە هەیە. منــداڵ پێویســتی بــە دایکــە( لێــرەدا لــە ڕوانگــەی فرۆیــدەوە خواســتە لیبیدۆییــەکان بــە دوای پێویســتییە دەروونییەکانــدا دەڕۆن) وکەســانی پێگەیشــتو پێویســتیان بــە ڕەگــەزی بەرامبــەری خۆیــان هەیــە. هەنــدێك هەستی وەك میهرەبانی وخۆشەویستی ئەو دیاردانەن کە لـە خواستە لیبیدۆییەکانــەوە سەرچــاوە دەگــرن. خــەڵك بــۆ دامرکانــدنی خواســتە دەروونییەکانی خۆیان پێویستیان بە یەکدی هەیە. مرۆڤ لـە بنەڕەتـدا گرێــدراوی کەســانی دیکــە نییــە، پەیوەنــدی لــە گــەڵ هاوڕەگــەزەکان بارودۆخێکی دوهەمینە کە مرۆڤ بە ناچاری قبووڵی دەکات.

"مرۆڤــی جنســی"[1] ڕوویــەکی دیکــەی "مرۆڤــی ئــابووری"[2] کلاسیکە، واتــە ئــەو مرۆڤێکــی گۆشــەگیر وتەنهایــە کــە پێویستەکانی خۆی دابین دەکات ، دەبێ لە گەڵ کەسانی دیکەدا پەیوەندی گرێ بدات تا لە بەرامبەردا پێویستییەکانی یەکدی دابین بکەن. مرۆڤی ئابووری خاوەن پێداویستی ئابوورییە کە دابینکردنی ئەوانە بە گۆڕینەوەی شت ومــەك لــە بــازاڕدا مــومکین دەبێــت. پێداویســتییەکانی مرۆڤــی جنســی فیزیۆلۆژیکی ولیبیدۆییــە، کە بە شێوەیەکی ئاسایی بە پەیوەندی لـە گەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا دادەمرکێت. لـە هـەر دوو جۆرەکـەدا، مرۆڤەکان لە بنەڕەتدا لـە یەکدی بێگانـە دەمێنێنـەوە، وپەیوەندییەکـەیان لـە گـەڵ یەکـدی تــەنها بــۆ ئامــانج وخواســتێکی هاوبــەش دروســت بــووە. ئــەم پێناســە کۆمەڵایەتییــە لــە تیــوری فرۆیــد بــە ڕۆحــی ئــابووری بــازاڕەوە،

---

[1]. Home Sexualie

[2]. Homo E conmicus

هۆکاری هەڵەبوونی تیۆرییەکە نییە، بەڵکو وەك پێناسەی پەیوەندی خەڵك لە کۆمەڵگای بورژوازیدا سەبارەت بە زۆربەی خەڵك راستە.

بۆ شرۆڤە کردنێکی گشتی سەبارەت بە پێناسە کۆمەڵایەتییەکانی فرۆید لە غەریزە وخواستەکانی پێویستە خاڵێك زیاد بکرێت. فرۆید قوتابی " فۆن بۆکە " بوو، دەروونناسێك کە یەکێك لە بەناو بانگەکانی ماتریالیزمی میکانیستیکی تایبەت بە ئەڵمانیا بوو. ئەو جۆرە ماتریالیزمە لە سەر ئەم بنەمایە دامەزراوە کە سەرچاوەی تێکڕای دیاردە دەروونییەکان گرێدراوی هەندێك پرۆسەی تایبەتە لە دەروونناسیدا و ئەگەر کەسێك ئەم سەرچاوانە بناسێت دەتوانێت لەو پرۆسانە تێبگات و پێناسەیان بکات.[1] فرۆید لە گەڕان بە دوای سەرچاوەکانی نەخۆشی دەروونیدا، ناچاربوو سەرەتا زەمینەی دەروونی بۆ خواست وئارەزۆکان بدۆزێتەوە، دۆزینەوەی ئەم زەمینەیە لە پرسە جنسییەکاندا رێگە چارەیەکی خەیاڵی بوو، چوونکە لە هەمان حاڵدا لە گەڵ ناچارییەکانی شێوازی بیرکردنەوەی میکانیکی-ماتریالیستی پەیوەندی پەیدا دەکرد وهەروەها لە گەڵ هەندێك لە دۆزینەوە کلینیکییەکان لە نەخۆشەکانی سەردەم وکۆمەڵگای ئەودا

---

[1] گرێدراوی ریز بەندی کراوی تیوری فرۆید بە فیکری مامۆستاکەی لە لایەن" پیتر ئاماخر لەPsychological Issyes دا هاتووە و" رابرت هالت" تیزی سەرەکی ئەم نوسراوەیەی بەم شێوەیە کورت کردوەتەوە: نهێنی ترین وڕەهاترین بەشی تیوری دەروونشیکاری، سەبارەت بەوەی کە پێشنیارەکان درۆینە وشیاوی تاقی کردنەوە نین، یان گریمانەی شاراوەی بیولۆژیکین ویان دەرئەنجامی راستەوخۆی خودی گریمانەکانە، فرۆید لە مامۆستاکانی خۆی لە زانکۆ فێر بووە. ئەمانە بەشی سەرەکی ئامرازە زانستی وفێکرییەکانی ئەوەو ئەو خۆی بە بیولۆژیکی لە قەڵەم دەدات.

هاوئاهـــەنگ بـــوو.ئەگـــەر ئەندێشـــەکانی فرۆیـــد لـــە چوارچـــێوەی فەلسەفەکەیدا نەبوو گاریگەری قووڵی ئەم دۆزینەوانە شاراوەو نهێنـی دەمایـەوە، بـەڵام بـێ گومـان کـە فەلسـەفەکەی هۆکـارێکی دیـاری کـەری گـرنگ بـوو لـە تیـوری وخواسـت وئارەزۆکـانی ئـەودا. ئـەم کـارە ئـەوە دەگەیـەنێت کە تێگەیشـتنی کەسێك کە لـە سـەر بنـەمای فەلسـەفەیەکی دیکە دۆزینەوەکانی فرۆید لێك بداتەوە لایەنێکی شەکاکی( ئەو کەسەی کە لە هەموو شتێك گومان دەکات ) لە خۆ دەگرێت. ئەم شەکاك بوونە بە شێوەی سنووردارکراوی تیورییەکانی فرۆیـد، کە بە گوێرەی ئەوە لـە هەنـدێك لـە ئازارەکـانی خـەمۆکی دەروونیـدا هۆکـاری جنسـی ڕۆڵێکـی دیاری کەری هەیە، پەیوەندییەکی ئەوتۆی نییە، بەڵکو سەبارەت بەم لافەیـە کـە تێکـڕای خەمۆکییـەکانی دەروون وتێکـڕای کارەکـانی مـرۆڤ دەرئـــەنجامی نـــاکۆکی نێـــوان خواســـتی پاراســـتنی زات وخواســـتی جنسییە.

دیسـان تیـوری لیبیـدۆی فرۆیـد ڕەنگدانـەوەی پێگـەی کۆمەڵایـەتی ئـەوە لـە واتایـەکی دیکـەدا. ئـەم تیورییـە لـە سـەر بنـەمای چـەمکی کـەم وکـۆڕی دامـەزراوە، واتـە تێکـڕای هەوڵدانـەکانی مـرۆڤ بـۆ بـە دەسـت هێنـانی شـەهوەت لـە پێویسـتی ئـەو بـۆ ڕزگـاری لـە گـرژی وناکۆکییـە ناخۆشـەکان سەرچـاوە دەگرێـت، نـەك ئـەوەی شـەهوەت دیاردەیـەکی فـراوان بێـت کـە ئامانجەکـەی تونـدی وقووڵبوونـەوەی زیـاتر بێـت لـە ئەزموونەکانی مرۆڤدا. ئەم بنەچەی کەموکوڕییە تایبەتمەندی شێوازی

بیرکردنەوەی چینی ناوەڕاستە کە کەسانێك وەك ماڵتوس[١]، بنیامین فرانکلین وتاکیکی مامناوەندی سەدەی ١٩ بە بیر دەهێنێتەوە. گەلێك لێکدانەوە سەبارەت بە بنەچەی کەم وکوڕی وبالاّ بوونی کۆکردنەوە بوونی هەیە، بەڵام ناوەڕۆکی بابەتەکە ئەمەیە کە ڕێژە وچەندایەتی شت ومەکەکان دەبێ سنووردار بێت. لەم ڕووەوە دامرکاندنی یەکسان بۆ هەمووان مومکین نییە، چوونکە زیاد بوونی ڕاستەقینە مومکین نییە، لە سنووورداربوونێکی وەهادا، کەم وکوڕی، بۆ چالاکی مرۆڤ پاڵنەرێکی گرنگ لە قەڵەم دەدرێت.

تیوری پاڵنەرەکانی فرۆید، سەرەڕای هۆکارە کۆمەڵایەتییەکەی، وەك هۆکارێکی سەرەکی بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە. تەنانەت ئەگەر تیوری لیبیدۆش بە هەمان شێوە کە خراوەتە ڕوو، دروست نەبێت، دیسان دەتوانین بڵێین کە وەسفکردنی سەمبولیکی دیاردەیەکی گشتییە، واتە هەڵس وکەوتی مرۆڤ لەو هێزانەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەر چەند ناوشیارانەن بەڵام مرۆڤ دەوروژێنن، دەیخەنە جم وجوڵ و ناچاری دەکەن دژایەتی بکات. سروشتی تا ڕادەیەك بێ دەنگی مرۆڤ ، فریودەرە. هۆکاری بوونی ئەم سروشتە سیستەمی ئەو هێزانەیە کە خۆیان نەگۆڕن وتا هەل ومەرجێك کە ئەم هێزانە دروست دەکات، نەگۆڕێت ، سروشتی بێ جم وجوڵی مرۆڤیش بێ گۆڕان دەمێنێتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم هەل ومەرجە، کۆمەڵایەتی یان تایبەتی، بگۆڕدرێت

---

[١] Malthus دامەزرێنەری تیوری زیادبوونی جەماوەر بە شێوەی بەرز بوونەوەی هێندسی وزیاد بوونی مادەی خۆراکی بە شێوەی بەرزبوونەوەی ژمارەیی.

سیستەمی هێزەکان سەقامگیری خۆیان لە دەست دەدەن ومۆدێلی هەڵس و کەوتی بە روالەت بێ جم وجۆڵیش هاوکات گۆڕانی بە سەردادێت.

فرۆید بە وەسفکردنی دینامیکی خۆی لە کارەکتەر[1]، دەروونناسی هەڵس وکەوتی لە ئاستی بەیانێکی سادە بۆ ئاستێکی زانستی بەرز کردوەتەوە ودەروونناسی گەیاندە شوێنێك کە درام نوس وچیرۆك نوسە گەورەکان هونەریان گەیاندوەتە ئەو شوێنە. فرۆید مرۆڤی وەك پاڵەوانێکی درامی خستە روو کە ئەگەریش خاوەن تواناکارییەکی مامناوەندیش بێت دیسانیش پاڵەوانە، چوونکە لە پێناوی واتا بەخشین بە لە دایك بوونەکەی خەبات وململانێ دەکات. درامی فرۆید، گرێی ئودیپ[2]، ڕەنگە بە تەواوەتی وەرگێڕدراوی بێ زەرەری بورژوازی لەو هێزانە بێت کە لە سێ کوچکەی دایك -باوك- کوڕ بالاترە و گرێی ئودیپ نوێنەرایەتی دەکات، بەلام فرۆید چۆنییەتییەکی دراماتیکی ئەفسانەیی بەم سێ کوچکەیە بەخشیوە.

تیوری پاڵنەرەکان تا ساڵی ۱۹۲۰، کە قۆناغێکی تازە لە فیکرەکانی فرۆید دەستی پێکرد وبووە هۆی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی

---

[1] .Charater

[2] گرێی ئودیپ بریتییەلە، حەز وخواستی شەهوەتی وسەرکوتکراوی کوڕ سەبارەت بە دایك. ئودیپ پاڵەوانێکی ئەفسانەیی بە ناو بانگە. بە گوێرەی ئەم ئەفسانەیە ئودیپ کوڕی لایوس پادشای تەبەس بوو. یەکێك لە فاڵگیرەکان چارەنووسی ئەو پێشبینی دەکات کە ئەو باوکی خۆی کوشتوە و لە گەڵ دایکی زەواجی کردوە . باوکی لە بیابان بەرەلای دەکات. شوانەکان منداڵەکە دەدۆزنەوە ولە مردن رزگاری دەکەن ودواتر دەیبەن بۆ لای پادشای کورنت.

لە بۆچوونەکانی ئەولە سەر مرۆڤ، بە سەر ئەندێشەی سیستەماتیکی ئەودا زاڵ بوو. لەوە بە دواوە لە باتی ناکۆکی نێوان"خۆ" وپاڵنەرە لیبیدۆییەکان، ناکۆکی نێوان غەریزەی ژیان وغەریزەی مەرگ هاتە ئاراوە. غەریزەی ژیان کە خۆ وپاڵنەرە جنسییەکانی لە خۆ دەگرێت روویەروی غەریزەی مەرگ، کە سەرچاوەی وێرانگەری مرۆڤ لە قەڵەم دەدرا ، بەرەو خودی کەسەکە یان بەرەو جیهانی دەرەوە نیشانە دەگیرا، بۆیە ئەم پاڵنەرە بنەڕەتییە تازانە لە چەند لایەنەوە لە گەڵ پاڵنەر وئارەزۆ کۆنەکاندا جیاواز بوو. یەکەم ئەوەی کە ئەوانە لە شوێنێکی تازەی ئورگانیزمدا جێگرنابن، و لیبیدۆ لە هەرێمی وروژێنەرە جنسیەکاندایە. دیسان پاڵنەرە تازەکان پێوانەکانی میکانیزمی ئیدرولیك جێبەجێ ناکەن: گرژی روو لە زیاد بوون نارەزایەتی وەستان رازی بوون گرژیتازەو...، بەڵکوخۆی بەشێکی جیاوەنەبووی بوونەوەری گیانلەبەرە و بە بێ هیچ وروژاندنێکی تایبەت کار دەکات، بەڵام هێزە وروژێنەرەکانیان لەو غەریزانەی کە بە شێوەی ئیدرولیك کار دەکەن لاوازتر نییە. هەر وەها غەریزەی ژیان لە بنەمای پاوانخوازانەوە گەڕانەوە بۆ بارودۆخی سەرەتا، کە فرۆید بۆ هەر غەریزەیەك دایدەنا، جێ بە جێ ناکات. غەریزەی ژیان خوازیاری یەکبوونە، بەڵام خواستی مەرگ پێچەوانەیە وبەرەو وێرانگەری وجیابوونەوە دەڕوات. هەر دوو پاڵنەرە هەمیشە لە ناخی مرۆڤدا کار دەکەن، ئەوانە پێکەوە شەڕ دەکەنو تێکەڵ بە یەك بن، تا لە کۆتایدا غەریزەی مەرگ دەیسەلمێنیت کە بەهێزترە وسەرکەوتنی کۆتایی، کە ، لە ناوبردنی داهاتوویە، ئەو دەستەبەری دەکات. ئەم چەمکە تازەیە لە

وروژێنەرەکان گۆڕانکاری بنەڕەتی لە شێوازی بیرکردنەوەی فرۆید نیشان دەدات و ئێمە دەتوانین ئەم گۆڕانکارییانە گرێبدەن بە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە بنەڕەتییەکانەوە.

چەمکی تازەی پاڵنەرەکان لە مودێلی بیرکردنەوەی ماتریالیست – مکانیستیك پەیرەوی ناکات، بەڵکو ڕەنگە بتوانین وەك چەمکێکی بیولۆژیکی لە جموجۆڵ و گۆڕانکاری بۆچوونی گشتی لە ئەندێشە بیولۆژیکی ئەو سەردەمە چاوی لێبکەین. بابەتی گرنگتر تێگەیشتنی تازەی فرویدە لە ڕۆڵی وێرانگەری مرۆڤ. ئەو لە تیوری یەکەمی خۆیدا باسی توندوتیژی کردوەوبە هۆکارێکی گرنگی لەقەڵەم داوە کە فەرمانەکانی وروژێنەر و پاڵنەرە لیبیدۆییەکان وپاراستنی زات جێبەجێ دەکات. لە تیوری تازەی وێرانگەریدا ڕکەبەری پاڵنەری لیبیدۆیی و"خۆ" یە کە لە کۆتاییدا بە سەریاندا سەر دەکەوێت. مرۆڤ ناتوانی خواستی وێرانگەری لە خۆی دوربخاتەوە، چونکە خواستی وێرانگەری لە ئورگانی بیولۆژیکی ئەودایە. هەرچەند دەتوانێت تا ڕادەیەك ئەو خواستە کەم بکاتەوە، بەڵام قەت ناتوانێ هێزەکەی لە ناو بەرێت، هەروەها دەتوانین غەریزەی توندوتیژی تەنها بەرەوخومان یان بەرەو جیهانی دەرەوە ئاراستەی بکەین. مرۆڤ لەم هەلومەرجە کارەسات بارە ڕزگار نابێت. گەلێك هۆکار بۆئەم گریمانە بوونی هەیە کە رازیمان دەکات بۆچوونەکانی فرۆید لە وێرانگەری ئەزموونەکانی شەڕی جیهانی یەکەمەوە سەرچاوە دەگرێت. کوڵەکەکانی خۆشبینی لیبراڵی کە یەکەمین قۆناغی ژیانی فرۆید لە خۆدەگرێت، لە لایەن ئەم شەڕەوە توشی هەژاران هات. تا ساڵی ١٩١٤ خەڵکی چینی ناوەڕاست لەو

باوەڕەدا بوون کە دونیابە خێرایی بەرەو ئاشتی وئاسایش هەنگاو دەنێت. وردەوردە وا دیار بوو کە تاریکی چاخەکانی ناوەڕاست بەرەو کۆتایی دەڕوات، بە شێوەیەك کە دوای چەند هەنگاوێکی دیکە جیهان – یان لانی کەم ئەوروپا _ رووناك دەبێتەوە.

بورژواکانی ئەو"سەردەمە زێرینە" لە بیریان چووبوو کە وێنەی وەها لە جیهان لە نێو زۆربەی کرێکاران وجوتیارەکانی ئەوروپادا راست نەبوو و بارودۆخی خەڵکی ئەفریقا وئاسیاش لەوە خراپتر بوون. شەڕی ١٩١٤ خەیاڵەکانی فرۆیدی سەراوبن کرد، بەتایبەت درێژە کێشانی شەڕوکارە نامرۆڤایەتییانەکانی نێو شەڕبە تەواوەتی ئازاری دەدا. ئەو کە لە کاتی شەڕدا بڕوای بە مافداربوون وسەرکەوتنی ئاڵمانیا هەبوو زیاتر لە خەڵکی ئاسایی تووشی شۆك بوو. ورەنگە هەستی بەوە کردبێت کە هیوا وئەندێشە رووناك کەرەوەکانی جگە لە خەیاڵ هیچی تر نەبوون، وگەیشتە ئەو ئەنجامە کە مرۆڤ لە سروشتدا وێرانگەر خولقاوە، دیسان بۆئەوەی فرۆید کەسێکی ریفۆرم خوازبوو لەم رووەوە شۆکی شەڕلە سەر ئەو زیاترو بەهێزتربوو. وبۆ ئەوەی ڕەخنەگری رادیکاڵ وشۆڕشگەری کۆمەڵگا نەبوو، لەم رووەوە نەیدەتوانی هیوای بە گۆڕانکاری بنەڕەتی کۆمەڵگاهەبێت: ناچاربوو، لە سروشتی مرۆڤدا لە هۆکارەکانی ئەم کارە ساتە بگەڕێت[1].

---

[1] . فرۆید ئەم ڕەشبینیە تازەی خۆیەی بە شێوەکی زۆر کورت لە کتێبی"شارستانی وناخۆشیەکانی " دەربڕیوە ومرۆڤ وەك بوونەوەرێکی تەمبەڵ لە قەڵەم دەدات کە پێویستیان بە سەرۆکی بەهێز هەیە.

لــە ڕوانگــەی مێژوویيــەوە، فرۆيــد لــە ســنوری گۆڕانكارییــەكی ڕادیكـاڵی هەڵس‌وكـەوتی كۆمەڵایەتیـدا بـوو. ئـەو لـەو لایەنـەوە كـە لـە سـەدەی ١٩دا دەژیـا بیرمەنـدێكی گەشـبین وروونـاكبیر بـوو، بـەلام لـەو ڕوانگەوەوە كە لە سەدەی ٢٠دا دەژیا كەسێكی ڕەشبین لە قەڵەم دەدرا كە نوێنـەری بێ هیـوای كۆمەڵگایـەك بوو كـە گیرۆدەی گۆڕانكارییەكی خێراوچاوەڕوان نـەكراوببوو. ڕەنگـە ئـەم ڕەش بینیـە بـە نەخۆشـینە بەهێزومەترسیدارەكەی بـەهێزتربوبێت، ئـەو نەخۆشـینەی كـە تـا ڕۆژی مـردن بـە دلێری وتواناكارییـەوە تەحـەمولی كـرد، ڕەنگـە هەڵگـەڕانـەوەی هەندێك لە شوێن كەوتوە بە تواناكانی، وەك ئادلر، یونگ و ڕانـك – بـوە هـۆی تونـد بوونـەوەی ئـەم ڕەش بینییـە، بـە هـەر حـاڵ فرۆیـد نـەیتوانی گەش بینی لە دەست چووی خۆی بە دەست بهێنێتـەوە. بـەلام ڕەنگـە لـە لایەكی ترەوە ئـەو نـە دەیەویسـت ونەدەیتوانی بـە تـەواوەتی پەیوەنـدی خـۆی لــە گــەڵ ئەندێشــەكانی ڕابــردووی بپچــڕێنێت. ڕەنگــە هەربــەم بۆنەیـەوە بێـت كـە قـەت نـەیتوانی ناكۆكی نێوان چـەمكی تـازە وكـۆنی مرۆڤ چارەسەر بكات، لیبیدۆی ڕابردو بە غەریزەی ژیان وتوندوتیژی ڕابردو بە غەریزەی مەرگ لێك درایەوە. بەلام بەداخەوە ئاشكرایە كە ئەم لێكدانەوەیە تەنها كۆكردنەوەیەكی تیوریك بوو.[1]

لە مرۆڤی مودێلی فرۆیـددا لـە سـەر دیالیكتیكی عـەقڵ گـەری[2] دژە عـــەقڵی[3] پێداگرییـــەكی زۆر دەكرێـــت .تازەبوون‌وگـــەورە بـــوونی

---

[1] لە كتێبی " دڵی مرۆڤدا" هەوڵمداوە غەریزەی مەرگی فرۆید بە تیوری لیبیدۆی ئانال( بە پاش) پەیوەند بدەم. و لە كتێبی هۆكارەكانی وێرانگەری مرۆڤ پەیوەندی نێوان ئارەزۆ جنسییەكان وغەریزەی ژیان لە سیستەمی فرۆیدداهێك بدەمەوە,

[2]. Ratlanality

[3]. Irrationlity

ئەندێشەكانی فرۆید لەم خاڵەدایە. فرۆید جێگری بیرمەندانی سەردەمی رووناك گەری عەقڵ گەرایی بووو بڕوای بە هێزی عەقڵ وهێزی ئیرادەی مرۆڤ هەبوو. بەڵام دواتر عەقڵگەری سادەو بێگەردی خۆی رووبەروی ناكۆكی زاتی ئەو دوبنەمایە كردەوە ولە لایەنی دیالیكتیكەوە سەنتیزێكی تازەی پەیدا كرد. لەم سەتیزەدا ئەندێشەی رووناك گەری عەقڵ گەر و شەكاكی(گومانگەر) سەدەی ٢٠ لە لێك دانەوەی ئەو سەبارەت بە نەست ئاماژەی پێكراوە. ئەگەر تێكرای راستیەكان، راستەقینە بوون، مرۆڤ بوونەوەرێكی عەقڵ گەرا لە قەڵەم دەدرا. چوونكە فیكری عەقڵ گەرای ئەو لە لۆژیك پەیرەوی دەكرد. بەڵام بەشێكی گەورەی ئەوئەزموونەی لە ناخدا كەڵەكە دەبێت ناوشیارانەیە، لەم روەوە لە رێگەی لۆژیك، عەقڵوئیرادەوە كۆنترۆڵ ناكرێت. دژە عەقڵی مرۆڤ بەسەر نەستدا زاڵەوعەقڵگەرایی لە سەرهەست. دیسان نەست رێبەری هەستە ( وئەمە بابەتێكی سەلمێندراوە ) لەم ڕوەوە رێبەرایەتی هەڵسوكەوتی مرۆڤیش دەكات. ئەم تیۆرییەی كە مرۆڤ لە رێگەی نەستەوە بە رێوەدەچێت، فرۆید بە بێ ئەوە بزانێت تێزێك دوپات دەكاتەوە كە پێشتر سپینوزا بەیانی كردوە ، بەم جیاوازییە كە سپینوزا وەك لاوەكی سەیری دەكات بەڵام فرۆید وەك سەرەكی.

فرۆید ئەم ناكۆكییەی بە شێوەیەكی نادینامیك كە زاڵ بوون بۆ لایەنێك بێت چارەسەر نەكرد. ئەگەر تاكی وەك سەركەوتوو و زاڵ ڕادەگەیاند، وەك فەیلەسوفێكی چەرخی عەقڵ لە قەڵەم دەدرا و ئەگەر ڕۆڵی سەركەوتوو و زاڵی بە دژە عەقڵی دەدا، وەك گەلێك لە بیرمەندەكانی سەدەی نۆزدەیەم دەبووە پاوانخوازێكی ڕۆمانتیك.

هەرچەند کە هێزە دژەعەقڵەکان وروژێنەری مرۆڤن- لیبیدۆ وبە تایبەت "خۆ" لە قۆناغی گۆڕانکاری سەردەمی بەر لە پێگەیشتن- بەڵام عەقڵ وئیرادەی مرۆڤیش لاواز نییە. هێزی عەقڵ لەمەدایە کە مرۆڤ لە دژە عەقڵ بوونی خۆی ئاگادار دەکاتەوە. فرۆید" زانستی دژە عەقڵ بوونی مرۆڤی"( **تیوری دەروونشیکاری**) دامەزاند. بۆ ئەوەی کە مرۆڤ لە پرۆسەی شرۆڤە کردندا دەتوانێ ناوشیاری خۆی بکاتە وشیاری، کەواتە دەتوانێ خۆی لە بن دەسەڵاتی هەوڵدانە نا وشیارەکان ڕزگار بکات ولە باتی سەرکوتکردن، نکۆڵیان لێ بکات، واتە هێزەکان لاواز بکات بیخاتە بن کونتڕۆڵی ئیرادەی عەقڵەوە. فرۆید ئەم کارە بە گونجاو دەزانێ، چوونکە کەسێکی پێگەیشتو خاوەن "خۆ" یەکی بە هێزترە لە منداڵ وەك هاوڕێ وهاوپەیمان. دەروونشیکاری چارەسەری فرۆیدلە سەر ئەم هیوایە دامەزراوەکە دەتوانێ بە سەر توندوتیژییە ناوشیارەکاندا، کە بۆ ئەوەی لە تاریکیدا کار دەکەن لەم رووەوە لە دەرەوەی کۆنتڕۆڵی مرۆڤن، سەرکەوێت و یاخود لانی کەم سنووردداریان بکاتەوە. لە لایەنی مێژوییەوە دەتوانین تیوری فرۆید بە سەنتێزی عەقڵ گەرایی رۆمانتیزم لە قەڵەم بدەین. هێزی داهێنەری ئەم سەنتێزە یەکێك لە لایەنەکانی دزە وزاڵ بوونی ئەندێشەی فرۆیدە لە سەدەی بیستەمدا، نەك دۆزینەوەی شێوازی چارەسەری نوێ بۆ خەمۆکی دەروونی ویا خود بەرگری کردنی لە ئارەزۆ جنسییە سەرکوتکراوەکان. بە گوێرەی بەڵگەکانی بەردەستمان گرنگترین هۆکاری کاریگەری فرۆید لە کەلتووردا ئەم سەنتێزەیە کە بەرهەمەکەی هەڵگەڕانەوەی ئادلر ویونگ لە ئەو بوو. ئەو دوو کەسە سەنتێزەکەی فرۆیدیان رەد کردەوە وبوونە

دوو دژبەری سەرەكی ئەو. ئادلر لەو بڕوایەدا بوو كە نەبوونی توانای زاتی مەرجی هێزە وبە تێگەیشتنی وشیارانە لە بارودۆخەكە، مرۆڤ دەتوانێ خۆی رزگار بكات وكارەساتێكی گەورە لە ناو بەرێت.

لە لایەكی ترەوە یونگ كەسێكی رۆمانتیك بوو كە تێكڕای هێزی لە نەستدا دەدیت. ئەو لە فرۆید زیاتر بڕوای بە سەمبول وئەفسانە ومەعنەویەت هەبوو، بەڵام تیۆرییەكەی فرۆید بە تیۆری سكسی سنووردار دەبووەوە. ئامانجەكانی ئەم دوو بیرمەندە دژ بە یەك بوون، فرۆید هەوڵی دەدا لە نەست تێبگات تا لاواز وكۆنترۆڵی بكات، بەڵام یونگ لەو ناخە ورووژاندنێكی زیاتری دەویست. سرنج دانیان بە نەست بوە هۆی ئەوەی ماوەیەك ببنە هاوپەیمان، بە بێ ئەوەی بزانن بە دوو ئاراستەی جیاوازدا هەنگاو دەنێن. لەو ڕێگایەدا كە گرتبویانە بەر راوەستان تا سەبارەت بە نەست قسە بكەن، بە هەڵە وایاندەزانی كە ئاراستە وئامانجەكانیان وەك یەكە.

تێگەیشتنی فرۆید لە هەربوونایەتی رووناكبیری[1](الحتمية الثقافية) ونەمانی هەربوونیەتی[2](انعدام الحتمية) و ئیرادە پەیوەندییەكی نزیكی لە گەڵ سەنتێزی عەقڵ گەری ودژە عەقڵی ئەودا هەیە. فرۆید خۆی كەسێكی هەربوونگەرا بوو و لەو بڕوایەدا بوو كە مرۆڤ ئازاد نییە، چوونكە گیرۆدەی نەست وزات ومنی بالایە. بەڵام –ئەم ( بەلامە ) بۆ فرۆید گرنگییەكی لە ڕادە بە دەری هەیە– مرۆڤ بە تەواوەتی دیل

---

[1] . Determinism

[2] . Indeterminism

وبەندکراویش نییە. وبە یارمەتی شێوازی شی کردنەوەیە دەتوانێ ئەست کونترۆڵ بکات. فرۆید بەم ڕوانگەیەوە کە لە تیوریییەکانی سپینوزا ومارکسەوە نزیکە، توانی سەنتێزێکی سودبەخشی دیکە بۆ دوو جەمسەری دژ بە یەك بخاتە روو.

ئایا فرۆید هۆکاری ئاکاری وەك بەشێکی بنەڕەتی مرۆڤی مۆدێلی خۆی لە قەڵەم دەدا؟ وڵامی ئەم پرسیارە نەیە. گەشە وکامڵبوونی مرۆڤ بە تایبەت لە بن کاریگەری قازانجی تایبەتیدایە وقازانجی تایبەتی خوازیاری دامرکاندنی تەواو وهەرەباشی خواستە لیبیدۆییەکانە، بەو مەرجەی ئەم ئەنگێزە وخواستانە پاراستنی زات نەخەنە بن مەترسییەوە ( بنەچەی راستی). پرسی ئاکار کە لە لایەنی نەریتییەوە هەمان ناکۆکی نێوان " ئەویترخوازی"[1] و" خۆخوازی"[2] یە لەناو چووە. خۆگەرایی تەنها هێزی وروژێنەرە، وجیاوازی تەنها لە شێوەکاندایە: لیبیدۆیی ومادی. مرۆڤی خۆ خوازی فرۆید شوێن کەوتووی فیکرەکانی بورژوازییە- بەڵام ئەم تیورییە کە فرۆید نکوڵی لە ویژدان دەکات وەك توخمێکی لێهاتووی سروشتی مرۆڤی مودێلی خۆی لێدەکات، راست نییە. ئەو دان بە هێزی ویژداندا دەنێت، بەڵام لە پێناسەکردنیدا تێکڕای بەها بابەتییەکانی لێ زەوت دەکات. بە گوێرەی پێناسەکەی ئەو ویژدان هەمان" منی باڵایە" کە بریتییە لە کاریگەری فەرمانەکانی( بکە ومەکە)ی باوك( یا منی باڵای باوك) لە سەر منداڵ، کوڕ لە سەردەمی منداڵی تووشی نیگەرانی خەساندن

---

[1]. Altruism

[2]. Egoism

دەبێـت" بـە سـەر نیـازە "ئودیپییـە"کـانی خـۆیدا زاڵ دەبێـت ولـەم ڕێگەیـەوە خـۆی دەنوێنێـت. ئـەم پێناسـە کردنـە ئامـاژە بـە هـەردو توخمەکەی ویژدان دەکات : بە توخمی شێوەیی[1]– چۆنییەتی دروست بوونی ویـژدان، وبـە تـوخمی جەوهـەری، کـە سـەرقاڵی ناواخنی ویـژدان دەبێت. بۆ ئەوەی بەشی سەرەکی نەریتەکانی باوك‌ومنی باڵای باوك لـە لایـەنی کۆمەڵایەتییـەوە شـەرتی بـووە، ویـان بـەدەربڕینێکی باشـتر بۆئـەوەی منـی باڵاجگـە لـە تێگەیشـتنی شەخسـی لـە نەریتـە کۆمەڵایەتییەکان شتێکی تر نییە، لەمڕووەوە پێناسەکەی فرۆید دەبێتە هـۆی ئـەوەی کـە تێکڕای نەریتـە ئاکارییـەکان ڕێـژەیی بن. هەرنـەریتێك تایبەتمەندییـەکی خـۆی هەیـە، ئـەم پێناسـەیە پەیوەنـدی بـە بـەهای ناوەڕۆکـەوە نییـە، بەڵکولـە سـەر بنـەمای میکـانیزمی دەروونییەکـە پەسەند کراوە. ئەگەر "سەرچاوەی دەسەڵاتی نـاوەکی بوو"[2]، فەرمانی پێـدەدات باشـە و ئەگـەر ئـەو سەرچـاوەیە ولامـی نیگـەتیڤی بۆبداتەوە( نهی بکات)خراپە. تا کاتێك کە زۆربەی خەڵك لەم بڕوایەدا بن کـە ئاکـار، لـە پێـوانی بـەر بـەلاودا، جگـە لـەو نەریتانـە کـە لـە لایـەن کۆمـەڵگاوە بـە مەبەسـتی کـاری گونجـاوو بـاش ئـەو کۆمەڵگایـە دادە ڕێـژێت هیچـێکی تـر نییـە، بێگومـان تیۆرییەکـەی فرۆیـد راسـتە. لـە ڕوانگەی تیوریکەوە ئەو ڕەخنەیەکی گرنگ لە ئاکاری باوی هەنووکـەیی دەگرێت، وتیوری منی باڵای فرۆید تایبەتمەندە راستەقینەکەی ئاشکرا دەکات. بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە فرۆید نەیویستبێت لایەنی ڕەخنـە

---

[1]. Formal

[2]. Internalized authority

گرانەی تیۆرییەکەی خۆی بخاتەروو، وڕەنگە هەر بەم بۆنەیەشەوە خۆی نەیویستبێت لایەنی ڕەخنەگرانە بە تیۆرییەکەی بدات وبەدژواری دەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات. چوونکە بایەخێکی ئەوتۆی بەم پرسیارە نەدەدا کە ئایا ئەو نەریتانە بوونیان هەیە کە ناوەڕۆکی ئەوانە لە بونیادی کۆمەڵگای سەردەمی ئەوپێشکەوتوتر وزیاتر لە داخوازییەکانی سروشتی ویاساکانی گەشەی مرۆڤ بێت؟

بەبێ ئەوەی سەبارەت بە دوو بابەتی تایبەت، واتە ژنوپیاو ومنداڵ قسە بکەیت ناتوانی سەبارەت بە مرۆڤ ناسی فرۆید بدوێت.

لە ڕوانگەی فرۆیدەوە تەنها ڕەگەزی نێر تەواوە. ژن، پیاوێکی ئیفلیج بوو وخەسێنراوە کە لە چارە نووسی خۆی ئازار دەبینێت وتەنها کاتێك هەست بە خۆشحاڵی ورازی بوون دەکات کە بە مێردکردن ومنداڵبون بە سەر"گرێی خەسێنراوی" خۆیدا سەردەکەوێت. بەلام لە لایەنەکانی دیکەوە بچوك دەمێنێتەوە._ بۆ نمونە لە پیاو زیاتر لە خۆی حەز دەکات وکەمتر لە پیاوی فەرمانەکانی ویژدان جێبەجێ دکات. ئەم تیۆرییە سەرسورهێنەرە، واتە نیوەی مرۆڤایەتی ئیفلج بووی نیوەکەی دیکەیە، سەردەمی ڤیکتوریا بە بیر دەهێنێتەوە کە تێدا، ئارەزۆی ژنان تەنها زاوزێ وگەورەکردنی منداڵ وخزمەت بە مێرد بوو. فرۆید بە دەربڕینی ئەمە کە "لیبیدۆنێرە" شەفافییەتێکی زیاتری بە تیوریەکەی بەخشی. ئەم بڕوا باوەی سەردەمی ڤیکتوریا کە ژن خاوەنی ئارەزۆو هەستی جنسی تایبەتی نییە، وسف کردنێکی زێدەڕەوانە لە پیاو

سالاری وبالآبوونی سروشتی پیاو بوو[1]. لە ئایدۆلۆژیای پیاو سالاریدا ڕەگەزی نێر عەقڵگەراتر و ریالیستتر لە ڕەگەزی مێ یە، لەم رووەوە سروشت، پیاوی وەك رێبەری ژن داناوە. پەرچەکرداری فرۆید لە هەمبەر یەکسانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ژنان لە لایەن جیمز ستوارت میل، بیرمەندی خاوەن رێز لە لای فرۆید، بەم بۆچوونەوە دەکەوێتە روو. لەم رووەوە ستوارت میل بە شێت لە قەڵەم دراوە، لە ڕوانگەی فرۆیدەوە پەسەند نییە کە بووکە خۆشەویستەکەی لە باتی ئەوەی پشتیوانی لێبکات لە بازاڕدا دەستەو یەخەی بوەستێت.

دەمار گرژی فرۆید سەبارەت بە باوکسالاری دوو کاریگەری گرنگی دیکەشی لە سەر تیورییەکەی داناوە. یەکەم ئەوەی نەیدەتوانی لە چییەتی سۆزی خوشەویستی بگات، چوونکە لە سەر دوو بنەڕەتی نێر ومێ دامەزراوە وتەنها کاتێك پراکتیزە دەبێت کە ژن وپیاو بە

---

[1] .تێگشتنی تەواوەتی لە ئایدولۆژای پیاو سالاری پێویستی بە باسێکی تێر وتەسەل هەیە. هەر ئەوە بەسە کە بڵێن، ژنان چینێکن کە لە تێکڕای کۆمەڵگا پیاوسالارییەکاندا لە بن دەسەڵات وزوڵمی پیاوان دان. رەگەزی نێر وەك هەر گروپێکی زاڵی دیکە، دەبێ هەندێك یاسا دابرێژێت، تا دەسەڵاتەکەی سروشتی، پێویست وپاسادراو لە قەڵەم بدرێت. ژنان وەك چینێکی مەحکوم، ئایدولۆژیای رەگەزی نێریان قەبووڵ نەکردوە، هەرچەندەکە لە ناخی خۆیاندا خاوەن فیکریجیاوازو تایبەت بە خۆن. لەوە دەچێت کە ئازادی ژنان لە سەدەی بیستەمەوە دەستی پێکردوە وهاوتەریب لەگەڵ ئەمە، سیستەمی پیاوسالاری لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا بەرچاو دەکەوێت، هەرچەندە کە یەکسانی تەواوی ژن وپیاو لە هیچ وڵاتێکی دونیادا بوونی نییە. بنەمای شرۆڤە ولێکدانەوەی کۆمەڵگە پیاوسالارەکان لە نوسراوەکانی باخ ئۆفن لە ١٨٥٩دا ئاماژەی پێکراوە. بە بێ شارەزا بوون لە بەرهەمەکانی ئەو تێگەیشتن لەم پرسە مومکین نییە.

تەواوەتی یەکسان بن هەر چەند لێك جیاوازیشن. لەم رووەوە تێکڕای سیستەمی فرۆید بەدەوری تەوەری ئارەزووی جنسیدا دەسورێتەوە، نەك سۆزی خۆشەویستی. تەنانەت لە تیورییەکەی دیکەی خۆشیدا بڕوای بەوە هەیە غەریزەی ژیان تەنها لە هەڵس وکەوتی ئورگانیزمە زیندووەکاندا بوونی هەیە، بەڵام تا ڕەهەندی مێ _ نێرپەڕە پێنەدات وغەریزەی ژیان وئارەزووی جنسی بە یەکسان وهاوسەنگی یەك دەزانی . کاریگەریەکەی دیکە ئەمەیە کە لە زۆربەی تەمەنی خۆیدا گرێدراویی سەرەتایی منداڵ (کوڕیان کچ ) بەدایك وهەر وەها چییەتی سۆزی دایکانە وترس لە دایکی لە بەرچاو نە گرتبو. لە سەردەمێکدا کە کوڕ بوەتە میرمنداڵێك دەتوانێ بڵێی گرێدراوی بە دایك لە گرێی‌ئودیپەوە سەرچاوە دەگرێت . لە ڕوانگەی ئەم "پیاوە بچوکەوە"( وەك باوکی) دایك ئامرازی دامرکاندنی ئارەزۆ جنسیەکانە وئەو تەنها لە باوکی دەترسێ نەك لە دایکی. فرۆید تەنها لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی خۆیدا پەی بەم گرێدراوییە توندە سەرەتاییە برد بەڵام قەت پەیی بەگرنگییەکەی نەبرد.[1] وادیارە سەرەڕای سەرکوت بوونی گرێدراوی توندی فرۆید بە دایکی، دەمارگیری پیاوسالارانەی ڕێگەی نەدەدا کە ژنیش وەك کەسێکی بەهێز لە قەڵەم بدات کە منداڵ پێی گرێدراوە.[2] تێکڕای دەروون شیکارەکان تیورییەکانی‌دیکەی فرۆید

---

[1] سەیری نوسراوە پڕبایەخەکەی John Bowlby بکەن کە لە بن ناوی "چییەتی گرێدراوی‌منداڵ (کوڕ) بە دایك" لە ژمارەی ٣٤ی ساڵی ١٩٥٨دا لە گۆڤاری International Journal Of Psycho – Analysis بەڵاو کراوەتەوە.

[2] هەر بەم بۆنەیەوە فرۆید بایەخ بە نوسراوەکانی باخ سەبارەت بە "مافی دایك" نادات، هەرچەند لە چەند نموونە یەکیدا ئاماژەی پێکردوە.

سەبارەت بەکاری جنسی ورۆلی دوهەمی دایك سەرەڕای هەبوونی بەڵگەی دژ، قەبووڵ دەکەن .

لێرەشدا، وەك نمونەکانی دیکە، ئاماژە بە پەیوەندی تیوری لە گەڵ هۆکارو پێداویستییە کۆمەلایەتییەکان، هەڵە بوونی تیۆرییەکە ناسەلمێنێت، بەلام ئەگەر بەڵگە کلینیکییەکان بەوردبینیەوە لێك بدرێنەوە تیوری فرۆید رەت دەکرێتەوە . من ناتوانم لەم بارەیەوە بدویم، کۆمەڵێك لە دەروون شیکارەکان، بەتایبەت "کارن هۆرنای" هەندێك شتی کلینیکییان خستوەتە روو کە لە گەڵ تیورییەکەی فرۆیدا دژ بەیەکن.[1] بە گشتی دەتوانین بڵێین کە تیوری فرۆید لەم بارەیەوە، هەرچەند بە هۆی لۆژیکی تایبەت بە خۆ هەمیشە خۆش وهەست بزوێنە، بەلام کەمترین راستی تێدایە، ڕەنگە بەم هۆیە بێت کە فرۆید لە دەمارگرژی پیاوسالارانە لێوانلێو ببوو.

ئەم وێنەیە کە فرۆید لە منداڵ دەیخاتە روو بە تەواوەتی لە گەڵ وێنە نەریتییەکاندا جیاوازە. منداڵیش وەك ژن بە درێژایی مێژوو رووبەرووی زوڵم وسەرکوتکردنی باوك بوەتەوە. ئەویش وەك کۆیلە ووەك دایك موڵکی پیاو- باوك بوو. ئەو کەسەی کە ژیانی پێبەخشیوە دەتوانێ وەك سامانی خۆی هەر کارێکی لە گەڵ ئەنجام بدات. ( ڕێورەسمی قوربانی کردنی منداڵ لە سەردەمێکدا لە زۆربەی جیهاندا باو بووە، یەکێك لە بەڵگەکانی ئەم لافە موڵکدارییەتییە لە قەڵەم دەدرێت).

---

[1] سەیری نوسینەکەی Ashly Montagu بکەن.

منداڵ تەنانەت کەمتر لە کویلە وژنیش توانای خۆ پاراستنی هەیە. ژنان بە شێوازی تایبەت بە خۆیان هەمیشە لە گەڵ پیاوسالاری‌دا شەڕێکی پارتیزانییان هەبووە، کۆیلە کان چەندین جار شۆڕشیان کردوە. بەلام بەدرەوشتی، تۆران ونان نەخواردن، قەبزبوون ومیز بە خۆداکردن ئەو ئامرازانە نین کە بتوانی سیستەمێکی بە هێزی پێ بڕوخێنیت. تەنها دەرئەنجام ئەمە بووە کە منداڵ لە کاتی گەورەییدا، کەسێکی بێ چارە، سەرکوتکراو تەنانەت شەڕەنگێزی لێ دەردەچێت، کە تۆڵەی ئەوەی بە سەریدا هاتووە لە منداڵەکانی خۆی دەیکاتەوە.

زاڵ بوون بە سەر منداڵدا، هەرچەندە بە توند وتیژی وگوشاری جەستەیش نەبێت، بە دادۆشینی دەروونی ئەنجام دراوە. گەورەکان وا چاوەڕوان دەکەن کە منداڵ هەستی خۆ بە زل زانی ولە خۆبایی بوونی ئەوان دابمرکێنن وگوێڕایەڵیان بن وبە گوێرەی خواستی ئەوان هەڵس وکەوت بکەن. لەوەش گرنگتر گەورەکان منداڵان بە هەند وەرناگرن ولەو بڕوایەدان کە منداڵ خاوەن دونیای دەروونی تایبەت بە خۆی نییە، وەك پەڕە کاغەزێکی سپی سەیری منداڵ دەکەن کە گەورەکان مافی ئەوەیان هەیە( ئەرکیان ئەوەیە) شتی پێویست لە سەری بنوسن. ولەم رووەوە دەگەنە ئەو ئەنجامە کە دەتوانن لە گەڵ منداڵدا درۆ بکەن. ئەگەر کەسێك لە گەڵ کەسێکی پێگەیشتودا درۆ بکات دەبێ بە شێوەیەك پاساوی بدات، بەلام درۆ کردن لە گەڵ منداڵدا پێویستی بە پاساودان نییە، چوونکە منداڵ مرۆڤێکی تەواو نییە. هەر ئەم بنەمایە سەبارەت بە کەسانی پێگەیشتوی بێگانە، دوژمن، نەخۆش وتاوانبارویا خود کەسانی چین ورەگەزی نزم ودادۆشراویش بە کار

دێت. بە گشتی تەنها ئەوانەی کە لاواز نین دەتوانن داوای راستی بکەن، ئەم بنەمایە کە بە درێژایی مێژوو لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا بە کار هاتووە، هەرچەند کە ئایدۆلۆژیای وشیارانەی کۆمەڵگاکەیانیش نەبووە.

**شۆڕشی منداڵ**، وەك شۆڕشی ژن، لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی پێکردوە. خەڵك بۆیان دەرکەوت کە منداڵ وەك پەڕە کاغەزێکی سپی نییە، بەڵکوو بوونەوەرێکی تەواو، وردبین، بیرکەرەوەو هەستیارە وپێویستی بە وروژاندن هەیە. یەکێك لە نیشانەکانی ئەم تێگەیشتنە تازەیە، سەبارەت بە پەروەردە، شێوازی مونتسوری[1] وئەوی تریشیان تیورییە زۆر کاریگەرەکەی فرۆید بوو. فرۆید قسەکانی خۆی بە بەڵگەی کلینیکییەوە دەسەلماند، کە کاریگەری خراپ لە سەردەمی منداڵیدا لە قۆناغەکانی کامڵبوونی داهاتوودا دەرئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە. فرۆید پرۆسەی سەرسوڕهێنەر وئاڵۆزی زەینی وسۆزدارییەکانی لە منداڵدا شرۆڤە کرد، بە تایبەت لە سەر ئەم ڕاستییە پێداگری کرد(کە بە تەواوەتی نکۆڵی لێدەکرا ) کە منداڵ بوونەوەرێکی پڕخرۆش وخرۆش، خاوەن وروژێنەر وئارەزۆ وچێژی جنسییە ولەم رێگەیەوە بە ژیانی خۆی چۆنایەتییەکی دراماتیك دەبەخشێت.

فرۆید لە تێگەیشتنە ڕادیکاڵە نوێکەی خۆی، لە منداڵ، لەوەش زیاتر رۆیشت. چوونکە لە سەرەتای کاری کلینیکی دا بینی کە

---

[1] Naria Montessori (١٨٧٠-١٩٥٢) مامۆستای خەڵی ئیتالیا ئەم شێوازەی بۆ پەروەردەی منداڵان دارێژاوە. . و.

سەرچاوەی زۆربەی خەمۆکییە دەروونییەکان، هەڵخەڵەتاندنی جنسی منداڵە کە لە لایەن گەورەکانە بە تایبەت دایك وباوکەوە ئەنجام دەدرێت. دوای ئەم دۆزینەوەیە، ئەو دایك وباوکی بە دادۆشینی (ئازادی ویەکبوون ) تاوانبار کرد. بەڵام ئەگەر سرنج بدەینە بێ بنەما بوونی سیستەمی باوکسالاری زاڵمانەی فرۆید، لە چاو پۆشی کردنی ئەو لە هەڵوێستە رادیکاڵەکانی داهاتووی سەرمان سوڕ نامێنێت. ئەو بۆی دەرکەوت کە نەخۆشەکانی لە هەندێك نموونەدا خواست وئارەزۆکانی سەردەمی منداڵی خۆ لە دایك وباوکەوە دەزانن، نە ئەوەی کە لە لایەن ئەوانەوە هەڵخەڵەتێنرابن. فرۆید ئەم بابەتەی پەرە پێدا وگەیشت بەو ئەنجامەی کە، بە گوێرەی تیوری لیبیدۆ، منداڵ تاوانبار وبەلارێدا چووێکی بچوکە کە تەنها لە ئەنجامی گۆڕانکاری وکامڵ بوونی لیبیدۆ قۆناغی پێگەیشتنی مرۆڤێکی (تەواو) دەبڕێت. لە ئەنجامدا وێنەیەکی(منداڵی تاوانباری ) بە دەست هێنا، کە بە وتەی هەندێك لە چاودێران، لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانیدا لەو وێنەیە دەچێت کە لە قوتابخانەی ئاگوستین لە منداڵ کێشابوویان.

دوای ئەم گۆڕانکارییە ئەم دروشمە بەرزکرایەوە:"منداڵ تاوانبارە". وروژێنەکانی بەرەوە دەستدرێژی کردنی رادەکێشن، ئەم دەستدرێژی کردنانە، ئەگەر بە تەواوەتی چارەسەر نەکرێن، نەخۆشی وخەمۆکی دەروونی لێدەکەوێتەوە. لە ڕوانگەی منەوە هۆکاری ئەم گۆڕانکارییە لە بۆچوونی فرۆیددا، دۆزینەوە کلینیکییەکان نەبوون، بەڵکو بیر وبڕوای ئەو سەبارەت بە دیسپلینی کۆمەڵایەتی هەنووکەیی وسەرچاوەکانی هێزی ئەو دیسپلینە بوو. من بۆ ئەم بۆچوونە چەند

بەڵگەم هەیە، یەکەم شێوازی ڕەهای فرۆیدە کە رایگەیاند تێکڕای بیرەوەرییە هەڵخەڵەتاندنییەکانی منداڵ لە لایەن باوك ودایکەوە تەنها وەهم وخەیاڵە. ئایا ئەم گوتە جیدی ورەهایە دژایەتی ئەم راستییە ناکات کە ئارەزۆی جنسی دایك وباوك سەبارەت بە منداڵەکەیان کەم نییە؟ هۆکارێکی دیکەی لایەنگری فرۆید لە دایك وباوك لە هەڵسوکەوتی کەسایەتی دایك ئاسا وباوك ئاساکە دەبێ لە مێژووەداپەیدا بکرێت کە فرۆید نوسیویەتی. جێگەی سەرسوڕمانە کە فرۆید وێنەیەکەی درۆینەی لە دایك وباوك بە دەستەوە داوە وهەندێك چۆنایەتییان پێوە دەبەستێتەوە کە بە گشتی دژی ئەو راستییانەیە کە خۆی خستونیەتە روو. هەروەها کە هەوڵمداوە لە چیرۆکی "هانسی بچکۆلە"دا ئامارژەی پێبکەم، بەڵام فرۆید نکوڵی لە هەڕەشەی دایك وباوکی هانس کە بە تەواوەتی حەزیان لە ئاسایشی منداڵەکەی خۆیانە، دەکات، بەڵام هەڵخەڵەتاندن وهەڕەشە بە رادەیەك روون وئاشکرایە کە دەبێ چاوی خۆمان بنوقێنین تا نەیبینین. ئەم نموونەیە لە سەربوردەکانی دیکەدا کە بە قەڵەمی فرۆید نوسراوە، بەر چاو دەکەوێت.

ڕاڤە و شرۆڤە کردنی چۆنییەتی گۆڕانکاری شێوازی فرۆید لە لایەنگری لە منداڵ بۆ بەرگری کردن لە دایك وباوك بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ لە لایەن" فرنجییەوە" کە یەکێك لە خۆشەویستترین لایەنگرانی فرۆیدە پشتیوانی لێدەکرێت. فرنجی لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی خۆیدا، لە حاڵێکدا کە قەت وەفاداری خۆی بۆ فرۆید لە دەست

نەدا، ناكۆكی توند لە نێوان ئەو وماموٚستاكەیدا دەركەوت[١]. فرنجی بیروبڕوایەكی بە دەست هێنابوو كە لە دوو خاڵی گرنگدا لە گەڵ فیكرەكانی فرۆید ناكۆك بوو، فرۆید لەم ناكۆكییە بە شێوەیەك توڕە بوو كە لە دوایین دیداریاندا دەستی فرنجی نەگوشی[٢]. یەكێك لەو لادانانەی كە لێرەدا بایەخی پێنادرێت ئاماژە بەم خاڵەیە كە نەخۆش بۆ چارەسەركردنی خۆی تەنها پێویستی بە لێكدانەوە نییە، بەڵكو لەم پەیوەندییەدا حەز وبایەخی دەروونشیكاری ڕۆڵێكی گرنگ دەگێڕێت ( مەبەست لە حەز ، خۆشەویستی ناجنسییە). گرنگترین لادان لەم مەبەستەی ئێمە ئەم تیۆرییەی فرنجییە كە فرۆید لە تیوری یەكەم وسەرەكی خۆیدا لە سەر حەق بوو، بەم واتایە كە لە زۆربەی نمونەكاندا گەورەكان منداڵ هەڵدەخڵەتێنن وبە لارێیدا دەبن، وهۆكارەكانی فریودانی منداڵان هەمیشە ئەو وەهمانە نییە كە لە زەینی منداڵدا ریشەی دا كوتاوە.

جگە لە گرنگی ئەزموونەكانی فرنجی، دەبێ ئەم پرسیارە بخەینە روو: كە بۆچی پەرچەكرداری فرۆید بەم شێوەیە توند ودوژمنكارانە بوو؟ ئایا بابەتی گرنگتر لە پرسی كلینیكی لە ئارادا بوو؟دەتوانن دڵنیا بن كە خاڵی سەرەكی گرێدراوی راست بوونی تیوری كلینیكی نەبوو، بەڵكولە هەڵس وكەوتی و حەز وخواست سەبارەت بە سەرچاوەی دەسەلات بوو. ئەگەر ئەم پرسە راست بێت كە فرۆید لە ڕەخنەی

---

[١] لێكدانەوی ئەم ناكۆكییە لە كتێبی " پەیامی زیگموند فرۆید" لە نوسینی ئەریك فرۆمدا هاتووە.

[٢] لە نامە تایبەتییەكانی خانمی Izzetede forest هاوڕێ وقوتابی فرنجی

ڕادیکاڵی یەکەمجاری خۆی لە دایك وباوك پەشیمان بووبێتەوە- واتە لە سەرچاوەی هێزی کۆمەڵایەتی - وبووبێتەوە " لایەنگری سەرچاوەی هێزی تاك، کە واتە دەتوانین بەم شێوەیە لێکی بدەینەوە کە پەرچەکردارەکەی ئەو لە تێگەیشتنی دوولایەنە سەبارەت بە سەرچاوەی هێزی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوە دەگرێت، وبۆ ئەوەی فرنجی ئەو بابەتەی کە فرۆید وازی لێهێنابوو، بە بیری هێنایەوە پەرچەکردارێکی توندی نیشاندا، وەك ئەوەی کە بڵێی ئەو کارەی ئەو "خەیانەت" بووە بە منداڵ.

ئەنجام وەرگرتن لە خەیاڵی فرۆید سەبارەت بە مرۆڤ ، پێویستی بە شرۆڤە کردنێك هەیە لە مەبەستی ئەو لە مێژوو. فرۆید ناوەندی سەرەکی فەلسەفەی کامڵ کرد، هەرچەندە کە نەیدەویست بە شێوەیەکی سیستەماتیکی بیخاتە روو. لە سەرەتای مێژوودا، چاومان بە مرۆڤێکی بێ کەلتوور دەکەوێت کە تەنها لە دامرکاندنی خواستە غەریزییەکانی دەگەڕێت وکە ئەم مەبەستەی بە دەست هێنا رازی دەبێت، بەڵام ئەو وێنەیە لە مرۆڤ پێچەوانەی ئەو وێنەیە کە تەنانەت لە گەڵ قۆناغی سەرەتای رازی بوونی غەریزیشدا ناکۆکە. مرۆڤ دەبێ ئەم بەهەشتە بە جێ بهێڵێت، چونکە دامرکاندنی لە رادە بە دەری خواست وئارەزۆکان ناکۆکی نێوان باوك وکوڕ، کوشتنی باوك بە ناچاری خۆشەویستی حەرامی لێدەکەوێتەوە. کوڕانی یاخی لە شەڕێکدا سەردەکەون، بەڵام شەڕ لە هەمبەر باوك دەدۆڕێنن، چوونکە ماف وپوانی تایبەتی ئەمانە لە ڕێگەی " ئاکار" ودیسپلینی کۆمەڵایەتییەوە

بـۆ هەمیشـە گـەرەنتی کـراوە.( لێرەشـدا رووبـەڕوی دوولایەنـە بـوونی بۆچوونی فرۆید سەبارەت بە سەرچاوەکانی دەسەلات دەبینەوە ).

بـۆ ئـەوەی لـەم لایەنـەوە لـە ڕوانگـەی فرۆیـدەوە دامرکانـدنی لـە رادەبـەدەری غـەریزە لـە درێژخایەنـدا مـومکین نابێـت، چـوونکە ئـەو تیۆرییەکی دیکەی دارشت کە بە تەواوەتی لە گەڵ تیۆرییەکەی پێشودا جیاواز بوو: دەرفەتی گەیشتن بەو دونیا بەهەشتییە نکۆڵی لێنەکرابوو، بـەلأم دەگـوترا مـادام مـرۆڤ لـەم بەهەشـتە دایـە ناتوانـێ کـەلتوورێك بخولقێنێت. لە ڕوانگەی فرۆیدەوە یەکێك لە هەل ومەرجەکانی کەلتوور دانەمرکانـدنی وروژێنـەرە غەریزییەکانـە، لـەم رووەوە مـرۆڤ رووبـەڕوی دوو هەڵومـەرجی دژبەیـەك دەبێتـەوە: دامرکانـدنی تـەواوەتی غـەریزە- وەحشـی گـەری- یـان تەحـەمول کردنـی بـێ بـەش بـوون لـە هەنـدێك غـەریزە، لـە گـەڵ پەرپێـدان وکـامڵبوونی فەرهـەنگی وزەینـی. بـەلأم چەندین جار پرۆسەی بالأ بوون رووبەڕوی شکست دەبێتەوە. ومرۆڤ دەبێ نرخی کامڵبوونی فەرهەنگی خۆی بە خەمۆکی دەروونـی بداتـەوە. دەبـێ جـەخت لـە سـەر ئـەوە بکەینـەوە کـە لـە ڕوانگـەی فرۆیـدوە ئـەو ناکۆکییەی کە لە نێوان وروژێنەرەکان وشارستانیدا بوونی هەیە. بە هیچ شێوەیەك لە گەڵ ناکۆکی نێوان وروژێنەرەکان وسەرمایەداری یان هەر جۆرە بونیادێکی کۆمەلأیەتی سەرکوتکەر، یەکێك نین[1].

---

[1] هربرت مارکوزە کە فرۆید وەك بیرمەندێکی شۆڕشگەر پێناسـەی دەکات هـەوڵی داوە دامرکانـدنی تـەواوەتی وروژێنـەرەکان لـە کۆمەڵگەیـەکی ئـازاددا، لـە هەمبـەر کۆمـەڵگای سەرکوتکەر، نیشان بدات. بە بێ سرنج دان بە بایەخی کارەکەی دەبێ بزانینکە مارکۆزە بەشی هەرە زۆری سیستەمی فرۆیدی رەت کردوەتەوە.

فرۆید لایەنگری فەرهەنگە نەك بەهەشتی سەرەتایی ودواکەوتوو، هەرچەند کە مەبەستی ئەو لە مێژوو توخمێکی خەم هێنەرە. پێشکەوتنی مرۆڤ بە ناچاری سەرکوتکردنی وروژێنەرەکان و خەمۆکی دەروونی لێدەکەوێتەوە. مرۆڤ ناتوانێ هاوکات چێژ وەربگرێت وپێشکەوتنیش دەستەبەر بکات. بەڵام سەرەڕای ئەم توخمەخەمهێنەرە فرۆید وەك بیرمەندێکی ڕووناکگەر دەمێنێتەوە، هەرچەند کە شەکاکە(گومانگەر)، بەڵام لە ڕوانگەی ئەوەوەپێشکەوتن ئیدی خێر وبێر نییە. فرۆید لە قۆناغی دوهەمی کاری خۆیدا، دوای شەڕی جیهانی یەکەم، بیرکردنەوەیەکی کارەسات باری لە مێژوو هەیە. پێشکەوتن، ئیدی بە نرخێکی گران بە دەست نایەت، بەڵکوو بە تەواوەتی نەگونجاوە( نامومکینە). مرۆڤ گۆڕەپانی شەڕی دوو غەریزەی مەرگ وژیانە. مرۆڤ ناتوانێ پێش لەو کارەساتە وێرانگەرە بگرێت کە خۆی وکەسانی دیکە ڕووبەڕوی دەبنەوە.

فرۆید لەو نامە سرنج ڕاکێشەدا کە بۆئینشتاین نوسیویەتی هەوڵی داوە لە توند وتیژی ئەم تیزە کەم بکاتەوە:" **بۆچی شەڕ** ". فرۆید لە هەڵوێستی بنەڕەتی خۆیدا کە لەو کاتەدا خۆی بە لیبراڵ لە قەڵەم دەدا، نەیهێشت خواستەکان ویاخود پەرێشانی سەرچاوەگرتوو لە ڕەشبینی قووڵی خۆی لە دەیەی (١٩٢٠-١٩٣٠) فریوی بدات، ئەو توند وتیژییەی کە بە ڕاستی لە قەڵەم دەدا، نە گۆڕی ونە نەرمیشی کرد. فەیلەسوفی شەکاکی ڕووناکگەر کە نوقمی بیرکردنەوەی کارەساتی دارمانی جیهان ببوو، بە تەواوەتی بوو بە کەسێکی شەکاك وچارەنوسی مرۆڤی لە مێژوودا بە کارەساتێکی حاشاهەڵنەگر لە قەڵەم

دا، فرۆید جگە لەمە نەیدەتوانی دژکردەوەیەکی دیکە لە خۆی نیشان بدات، چوونکە کۆمەڵگەی ئەو کاتە لە ڕوانگەی ئەوەوە باشترین کۆمەڵگە بوو کە گەیشتبووە ئەو پەڕی کامڵبوون.

لە کۆتایی ئەم باسە لە مرۆڤناسی فرۆیددا دەبێ جەخت لە سەر ئەوە بکەمەوە کە تەنها کاتێك پەی بە گەورەیی کارەکەی دەبەین، چە لە لایەنی مرۆڤایەتییەوە وچە لە لایەنی ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە، لەو حاڵەتەدا دەبینین کە لە لایەن ناکۆکییە بونیادییەکانەوە لە پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیدا شەتەك دراوە. ئەم بیر وبڕوایە کە تێکڕای تەعلیماتەکانی ئەو، لە دوای ئەم پەنجا ساڵە، پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی بنەڕەتی نییە، یان لە باتی ریفورمخوازی تراژیك وەك بیرمەندێکی شۆڕشگێڕ چاوی لێبکەین، بە گەلێك هۆکارەوە لە لایەن زۆربەی خەڵکەوە قبووڵ ناکرێت. مەرجی پێویست، بەشداری کردنە لەو چەمکانەدا کە فرۆید مەبەستی بووە.

# ٣- مارکس وناسینی مرۆڤ[1]

بە پێویستی دەزانم لە سەرەتاوە سرنج بدەمە چەند خاڵێك. بەشی مـارکس لـە ناسـینی مـرۆڤ ویـا خـود لـە واتـای سـنووردارتردا، لـە دەروونناسـی، بابەتێکـە کـە کـەمتر بایـەخی پێـدراوە. بـە پێچـەوانەی ئەرەسـتۆ وسـپینوزا کـە نوسـراوەکانیان سـەبارەت بـە زانسـتی ئاکـار نامێلکـە گـەلێکی فەلسـەفین، مـارکس ئەوەنـدە سـرنجی بـە تـاك، وروژێنـەرەکان وخـودی مـرۆڤ نـەداوە، بـەڵکوو ئامـانجی ئـەو یاسـاکان وگۆڕانی کۆمەڵگا بووە.

سرنج وبایەخدانی مارکس بە دەروونناسی چەندین هۆکاری هەیە. یەکـەم ئـەوەی کـە مـارکس قـەت شـێوازێکی سیستـەماتیکی بـە تیوریـیە دەروونناسـانەکانی خـۆی نـەداوە. بۆچـوونەکانی بـە شـێوەیەکی پـەرژوبڵاو لـە نوسـینە جۆراوجۆرەکانیـدا هـاتووە کـە پێویسـتە لـە شوێنێکدا کۆبکرێتەوە تا چییەتییەکی سیستەماتێك بگرنە خۆ. دوهـەم لێکدانەوەی قیزەون وهەڵە لە فەلسـەفەی مـارکس، کـە تـەنها دەربـارەی

[1] ئەم وتارە لـە سـەمپوزیومێکدا سەبارەت بە کاریگـەری مـارکس لـە بیرکردنـەوەی زانسـتی ئەم سەردەمەدا خوێندرایەوە. ئەم سەمپۆزیۆمەلە١٩٦٨/٤/٨دا بە سەرپەرەستی یونسکۆ لە لایـەن" ئەنجومـەنی زانسـتی و کۆمەڵاییـەتی ناونەتـەوەیی" و"ئەنجومـەنی ناونەتـەوەیی فەلسەفەی توێژینەوە مرۆوایەتییەکان" بەڕێوە چوو.

دیـاردە ئابوورییـەکان ئـەنجام دراوە، ویـا لێکدانـەوەی هەڵـەی چـەمکی ماتریالیزمی مێژوویی، کە بە گوێرەی ئـەوە مارکس لـەو بڕوایەدایـە کـە پاڵنـــەرە ســـەرەتاییەکانی مـــرۆڤ ، قـــازانجی ئابوورییـــە. روخســـاری راستەقینەی مـرۆڤ لـە ڕوانگـەی مارکسـەوەو هـەر وەهـا بەشـی ئـەوی لـە دەروونناسـیدا لـێڵ ونادیـار کـردوە. سـێهەم: دەروونناسـی دینـامیکی مـارکس زووتـر لـەو کاتـەی بتوانـێ سـرنج بـە لای خۆیـدا رابکێشـێت، خرایە روو. لە سەردەمی فرۆیددا دەروونناسـی قـووڵ[1] وسیستەماتیك پـەرەی سـەند ودەروونشیکارییەکەی ئـەو بـوو بـە گـرنگترین سیسـتەمی دەروونناسـی دینامیـك. گشـت پەسـەندی سیسـتەمی فرۆیـد، کـە تـا ڕادەیەك بە هۆی ماتریالیزمە میکانیستیکەکەی بوو، لە بەر دەم ناسینی قووڵایی مرۆوایەتی بوونی مارکس ئاستەنگی دروست کرد. لـە لایـەکی تـرەوە رۆڵـی گرنگـی دەروونناسـی پـوزوتیڤ گـەرا لـە بـەردەم چـەمکە دەروونناسانەکانی مارکسدا ڕێگر بوو.

ئایـا جگـە لەمـە بـوو؟ دەروونناسـی مـۆدێرنی ئـەزموونی، کـە تـا ڕادەیـەکی زۆر سـەرقاڵی مرۆڤـی لـە خـۆ بێگانـە دەبـوو، لـە لایـەن توێژینـەرەوە لـە خۆبێگانەکانـەوە لەسـەر شـێوازە بێگانەکـەرەکان توێژینـەوە ئـەنجام دەدرا. دەروونناسـی مـارکس کـە لـە سـەربنەمای ئاگاهی تەواو لە، لە خۆ بێگانەیی بوو. دەیتوانی لە جۆرە تێگەیشتنەی دەروونناسـیش زیـاتر بـڕوات. چـونکە مرۆڤـی لـە خۆبێگانـە ی بـە مرۆڤێکـی ئاسـایی لـە قەڵـەم نـەدەدا. لـە ئەنجامـدا دەروونناسـی ئەولـە ڕوانگـەی ئەوانـەوە کـە بڕوایـان بـە "ڕەنگدانـەوە ناسـی"وشـەرتی کـردن

---

[1]. Depth Psychology

(مەرجی کردن) بوو وەك دواین گوتە لە ناسینی مرۆڤدا بە کتێبێکی داخراو لە قەڵەم دەدرا. ڕەنگە هەنووکە زیاتر لە سەردەمەکانی دیکە دەرفەتی تێگەیشتن لە بەشی مارکس لە دەروونناسیدا بوونی هەبێت. چوونکە یەکەم: ئیدی دۆزینەوزە سەرەکییەکانی فرۆید بەشێکی جیاوە نەبووی بەشە میکانیستییکە تیورییە کانی ئەونین( بۆ نمونە تیوری لیبیدۆ)، دوهەم رینسانس، رینسانس لە بیرکردنەوەی مرۆڤ ، بناغە وبنەڕەتێکی باشتری بۆ تێگەیشتن لە دەروونناسی مارکس دابین کردوە.

لەم وتارە کورتەدا تەنها دەتوانم کورتە یەك لەوەی کەمن بە ناوەندی بەشی مارکس لە دەروونناسی دەزانم بەیان بکەم، وناتوانم سەبارەت بە پەیوەندی ئەندێشە دەروونناسیەکانی ئەو لە گەڵ فیکرەکانی سپینوزا، گوتە، هیگڵو فویرباخ قسەبکەم. لە وتوویژ سەبارەت بە دەروونناسی وەك "زانستی سروشتی مرۆڤ" (کە هەمان "زانستی سروشتی مرۆوایەتی"یە)، مارکس لە چەمکی سروشتی مرۆڤەوە دەست پێ دەکات وتادواین لاپەرەکانی کتێبی "کاپیتاڵی " بەردەوام دەبێت، ولە بەرگی سێهەمی ئەم کتێبەدا هەل ومەرجی پیشەی بە "گرنگترین وبەنرخترین مەرج بۆ سروشتی مرۆڤ دەزانێ". مارکس لە کتێبی "ئابووریونوسراوە فەلسەفییەکان " لە ساڵی ١٨٤٤ باسی"جەوهەری مرۆڤ"ویان ژیانی جۆرەکانی مرۆڤ دەکات ولە کتێبی ئایدولۆژیای ئەڵمانیدا ئەم جەوهەرە بە دیاردەیەکی نائەبستراکت (ڕەها) وەسف دەکات. لە کتێبی کاپیتاڵ "سروشتی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی" لە باتی "جەوهەر" دادەنێت تا لەو سروشتەی مرۆڤ

لە قۆناغە مێژووییەکاندا پێناسە کراوە جیاواز بێت. ئەمە ، لە راستیدا، پالاوتنێکی گرنگە لە چەمکی سروشتی مرۆڤدا، بەلام قەت ئامارەی بەلاوەنانی بەرچاوناکەوێت. ئایا مارکس هیچ پێناسەیەکی بۆ "جەوهەری سروشتی مرۆڤ" و" سروشتی مرۆڤ بە شێوەیەکی هەمەکی(گشتی)" هەیە؟ ولامی ئەم پرسیارە پوزوتیڤە. ئەو لە " نوسراوە فەلسەفی"یەکانیدا سروشتی مرۆڤی بە ئازاد، وشیارو ئاکتیڤ(چالاك) وەسف کردوە کە خالی بەرامبەری سروشتی ئاژەلە کە "ناتوانێ لە نێوان چالاکی وبوونی خۆیدا جیاوازی دابنێت.... وخۆی ئاژەلی چالاکی خۆیەتی". مارکس لە نوسینەکانی دیکەی خۆیدا "سروشتی مرۆڤ" بە لاوە دەنێت، بەلام هێشتا جەختی لە سەردەکاتەوە، واتە چالاکی بە تایبەتمەندی سروشتی مرۆڤی ئیفلیج نەبوو دەزانێ. مارکس لە کتیبێی "کاپیتال"دا، مرۆڤ بە "ئاژەلی کۆمەلایەتی ناو دەبات لە ئەرەستوو فرانکلین کە یەکەمیان مرۆڤ بە " ئاژەلی سیاسی" و دوهەمیان بە"ئاژەلی ئامێرساز" ناودەبات رەخنە دەگرێت. دەروونناسی وفەلسەفەی مارکس سەبارەت بە چالاکی مرۆڤە، ومن لەگەل ئەو روانگەیەدا کە گونجاوترین دەستە واژە بۆ بەیانکردنی ئەو وەسفەی کە مارکس لە مرۆڤ کردویەتی، واتە "بوونەوەری کار" {لە هەمبەر تیوری}، بە تەواوەتی هاورام. سەبارەت بەم خالە دواتر قسەدەکەم.

هەنگاوی یەکەمی مارکس لە بەکارهێنانی"سروشتی مرۆڤ" لە تێکرای نوسراوەکانیدا، بە بێ سرنج دان بە هەنگاوی گرنگتری دوهەم کە تیوری دەروونناسی ئەو شرۆڤە دەکات بێ واتایە. من چەمکی

سروشتی مرۆڤی، مەبەستی ئەو وەك سروشتێکی دینامیك وچالاك لە قەڵەم دەدەم. مارکس مرۆڤ بە بوونەوەرێك دەزانێت کە لە رێگەی هەست وسۆز و پاڵنەرەکانەوە دەکەوێتە جوڵەوە، هەرچەند خۆی ئاگای لەم هێزە بزوێنەرانە نییە. دەروونناسی مارکس دەروونناسییەکی دینامیکە. ئەم پرسە لە لایەکەوە لە گرێدانی بە دەروونناسی سپینوزاو خواستی پێشکەوتن لە رێبازی فرۆید، لە لایەکی ترەوە لە ناکۆکییەکەی لە گەڵ هەرجۆرە دەروونناسی میکانیستێك نەبەس وکەوت گەرایانە سەرچاوە دەگرێت. هەروەها کە هەوڵ دەدەم لە لاپەرەکانی داهاتوودا پیشانی بدەم ، دەروونناسی میکانیکی مارکس لە سەر بالابوونی گرێدراوی مرۆڤ بە جیهان بە خودی مرۆڤ وسروشت دامەزراوە، لە حاڵێکدا دەروونناسی فرۆید، بە پێچەوانەوە، پشت بە مودێکی "مرۆڤی ماشێنی" (ربۆت)وگوشەگیر دەبەستێت.

مەبەستی گشتی ترو سود دارتری مارکس لەپاڵنەرەکان ، جیاوازی نێوان و پاڵنەرە هەمیشەی و پاڵنەرە رێژەییەکانە. پاڵنەرە هەمیشەییەکان" لە هەربارودۆخێك بوونیان هەیە... وتەنها لە ئاستی شێوە و هەل و مەرجی کۆمەڵایەتیدا دەگۆردرێن" مارکس ئارەزۆی جنسیوبرسێیەتی وەك پاڵنەری هەمیشەیی ورق و چاوچنۆکی بە وروژێنەری رێژەیی لە قەڵەم دەدات. جیاوازی ئەودوانە ، پەیوەندییەکی نزیکی لە گەڵ جیاوازی نێوان سروشتی مرۆڤ بە گشتی وتایبەتمەندییەکانی بە تایبەتی هەیە. لێرەدا دەمەوێت بە کورتی روونی بکەمەوە کە ئەم دابەش کردنەیپاڵنەر وغەریزەکان رۆڵێکی گەورەی هەیە، مارکس بە بەیان کردنی ئەمە کە "ئارەزۆ رێژەییەکان"

(دەستەواژەیەكی دیكەیە بۆ پاڵنەرەكان ) بە شێكی جیاوەنەبووی سروشتی مرۆڤ نین، بەڵكو لە بونیادی دیاریكراوی كۆمەڵگا وهەندێك هەل‌ومەرجی بەرهەم هێنان وپەیوەندییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەو جیاوازییەی كە مەبەستیەتی روون دەكاتەوە ولەم رووەوبنەڕەتەكانی دەروونناسی دینامیك كە دەڵێ كۆمەڵگە لە زۆربەی ئارەزۆكانی مرۆڤ تێناگات —وبەشی گرنگی وروژاندنی مرۆڤە—و گرێدراوی پرۆسەی بەرهەم هێنانە، دادەمەزرێنێت. چەمكی "كاراكتەری كۆمەلایەتی [1]" لە واتا دینا‌‌‌‌‌‌‌‌ میكەكەیدا كە من بە كاری دەهێنم لە سەر ئەم بۆچوونەی ماركس بونیاد نراوە.

باسەكەی ماركس سەبارەت بە وپاڵنەرەكانی ئاژەڵ لە هەمبەر چۆنایەتی مرۆیی پاڵنەرە هەمیشەییەكان، لە جیاوازی نێوان وپاڵنەرە هەمیشەیی ورێژەییەكان گرنگی كەمترە. جیاوازی نێوان دەروونناسی دینامیكی ماركس ودەروونناسی فرۆید لەم خاڵە دایە. بە سرنجدان بە پاڵنەرە هەمیشەییەكان وبەو گریمانەیە كە( بە بۆچوونی دەروونشیكاران ودەروونناسانی ئاكادمیك ) چۆنایەتی ئەو پاڵنەرە لە مرۆڤ وئاژەڵدا وەك یەكە ،ماركس ئەڵێ " خواردن وخواردنەوە وزاوزێ لە كارە سەرەكییەكانی مرۆڤن. بەلام لە لایەنی ئینتیزاعییەوە، بە چاوپۆشی لە چوارچێوەی چالاكی مرۆڤ ، ئەو كارانە، كاری ئاژەڵن." لە ڕوانگەی دەروونشیكارەكانی قوتابخانەی فرۆیدەوە، لە سەر بنەمای "مرۆڤ رۆبۆتی گۆشەگیر" پاڵنەرە مرۆڤ بە پرۆسە كیمیاییەكانی ناخی

---

[1]. Social Character

مرۆڤ شارژ(شەحن) دەبێتەوە وئامانج کەم کردنەوەی گرژییە تا لانی کەمی دامرکاندنی برسێتی وتینویەتی ئارەزۆ جنسییەکان.

هەنووکە دەتوانین یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی مەبەستی مارکس سەبارەت بە چییەتی پاڵنەرەکان لێك بدەینەوە: "هەست وسۆزەکان بریتین لەو توانا وبەهرانەی لە مرۆڤدا کە هەوڵ دەدات ئامانجی خودی بەهاکان بە دەست بهێنێت". لەم ووتەیەدا مەبەست لە هەست وسۆزەکان" پەیوەندی" یان" نزیکایەتییە"، و بە پێچەوانەی بۆچوونی فرۆید سەبارەت بە غەریزە یان پاڵنەر، هەست وسۆزەکان کۆشش وهەوڵدانێکی ناوخۆییەوله پرۆسەی کیمیاییەوە سەرچاوە دەگرن، کە پێویستی بەئامانجێك بۆ دامرکاندن نییە، بەڵکوو تواناکانی مرۆڤ خۆی چۆنایەتییەکی دینامیکەوله ئامانجێك دەگەرێن تا لە گەڵیدا یەك بگرن.

**ریشەی دینامێك بوونی سروشتی مرۆڤ، لە پلەی یەکەمدا، لە پێویستی مرۆڤ بە دەرخستنی تواناکانی لە جیهاندا سەرچاوە دەگرێت، نەك لە پێویستییەکەی بۆ کەڵك وەرگرتن لە جیهان وەك ئامرازی دامرکاندنی پێویستییە جەستەییەکانی خۆی.**

مارکس دەیەوێت بڵێ : بۆ ئەوەی کە چاوم هەیە، کەواتە پێویستم بە بینینە، بۆ ئەوەی گوێچکەم هەیە ، کەواتە پێویستم بە بیستنە، بۆ ئەوەی مێشکم هەیە، کە واتە پێویستم بە بیرکردنەوە هەیە، و بۆ ئەوەی دڵم هەیە، کەواتە پێویستم بە هەست هەیە. پێویستە دوپاتی بکەمەوە کە بە سرنج دان بە برەوی دەروونناسی"خۆ" لە لایەن دەروونشیکارییەوە، مەبەستی مارکس لە تواناکان وئامرازەکانی ئەوان

کوت ومت "خۆ" نییە، بەڵکوو هەست وسۆز وهێزی سروشتی تواناکانە کە وەك، پاڵنەرەکان، خواست وتواناکان لە مرۆڤدا بوونیان هەیە. ویان ئەو وزەو هێزەیە کە هەر توانایەك بە گوێرەی پێویستی دەخاتە روو.

گەلێك گوتەی مارکس بوونیان هەیە کە گۆڕدراوەیەکە لە ناوەڕۆکی هەست وسۆزەکان ولە ریزی پەیوەندی مرۆڤ لە گەڵ خۆی، کەسانی دیکە وسروشت وهەر وەها دەستەبەرکردنی هێزە سەرەکییەکانی مرۆڤدا جێدەگرن. لێرەدا تەنها دەتوانم باسی چەند نمونەیەك بکەم. مارکس مەبەستی خۆی لە" تواناکانی مرۆڤ" کە ئامرازی پەیوەندی سۆزداری لە گەڵ جیهانە بە باشی روون کردوەتەوە:" پەیوەندی مرۆڤی مەبەستی ئەو لە گەڵ جیهاندا- دیتن، بیستن، بۆنکردن، چێشتن، بەریەککەوتن، سەیر کردن، هەستکردن، هیوادار بوون وخۆشەویستی- بە کورتی تێکڕای ئورگانەکانی تاکیەتی.... بە واتای ئامرازی چالاکی مرۆڤ بوونە". بۆ ئەوەی ئامانج لە بوونی مرۆڤ سەمبولیکە، کە واتە چۆنایەتییەکی مرۆیی لە خۆ دەگرێت، ویان بە گوتەی مارکس، " من کاتێك دەتوانم وەك مرۆڤێك خۆم لە گەڵ شتێکدا پەیوەند بدەم، کە خودی ئەو شتە بە شێوەیەکی مرۆیی لە گەڵ مرۆڤدا پەیوەند درابێت."( ئەگەر سرنج بدرێتە لێکچوونی ئەم مەبەستەی مارکس، لە گەڵ بۆچوونەکانی گۆتە، زەن بودیزم وراهیبییەتی مەسیحی زۆر گرنگە).

کە واتە " پاڵنەرەکانی "مارکس دەربڕینێکی پێداویستی بنەڕەتی وتایبەتی نییە، ئەو پێداویستییەی کە گرێدراوی مرۆڤ وسروشتە

ومرۆڤ بەم پەیوەندییە ژیانی خۆی مسۆگەر دەکات. ئامانج "یەکگرتنی مرۆڤ لە گەڵ سروشت، سروشت گەرایی ، دەستەبەر بوونی مرۆڤ ومرۆڤگەرایی دەستە بەر بوونی سروشتە." پێویستی دەستەبەر بوونی نەستی مرۆڤ ریشەی دینامیك بوونی مرۆڤە. مرۆڤی دارا کەسێکە کە "پێویستی بە کۆمەڵێك نیشانەی مرۆیی ژیان هەبێتو دەستەبەر بوونی نەست پێویستی ناخە نەك پێداویستی".

هەروەها مارکس رێژەی نێوان گرێدراوی مرۆڤ بە خۆ وکەسانی دیکەی دەبینی. هەڵوێستی ئەو لەم بارەیەوە لە گەڵ هەڵوێستی گۆتە یەکێکە کە گوتویەتی:( زانیاری مرۆڤ لە سەر خۆ بە هەمان ڕادەی زانیاری ئەو سەبارەت بە جیهانە. مرۆڤ تەنها لەناخی خۆیدا جیهان دەناسێت ولە بوونی خۆی لە جیهاندا ئاگادار دەبێتەوە. هەر شتێکی تازە کە بە دروستی بناسرێت لە ناخی ئێمەدا "ئورگانێکی" نوێ دەکاتەوە). لەم چەمکە دینامیکەی پەیوەندی، دەگەینە ئەو ئەنجامە کە لە ڕوانگەی مارکسە وە" مرۆڤی دارا کەسێکە کە پێویستی بە کۆمەڵێك نیشانەی مرۆیی ژیان هەبێت و دەستەبەر بوونی نەفس لەوێداپێویستییەکی ناخ بێت واتە پێویستییەك". لەم رووەوە هەژاری کۆتێکی نەبینراوە کە مرۆڤ ناچار دەکات پێداویستییەك تاقی بکاتەوە وگەورەترین سامان کۆبکاتەوە وببێتە کەسێکی دیکە".

لەم جۆرە گرێدراوییەدا کێ بە تێکڕای هێزەوە لە هەوڵی نواندنی تواناکانی خۆی دایە ، کرێکار یان بورژوازی سەدەی نۆزدەیەم؟ ئەگەر وڵام نیگەتیڤ بێت- کە نیگەتیڤە-گرێدراوی سروشتی مرۆڤی مەبەستی مارکس لە گەڵ کام مرۆڤدایە؟ ئایا لە گەڵ مرۆڤی چەرخی

زێڕینی رابردوو یاخود مرۆڤی سەردەمی سەرهەڵدانەوەی مەسیح لە داهاتوودا؟ وڵامی ئەم پرسیارە ئاڵۆزە وراستەوخۆ بەرەو یەکێك لە قووڵترین وپێشکەوتوترین لایەنەکانی فەلسەفەی مارکس دەمانبات. لە هەمبەر نەخۆشی دەروونی کە دەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی رێژەیی لە گەڵ نەخۆشی ئاسایدا جیاوازە ولەوە قورستر ومەترسیدارترە، یا خود بە دەربڕینێکیتر نەخۆشییەکە لە بەردەم بەرهەمهێنان یان زاوزێدا ئاستەنگ نابێت، مارکس خەسار ناسی ئاسایی، واتە ئیفلیج بوونی مرۆڤی ئاسایی، لە دەست دانی خۆ ولە دەستدانی جەوهەری مرۆوایەتی خستە روو. بەم واتایە کە مارکس دەڵێت:" ئەگەر شتەکان مرۆیی نەبن ڕەنگە مرۆڤ لە ناویاندا ون ببێت، بە دەربڕینێکی دیکە ئەگەر پەیوەندی مرۆڤ لە گەڵ شتدا پەیوەندییەکی چالاك نەبێت تێیدا وون دەبێت- مارکس زۆربەی ئەم پەیوەندییەی بە " دەست بە سەرداگرتن"(چەمکی مۆڵکداریەتی ) ناوزەد کردوە. ئەمڕۆ لە مرۆڤێك کە لە لایەنی جەستەیی ورۆحییەوە لە "مرۆوایەتی داماڵرابێت"[1]"، یان کرێکاری ئێفلیج بوو ویان " پارچەیەك لە مرۆڤ"[2]" لە هەمبەر مرۆڤە کامڵبوو قسە دەکات. و بەم شێوەیە بەڵگە دەهێنێتەوە کە ئەگەر مرۆڤ بە شێوەیەکی چالاك خۆی بە کەسانی دیکە وسروشتەوە گرێ نەدات، دەیدۆڕێنێت، وپاڵنەرەکانی چۆنایەتی مرۆیی خۆیان لە دەست دەدەن وچۆنایەتی ئاژەڵی لە خۆ دەگرن وبۆ ئەوەی مرۆڤێکی وەك ئاژەڵ نییە، بە ناچاری دەبێتە مرۆڤێکی ئێفلیج، وناچارین بەمرۆڤێکی نەخۆش

---

[1] .Dehumanized

[2] .Fragment Of Man

و"تێك وپێك چوو " لە قەڵەمی بدەین. ئەو بۆچوونە كوت‌ومت توخمی شۆڕشگێری و چارە سەرییە لە دەروونناسی ماركسدا. مرۆڤ نەتەنها بە شێوەیەكی شاراوە خاوەن تواناكارییە بەڵكوو پێویستی بە پەیوەندی لە گەڵ جیهان هەیە وبۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێك وچاك ببێت دەبێت دووبارە ئەو توانا پوتانسێلە بە دەست بهێنێتەوە، نەك بە دەست هێنانی خەسارناسی كار وئەركی مرۆڤ.

مەبەستی ماركس لە مرۆڤی ئیفلیج بوولە هەمبەر مرۆڤی كامڵبوو بنەمای چەمكێكی تازەیە لە خەمۆكی دەروونیدا. ماركس لە بەشێك لە "ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی " دا ئەڵێ:

"بێ واتایە ئەگەر لەو بڕوایەدا بین كە مرۆڤ دەتوانێ هەڵچوونەكان جیا لە خواستەكانی دیكەی دابمركێنێت بە بێ ئەوەی **خۆی**، واتە تێكڕای بوونی زیندوی، رازی كردبێت. ئەگەر ئەم هەڵچوونانە تایبەتمەندییەكی ئینتیزاعی وجیاواز بگرنە خۆ، ئەگەر وەك هێزێكی بێگانە رووبەڕوی خودی مرۆڤ ببنەوە، واتە....دامركاندنی یەك لایەنەی یەكێك لە هەڵچوونەكان، ئەم كارە بە هیچ شێوەیەك ئامارژە بە شارەزایی ومەبەستی باش ناكات.... بەڵكو بە بۆنەی **هەبوونەوە**، بیركەرەوە بوون نییە بەڵكوو زیندو بوونە. هۆكاری ئەم گوتەیە كامڵ بوونی وردەوردەیی ودەركەوتنی ژیانی تاكە.... ئەگەر ئەو هەل‌ومەرجەی كە ئەم كەسە بە گوێرەی ئەو دەژی رێگەی كامڵ بوونی یەك لایەنەی چۆنایەتییەك بە بەهای چۆنایەتییەكانی دیكە بدات.... ئەم

دەرئەنجامەی لێدەکەوێتەوە ک.، ئەم کەسە تەنها کامڵ بوونێکی یەك لایەنەی ئیفلیج بوو بە دەست دەهێنێت".

مارکس لێرەدا لە وروژێنەر یان هەڵچوونە بێگانە بووەکان دەدوێت، ئەو هەڵچوونانەی کە لە کۆتایی دا خۆیان دامرکێنن بە بێ ئەوەی تێکڕای بوونی مرۆڤیان دامرکاندبێت- واتە لە هەڵچوونەکانی دیکە جیان ولەم رووەوە وەك هێزێکی بێگانە رووبەرووی تاك دەبنەوە. لە دەروونناسییەکی غەریزی دا، وەك دەروونناسی فرۆید، کە تێیدا هاوسەنگی وتەندروستی دەرئەنجامی دامرکاندنی تەنها یەك غەریزە ، واتە غەریزەی جنسیە، شوێنێك بۆ ئەم ئەندێشەیە نامێنێتەوە. لە چەمکی هۆمانیستیکی هەڵچوونەکاندا کە هێز بەرهەمی هەوڵدانی ئاکتیڤی تێکڕای تواناکانە تا هەڵچوونەکان بە خواستی خۆیان بگەن (ئەم گوتەیەی مارکس ئاماژە بەچییەتی خەمۆکی دەروونی یان نەخۆشی دەروونی دەکات) ئەم کارە نیشانەی زاڵ بوون یان بێگانە بوونی هەڵچوونەکانە.

کلیلی تێگەیشتن لە پاڵنەری بێگانە نەبوو **چالاکییە**، یان بەو جۆرەی مارکس ناوی لێناوە " خۆ-چالاکییە"[1] . هەڵبەت مەبەستی ئەو لە چالاکی ئەو واتا باوەی هەنووکە نییە، وەك ئەنجامدانی کارێك یا خود سەرقاڵ بوون بە پیشەیەکەوە... دیسان مەبەستی ئەو لە چالاکی لە گەڵ چالاکی ئاژەڵ کە تەنها بە گوێرەی ستانداردو پێداویستییەکانی هەڵسوکەوت دەکات، جیاوازە، چوونکە مرۆڤ دەزانێ چۆن بە گوێرەی ستانداردەکانی ئامانجی خۆی کار بکات ویان شتێك بەرهەم بهێنێت.

---

[1] . Self-activity

مەبەستی مارکس لە چالاکی لە بۆچوونی سپینوزاوە نزیکەولێك دەچن، واتە کاری داهێنەرانە وخۆهەڵقوڵاو، کە تەنها بە دابین کردنی هەل‌ومەرجی ئازادی مومکین دەبێت. بۆ نموونە ئەو لە چالاکی خۆهەڵقوڵاوی مرۆڤ ودڵ ومێشکی مرۆڤ دەدوێت. ئەو دەستەواژە هەستی وهەست پێکراوانە کە مارکس لە پێناسەی هەڵچوونەکانی مرۆڤدا، بە تایبەت خۆشەویستی، بە کاری دەهێنێت، چەمکی چالاکی زیاتر روون دەکاتەوە. ئەو دەنوسێت::

" گریمان مرۆڤ ، مرۆڤە وپەیوەندی مرۆوایەتییانەی لە گەڵ جیهان هەیە. لەم حاڵەتەدا خۆشەویستی لە گەڵ خۆشەویستی ومتمانە لە گەڵ متمانەو... دەگۆڕدرێتەوە. ئەگەر دەتانەوێت لە هونەر چێژ وەربگرن دەبێت پەروەردەی هونەریتان هەبێت، ئەگەر دەتانەوێت بچنە نێو دڵی کەسانی دیکەوە دەبێت خاوەن توانستی وروژاندن وحەز وجۆش وخرۆش بن. پەیوەندی ئێوە لە گەڵ سروشتدا دەبێت شوێنە دەرکەوتنێکی دیاریکراوی هەبێت کە گرێدراوی ئامانج وویست وژیانی راستەقینەی تایبەتی ئێوە بێت. ئەگەر خۆشەویستی بنوێنن بە بێ ئەوەی خۆشەویستی بوروژێنن، واتە ئەگەر نەتوانن خۆتان وەك کەسێکی میهرەبان وئەویندار نیشان بدەن وکەسێکی خۆشەویست بن، خۆشەویستییەکەت بێ کەڵکە ونیشانەی بەدبەختییە".

مارکس چۆنایەتی چالاکی خۆشەویستی لە " بنەماڵەی پیرۆز"دا روونتر بەیان دەکات:" جەنابی ئیدگار بە گۆڕینی پیاوی ئەویندار یان ئەوینی پیاو بە پیاوی ئەوین، ئەوینی کردوەتە خوداوەندی ستەمگەری ودەرئەنجام ئەوین لە بوونی پیاو جیا دەکاتەوە. لەم پرۆسە سادەیەدا بە

گۆڕینی " موسند"[١] بە بکەر پیا'و دەبێتە (ناپیاو). لە راستیدا ئەوین چالاکی مرۆڤە، نەك کەوتنە بن کاریگەری ئەوین (ئەویندار بوون نەك کەوتنە نێو داوی ئەوینەوە"[٢]). خۆشەویستی مرۆڤ فێر دەکات تا بە شتەکانی جیهانی دەوروبەری خۆی باوەڕی راستە قینەی هەبێت."

مەبەستی مارکس لە پێداویستییە راستەقینەکانی مرۆڤ- پێویستی بە کەسانی دیکەیە، بە ئامێر ودەربڕینی تواناکانی خۆ و بەئامانجەکان- تەنها لە حاڵەتێکدا بە شێوەیەکی کامڵ دەرك دەکرێت کە سرنج بدرێتە مەبەستی ئەو لە پێویستییە دەستکرد وکوێلە کەرەکان. دەروونناسی مـــۆدێرن بایـــەخێکی ئـــەوتۆ بـــە شـــیکردنەوەیی ڕەخنەگرانـــەی پێداویستییەکان نادات، و یاساکانی بەرهەمهێنانی پیشەسازی قەبووڵ دەکات ( لانی زۆری بەکار هێنان وسوانی مرۆڤ )، بە پشت بەستن بەم گریمانانە کە ئارەزۆ وخواستە تایبەتییەکان هۆکاری پێویستی ڕەوا بە کالاّ یان ئامانجی دیاریکراوە، دەروونشیکاری ئەرزەدۆکس کە لە سەر پێویستی جنسی ودواتر پێویستی وێرانگەری وپێویستییەکانی مانەوە ورد دەبووەوە، هیچ هۆکارێکی بۆ خۆ خەریککردن بە پێداویستییە بەرفراوانەکان نەبوو. لە لایەکی دیکەوە مارکس بە هۆی چییەتی دیالیکتیکی دەروونناسی خۆی تایبەتمەندی دوولایەنە و ونادیاری پێویستییەکانی روون کردوەتەوەو لە راستیدا ئەم خاڵەی لە هێرشە توندەکەی خۆی بۆ سەر دەروونناسی خستوەتە روو. مارکس لە "

---

[١] مسند( موسنەد) وشەیەکە لە رەستەدا کە ئاماژە بە ناچاری دەکات بۆ نمونە رۆژ رووناکە واتە رۆژ ناچارە کە رووناك بێت یان مەحکووم بە رووناکییە. و.

[٢] .To be in love rather than to fall in love

نوسراوە فەلسەفی وئابوورییەکاندا " دەنوسێت:" زانستێك کە ئاگای لە کەم وکوڕییەکانی خۆی نییە فایدەی چییە؟ "بەم حاڵەوە دەتوانین واتای بەرەکەتی گەورەی چالاکی مرۆڤ لە وشەیەکدا کورت بکەینەوە:" پێداویستی" . مارکس ئەو پێداویستیانەی کە مرۆیی نین بە شێوەیەکی کورت دیاری کردوە:

" هەر کەسێك بیر لەوە دەکاتەوە کە پێداویستییەکی تازە لە کەسێکی دیکەدا دروست بکات، تا ناچاری بکات قوربانییەکی تازە پێشکەش بکات، و گرێدراوییەکی تازەی تێدا بخولقێنێت وبە کورتی بیخاتە داوی رابواردن وچێژێکی دیکەوە.... هەر کەسێك هەوڵدەدات بە سەر کەسانی دیکەدا هێزێکی بێگانە بسەپێنێت تا هەستی لە خۆ رازی بوونی خۆی رازی بکات. بۆ ئەوەی شتەکان لە ژمارە بە دەرن، لەم رووەوە هەرێمی بێگانە بوونی ئەوانەی کە ئامانجەکەیان مرۆڤە فروان دەبێت. هەر بەرهەمێکی تازەهێزێکی فریودان ودزییەکی بەرامبەرە. مرۆڤ بە شێوەیەکی روو لە زیاد بوون " هەژار " دەبێت. ئەو پرۆسەیە تا رادەیەك بۆ ئەوەی پەرەسەندنی بەرهەمهێنان وپێداویستییەکان هەمیشە قازانجی نامرۆوانەی لە گەڵدایە، نیشاندەری ئارەزۆی گەندەڵی نائاسایی وخەیاڵییە."

" بەرهەمهێنانی لە رادەبەدەری شتومەکە( برەودارەکان) دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی( **بێ کەڵکی**) لێدەکەوێتەوە. و هەمووان لە بیر دەکەن کە زێدەرەوی وعەقڵی مووچە، ئاسایش ونەداری، وسامان وهەژاری لە گەڵ یەکدا یەکسانن.

بەم جیاوازییە لە نێوان پێداویستییە رەسەن وخەیاڵییەکانی مرۆڤ ، دەروونناسی مارکس ئاماژە بە یەکێك لە گرنگترین جیاکردنەوەکان دەکات کە پێویستە لە تیوری پێداویستی وپاڵنەرەکاندا ئەنجام بدرێت. دیاریکردن وجیاکردنەوە لە نێوان پێداویستییە مرۆیی ونامرۆییەکان، راستە قینە وخەیاڵی، سود بەخش وزیان بەخش پرسی سەرەکی دەروونناسییە کە نە دەروونناسی ونە دەروونشیکاری فرۆید تەنانەت نەیانتوانیوە لەم بارەیەوە دەست بە لێکۆڵینەوە بکەن، چوونکە جیاکردنەوەیەك لە ئارادا نەبووە. چۆن دەتوانین جیایان بکەینەوە لە حاڵێکدا کە نموونە ومۆدێلی باو مرۆڤی لە خۆ بێگانەیە، وپیشەسازی مودێرن گەلێك پێویستی دەخولقێنێت ودایاندەمرکێنێت. وئەم پرۆسەیە بە نیشانەی پێشکەوتن لە قەڵەم دەدرێت، وچەمکی ئازادی لە پێوانەیەکی فراواندا، رەنگدانەوەی ئازادی کڕیار لە هەڵبژاردنی شت ومەکەکان بە گوێرەی پارەی نێو گیرفانیانە، بەڵام لە راستیدا شت ومەکەکان جۆراوجۆر نین وهەموویان یەك قوماشن- ئەم ئازادی کڕینە بە تەواوەتی لە گەڵ ئازادی سەرمایەداری سەدەی ١٩دا جیاوازە. تەنها دەروونناسێکی دیالیکتیکی و شۆڕشگەر، کە مرۆڤ وتواناکارییەکانی لە سەرەوەی مرۆڤێکە ئیفلیج بوو دەبینێت، دەتوانێ لەم جیاوازییە گرنگە لە نێوان دوو پێداویستیدا ئاگادار ببێتەوە، ئەو دەروونناسانە دەتوانن ئەم جیاوازیانە لێك بدەنەوە کە رواڵەت وجەوهەر پێکەوە تێکەڵ ناکەن. دەبێ سرنج بدەن کە مارکس دوای خستنە رووی ئەم جیاوازییە بە ناچاری گەیشتە ئەو ئەنجامە کە هەژاری وسامان وئاسایش ونەداری دژبە یەك نین بەڵکوو هاوتەریب ویەکسانن.

تا ئێرە مەبەستی مارکسمان سەبارەت بە پاڵنەر وپێداویستییەکان شرۆڤە کرد، بەڵام ئایا لە دەروونناسی ئەودا بابەتێکی تایبەت سەبارەت بە پاڵنەرەکان بوونی هەیە؟ وڵامی ئەم پرسیارە پوزوتیڤە، بەڵام بابەتەکە ئەوەندە سیستەماتیك وکامڵ نییە کە لە قوتابخانەیەکی دەروونناسی چاوەڕوانی دەکەین. پێشتر گوتمان کە بۆچوونی مارکس سەبارەت بە خۆشەویستی، پەیوەندی مرۆڤ لە گەڵ جیهانی دەرەوەدا جیدی وبێ پەردەیە. دیسان ئەم جیدی بوونە سەبارەت بە پرۆسەی بیرکردنەرەش بەر چاو دەکەوێت، یەکێك لەو ڕەخنانەی کە لە کتێبی" بنەماڵەی پیرۆز"دا ئاراستەی جەنابی ئیدگار کراوە ئەمەیە کە ئەو دەیەوێت لە جۆش و خرۆشی ئەوین رزگار بێت تا ئارام ببێتەوە. لەم زەمینەیەدا مارکس خۆشەویستی بە هاوسەنگ ویەکسان لە گەڵ ژیان، تێکڕای ئەزموونە هەستییەکان و تێکڕای ئەو ئەزموونە راستە قینانەی کە تاك پێشتر ئاگاداریان نییە، دەزانێ. تا ڕادەیەك کە گرێدراوی پەیوەندی مرۆڤ بێت، مارکس لەو بڕوایەدایە کە" پەیوەندی بێ ناوبەر، سروشتی وپێویستی مرۆڤیك لە گەڵ مرۆڤێکی دیکە هەمان پەیوەندی ژن وپیاوە.... پەیوەندی ژن وپیاوسروشتی ترین پەیوەندی مرۆڤێکە لە گەڵ مرۆڤێکی دیکەدا."

بەراورد کردنی ئەم بۆچوونەی مارکس لە گەڵ بوچوونی فرۆید سەبارەت بە ئارەزۆجنسییەکان شایانی بایەخ پێدانە. لە ڕوانگەی فرۆیدەوە ئارەزۆجنسییەکان (بە گوێرەی بۆچوونەکەی دواتر، وێرانگەری ) جۆش وخرۆش و هەڵچوونی ناوەندی مرۆڤە. بە هەمان شێوە کە پێشتر ئاماژەم پێکرد وادیارە ئەم جۆش وخرۆشە هەمان کەڵك

وەرگرتنی پیاو لە ژن بێت بە مەبەستی دامرکاندنی ئارەزۆی جنسی، کە بەرهەمی کاروچالاکییە کیمیاییەکانە. ئەگەر مارکس ئاگای لە تیورییەکەی فرۆید بوو وەك تیوری بورژوازی وچەوساندن ڕەخنەی لێدەگرت. لە ناوەندی مەبەستی مارکس بە پەیوەندی مرۆڤدا غەریزەی ژیان جێیگرتووە، نەك ئارەزۆجنسیەکان کە خۆیان یەکێك لە نیشانەکانی غەریزەی ژیانن. لێرەدا مەبەستی من لە غەریزەی ژیان، ڕاکێشانی نێر ومێ بەرەو لای یەکدییە، کە ڕاکێشانێکی بنەڕەتییە لە هەر بوونەوەرێکی زیندودا.

بابەتێکی سەرەکی دیکە لە دەروونناسی مارکس دا ژیان لە هەمبەر مەرگە، نە لە واتای بیولۆژیکی _ فیزیولۆژیکی بەڵکو لە چەمکە دەروونناسیە کەیدا.( لە زۆربەی لایەنەکانەوە ئەم چەمکە تا ڕادەیەك پەیوەندی بە دو غەریزەی مەرگ وژیانی فرۆیدەوە هەیە، بە لام نە بە توخمە بیولۆژیکییەکەی، بەڵکو بەوەی کەمن بەناوی جۆشی ژیان وجۆشی مەرگ ناویان دەبەم). ڕەنگە گرنگترین پرسیار لە دەروونناسی مارکسدا ئەمە بێت کە ئایا تاك، توێژ، یان کۆمەڵگا بە ڕاکێشەری مەرگ یان ژیان دەوروژێن؟ دوژمنایەتی مارکس لە گەڵ سەرمایەداری وخۆشەویستی بۆسوسیالیزم، کە تاڕادەیەك زەمینەی سۆزداری هەیە، و لە دو لایەنەبوونەوە سەرچاوە دەگرێت. لێرەدا یەکێك لە باشترین قسەکانی مارکس لەم بارەیەوە لە "مانیفستی کومونیست"دەهێنمەوە: "لە کۆمەڵگای بورژوازیدا ژیان جگە لە ئامێرێك بۆکۆ کردنەوەی کار هیچێکی تر نییە. لە کۆمەڵگای کومونیستیدا کاری کەڵەکەبوو تەنها ئامرازێکە بۆ پەرەپێدان،

وبەرزکردنەوەی ئاستی ئەزموونی کرێکار." لەم ڕووەوە لە کۆمەڵگای بورژوازی دا ڕابردو بە سەر هەنووکەدا زاڵە، بەڵام لە کومەڵگای کومونیستدا هەنووکە بەسەر رابردودا زاڵە، یان لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: "یاسای سەرمایەداری زاڵ بوونی کاڵای مردوە بەسەر مرۆڤی زیندودا". غەریزەی ژیان وخۆشەویستی بۆ ژیان دوپاڵنەری سەرەکی مرۆڤی لە خۆ بێگانە نەبووە، ئەم دوانە لە سروشتی مرۆڤدا نویَ گەری دەکەن وئەودەرفەتە بۆ مرۆڤ دەرەخسێنن کە ببێتە ئەوەی کە دەیەوێت. مارکس هەموو جۆرە رق وچاوچنۆکی کە یەدەکی خوشەویستی ونهێنی ژیانن و سامان پێکەوەنان و رەزیلیو کەمتەرخەمی سەبارەت بە خۆ لەو هەڵچوونانە دەزانێ کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری دا دروست دەبێت وبەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبن... شرۆڤە کردنی وی لە کاراکتەری پێکەوەنانی سامان لە ڕێگەی مورتازییەوە یان ( کەم خەرج کردن)ەوە لە بورژوازی سەدەی نۆزدەیەمدا ولە کەمتەرخەمی سەبارەت بە خۆ و کەسانی دیکە کە خاوەن ژیانێکی راقین، خاڵێکی گرنگە لە خووناسی دینامیك لە نێو چینە جۆراوجۆرەکاندا. تێکڕای ئەندێشەی دەروونناسی مارکس دینامیکە، نەك هەڵس وکەوت گەرای وەسف کردنی، ئامارە و چەمکەکانی ئەو کاراکتەرانەی کە ئەو مەبەستیەتی پێویستە لە واتا دینامیکیەکەیدا بە کار ببرێن. ئەمانە تا ڕادەیەك ئەو هەڵچوونوئارەزۆ هەمیشەییانەیە کە هەل ومەرجی ئابووری وکۆمەڵایەتی دەیخولقێنێت. مارکس لێرەدا لە بۆچوونە گەورە کۆمەڵایەتییە دەروونناسییەکەی "بالزاك"، کە لێکوڵینەوە لە سەر کاراکتەر وەك لێکوڵینەوە لە سەرهێزە پاڵنەرەکانی مرۆڤ دەزانێت، نزیك

دەبێتــەوە. كــاری بــاڵزاك لــە گــەلێك لایەنــەوە تەواوكــەری بنــەما دەروونناسـییەكانی ماركسـە. دەبـێ ئەمـەش زیـاد بكـەین كـە ئەگـەر كەسێك نامەكانی ماركس وئینگلس، بە تایبەت نوسخە ئەڵمانیە كورت نەكراوەكانیان، بخوێنێتەوە بۆچوونی قوڵی دەروونناسی كەسێكیان بۆ روون دەبێتـەوە كـە، هەرچـەند چۆنایەتی هونـەری وهێـزی وەسـفكردنی بـالزاكی نییـە، بـەڵام یـەكێك لـە باشـترین دارێـژەرانی دەروون شـیكاری كاراكتـەر بە گوێرەی دەروون شیكاری دیالیكتیكی هۆمانیستییە.

ئـەم شـرۆڤە كورتـەی خـۆم لـە دەروونناسـی مـاركس سـەبارەت بـە غـەریزە مرۆییـەكان بـە ئامـاژەیـەك بـۆ تـورەیی[1] كۆتـایی پـێ دەهێنم، لـە روانگـەی ئـەوەوە تـورەیی دەتوانـێ بـۆ خـودی كەسـەكە بگەڕێتـەوە، ئـەم بۆچـوونـە دواتـر لـە دەروونشـیكاری فرۆیـددا رۆڵێكـی گرنگـی گێـڕا. مــاركس دەنوســێ " شــەرم جــۆرە تورەییەكــە كــە بۆخــودی مــرۆڤ گەڕاوەتەوە. شەرمەزاربوونی تێكڕای تاكەكانی نەتەوەیـەك وەك ئەوەیە كە شێرێك پەلاماری نێچیرەكەی بدات".

بەشی ماركس لەدەروونناسی قووڵی هومانیستێك بەبێ زانیاری لـە تێگەیشـتنی ئەولـە "ئاگـایی[2] (شـعور) ومەبەسـتەكەی لـە رۆڵـی وشـیار بــوون بــە باشــی ناناسـرێت. وەســف كردنــی كلاسـیكی ئەولــە " ئایدولۆژیای ئەڵمانی "دا بەم شێوەیە: "ئاگاهی چۆنایەتی ژیان دیـاری ناكـات، بـەڵكو ژیـان ئاگـاهی دەخوڵقێنێـت." مـاركس هـەر وەهـا لـە پێشـەكییەكی خۆیـدا بۆ "رەخنەیـەك لـە ئابووری سیاسـی" دەنوسـێ:"

---

[1]. Rage

[2]. Consciousness

ئاگاهی خەڵك ئەزموونەکانی ئەوان دیاری ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە بوونی کۆمەڵایەتی خەڵك ئاگاهی دەخولقێنێت." ئەوەی کە مارکس لە ڕەستەی یەکەمی خۆیدا بەناوی ژیان ناوی دەبات لە ڕەستەی دوهەمدا بە"بوون" ناوی دەبات. لە بەردەوامی ئەو نەریتەدا کە سپینوزا یەکێك لە شرۆڤە کەرە گەورەکانی بوو ٥٠ ساڵ دواتر لە لایەنی فرۆیدەوە گەیشتە لوتکەی خۆی، مارکس هێرش دەکاتە سەر ئەم بیروبڕوا باوەی کە دەڵێ ئاگاهی سەرچاوەی کۆتایی وچۆنایەتی تێکڕای ژیانی مەعنەویە. مارکس، قووڵتر لە فرۆید، دەیبینی کە ئاگاهی بەرهەمی ئەزموونێکی تایبەتە لە ژیاندا کە ئاماژە بە تایبەتمەندی کۆمەڵگاویان تۆێژیکی دیاریکراو دەکات کە " دەستپێکی بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتییە"، وەك زمان "لە پێویستی بۆ گرێدانی پەیوەندی لە گەڵ هاورەگەزەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. لە حاڵێکدا کە مرۆف وادەزانێ فیکرەکانی بڕیاردەر و پاڵنەری ئەوەن، بەڵام لە ڕاستیدا پاڵنەر ئەوهێزانەیە کە خودی مرۆڤ ئاگای لێیان نییە." مارکس پێشتر لە دەستەواژەی **"سەرکوت کردن"** لە پەیوەندی لە گەڵ چەپاندنی "خواستە بەناوبانگە سروشتیەکان" کەڵکی وەرگرتبو، بەڵام لە " ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی " ڕۆزا لوگزامبورگ بە بێ پەردە باس لە دولایەنە بوونی نێوان ئاگاهی ونائاگاهی (وشیاری وناوشیاری) لە ئەندێشەی مارکسدا دەکات. ئەولە وتارێکی تێروتەسەلدا سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی وەك خولقێنەری ئاگاهی دەنوسێ: " ناوشیاری پێشتر لە وشیارییە، لۆژیکی پرۆسەی پێش لە لۆژیکی زەینی مرۆڤە کە لە پروسەی مێژووییدا بەشداری دەکات. لە کۆمەڵگای چینایەتیدا

وشیاری مـرۆڤ بـه ناچـاری وشـیارییەکی درۆینەیـه،(ئایـدۆلۆژیا) کـه چوونکه به بۆنەی ناکۆکییـەکانی کۆمـەڵگاوه، وروژاندەکان راستـەقینەو عاقلانـه نـین، لـەم روەوه روالـەتێکی عاقلانـه بـه کارەکـانی مـرۆڤ دەبەخشن.

تێگەیشتن وبۆچوونی مارکس له ئاگاهی وئایدۆلۆژیا دەمانباته نێو یەکێك لـه گرنگترین بەشـەکانی تیـوری شۆڕشگەرانەی ئـەو. مـارکس لـه نامەیەکدا لـه سپتەمبەری ١٨٤٣ ئاگـاهی بـه شێوەیه پێناسـه دەکـات:" ئەو شتەی که دونیا دەبێ هەستی پێبکات وقەبوڵی بکات، هەرچەندکه نەیـــەوێت... لـــەم روەوەدەبـــێ دروشمـــی ئێمـــه ئەمـــه بێـــت: چاکسـازیوگۆڕانکاری لـه ئاگاهیـدا، نـه بـه بۆچـوونی دوگـم، بەڵکوبـه لێکدانـەوەی ئاگـاهی نهێنـی، چـه لێکدانـەوەی ئـاینی بێـت یـا خـود سیاسی". له ناو بردنی خەیاڵو وەهمەکانولێکدانەوەی ئاگاهی _ واته ئاگـاهی لـه راسـتی، کـه مـرۆڤ ئاگـاهی لێ نییـه مـەرجی گۆڕانکـاری کۆمەلایەتییـه. مـارکس ئـەم چۆنایەتییەی بەشێوەیەکی جـوان وەسـف کـردوه:" مـرۆڤ دەبـێ چـۆنایەتییه "بەسـتوەکان" بـه گـوتنی هەنـدێك گۆرانی تایبـەت بهێنێتـه سـەما، یـان"پێویسـتی بـەلاوەنانی خەیاڵـەکان سەبارەت به بارودۆخی خۆ، وازهێنـان لـه هەلومەرجێکه کـه پێویسـتی به خەیاڵهەیـه. مرۆڤێك کـه وشیار بوەتـەوه دەبـێ بێهێوا ببێتـەوه تـا بتوانێ به دەوری خۆیدا، بەدەربڕینێکی باشتر بەدەوری هەتاوی راسـتی خـۆدا بسـۆڕێتەوه.... ) لـه ڕوانگـەی مارکسـەوه ئاگـاهی لـه راسـتی وەك کلیلـی گۆڕانکـاری، یـەکێك لـه مەرجـەکانی پـێش کـەوتنو شۆڕشـی کۆمەلایەتییه، به هەمان شێوه که ئەم مەرجه لـه ڕوانگـەی فرۆیدیشـەوه

یەکێك لە مەرجەکانی چارە سەرکردنی نەخۆشە دەروونیەکانە. مارکس کە بایەخێکی ئەوتۆی بە چارەسەری تاك نەدەدا، باسی ئاگاهی وەك مەرجی گۆڕانکاری تاك نەکردوە. بەڵام بە چاوخشاندنێك بە تێکڕای سیستەمی دەروونناسی ئەو، بەوشێوەیە کەمن هەوڵم داوە لێرەدا بیخەمە روو، گرێدانی پەیوەندی نێوان دەروونناسی مارکس وبابەتە باس کراوەکان دژوار نییە[1]

بە بڕوای من هەرکە ناوەندی سرنجی مارکس – مرۆڤ – ناسرا بەشی ئەویش لە دەروونناسیدا کە تائێستا نکۆڵی لێکراوە، روون دەبێتەوە.

[1] "مەبەستی مارکس لە مرۆڤ" لە ئەو پەڕی زەنجیرەکانی بیرکردنەوە دا بە تێرو تەسەلی باسم کردوە

# ٤-بەرنامەرێژی هۆمانسیتێك [1]

لە توێژینەوە سەبارەت بە ناوچەکانی هاو ئاراستەیی لە نێوان بەرنامە رێژی بازرگانی و بەرنامەرێژی دەوڵەتی بە باشی بۆمان دەردەکەوێت کە بابەتە کە لە لایەکەوە هاوئاراستەیی لە نێوان دەروونناسی وفەلسەفەی کۆمەڵایەتی ولە لایەکی ترەوە لە نێوان بەرێوەبەری و بەرنامە رێژیش لە خۆ دەگرێت. ئەم نمونەیەی هاوئاراستەیی دو چوارچێوەی گرنگ لە خۆ دەگرێت، یەکەمینیان کە روون وئاشکرایە، کاری دەروونناسی پیشەسازییە. ڕەنگە گرنگترین هەنگاو کە دەتوانین بڵێن بنەڕەتی تێکڕای کارەکانی دیکە بوون لە لایەن "ئاڵتون مایو"[2] بە تاقی کردنەوەیەکی بەناوبانگ لە کارگەی جەنراڵ ئیلکتریك هەڵگیرا، ئەولەو کارگەیەدا لە سەر کاریگەری شێوازە جۆراوجۆرە بەرهەم دارەکان لە بەرێوە بەری و کرێکاریدا لێکوڵینەوەی ئەنجامدا. مایو کرێکارانی ژنی تازە کاروناشی هەڵبژارد و ساعەتی حەسانەوە بەدەم کارەوە و نیازەکانی دیکەی بەرز کردەوە ودەرئەنجام قازانجی کارەکە زیادی کرد. دواتر تێکڕای نیازە بە کارهاتووەکانی بەلاوەنا، بەلام دیسان بەرهەم هێنان زیادی کرد. بە ناچاری ئەم

---

[1] ئەم وتارە لە کۆبوونەوەی Tims لۆسئانجیلیس لە ١٩٦٨دا خوێندراوەتەوە

[2] .Eiton mayo

بیروکەیەی تێدا پەروەردە بوو کە بیرۆکەی بیرمەندێکی گەورە بوو_ کە تەنها ئەو پاڵنەرانەی کە باسمان کردن هۆکاری زیاد بوونی ئاستی بەرهەم هێنان نین، ئامادە نەبوونی کرێکارەکان کەم دەکەنەوەو وپەیوەندی مرۆیی ودوستانە لە نێوان کرێکارەکاندا زیاتر دەکەن، بەڵکو هۆکارێکی دیکەش بوونی هەیە _ **دروست کردنی حەزوبایەخ بۆ کاری پێسپێرودرا**. ئەو کرێکارانە بە بایەخ وچالاکی زۆرەوە کاریان دەکرد، ولەو تاقی کردنەوەیە کە لەو کۆمپانیایەدا هەیانبوو ولەئامانجە کەیان ئاگاداربوون. لەم روەوە بۆ یەکەم جار بارۆدوخی میکانیکی، تیکراری و بێزارکەری کار ببوبە چۆنایەتییەك کە حەزوبایەخی کرێکارەکانی بە لای خۆیدا ڕادەکێشا. ولە راستیدا ئەم چۆنایەتییە بووبە هۆی زیادبوونی بەرهەم هێنان. تاقی کردنەوەکەی مایو ئەم بنەمایەی سەلماند کە حەز کردن لە کار پاڵنەرێکی بەهێزە، پەیوەندی بە وروژێنەری پارەییەوە نییە.

دەروونناسانی پیشەسازی دوای مایو_ وەك لیکرت، مەك گرگۆر، وایت وکەسانی دیکە_ هەندێك شتی تازەیان بە دۆزینەوەکانی ئەو زیاد کرد. رەنگە مەك گرگۆر هەندێك دەرئەنجامی ڕادیکاڵتری بە دەست هێنابێت، ئەو دوپاتی دەکاتەوە کە نە تەنها دامرکاندنی "خۆ" ـ واتە لە خۆبایی بوونی تایبەتی و ڕێز دانان بۆ خۆ ـ بەڵکو ئەوەی کە "کنت گوڵداشتاین" لە دەروونناسی نوێدا بە ناوی "خۆ ـ دەستەبەرکردنی" ناوزەدی کردوە لە بەرز بوونەوەی ئاستی بەرهەم هێنانەدا گرنگ و کاریگەرە.

بەڵام نابێ لە بیرمان بچێت کە تێکرای توێژینەوە ئەنجامدراوەکان ئەم پرسیارەیان بە دواوەیە: "چۆن دەتوانین بە مەبەستی زیادکردنی بەرهەم هێنان خەڵك بوروژێنین؟". یان "ئامرازەکانی (مرۆڤ وەك مەواد) چۆن بە کار بهێنین تا کارێکی سود بەخشتر لە ماشێن وەربگرین؟". ڕەستەیەکی دیکە سەبارەت بەم پرسیارانە بوونی هەیە کە ناونیشانی کتێبەکەی پرۆفیسۆر مایویە: "پرسی مرۆیی پیشەسازی". ئەو دەیتوانی ناوی کتێبەکەی بکاتە "پرسی پیشە سازی مرۆڤ" بەڵام ئەم کارەی نەکردوە. بەڵام پرسیاری جیدی ئەمەیە : "ئامانجی باڵا کێیە یان چییە، وکێ یان چی ئامرازە؟ " وادیارە کە لە دەروونناسی پیشە سازیدا ئامانج سود بەخشی کار وکامڵبوونی مرۆڤە وئەوەی کە شایستەی مرۆڤە، ئامرازی گەیشتن بەم ئامانجەیە. لە راستیدا زۆربەی دەروونناسانی پیشەسازی لەو بڕوایەدان کە پێشتر جۆرە هاوئاهانگییەك لە نێوان مرۆڤ وحەزە پیشەییەکاندا بوونی هەیە، هاو ئاهەنگییەك کە هەر چییەك تێیدا بۆ مرۆڤ سودبەخش بێت بۆ پیشەسازیش سودبەخشە . بە بڕوای من ئەم پرسە تا ڕادەیەك راستە، بەڵام دەبێ لە خۆمان پرسیار بکەین :" ئەگەر وا نەبێت دەبێ چی بکەین؟" بۆچوونی ئێمە سەبارەت بەم ڕەستەی کتێبی پیرۆزە چییە؟ " ئەگەر مرۆڤ هەموو دونیا وە چەنگ بخات بەڵام ڕۆحی خۆی لە دەست بدات چە قازانجێکی کردوە؟" ئەو ئایەتە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت " ومرۆڤ چی هەیە کە لە هەمبەر ڕۆحی پێشکەشی بکات؟" هەڵبەت وڵام ئەمەیە کە ڕۆح ناگۆڕدرێتەوە".

سەرەڕای ئەو کارە بە نرخەی کە دەروونناسی پیشەسازی ئەنجامی داوە، بە بڕوای من لەم بارەیەوە لێڵی ونادیاری خولقاندوە. گریمان پێشتر لە نێوان حەزە هەمیشەییەکان وبەرزترین بەرژەوەندی مرۆڤ، هاوئاهەنگی هەبووبێت، ئەم پرسیارە سەرەکییە نەخراوەتە روو:" ئەوەی شایستەی بایەخ وحەزی راستەقینەی ئێمەیە چییە؟" ئایا بە پلەی یەکەم حەز لە گەشەی مرۆڤ دەکەین یان ئەوەی جێگەی بایەخ وحەزی ئێمەیە، بەرهەمهێنان، ماشێن (مەکینە) یان رێکخراوە؟"

ناچارین چاوێك بەم ناکۆکییە مشت ومڕ هێنەرەدا بخشێنینەوە. بنەمای کەلتووری ئێمە ( ئەمریکا) نەریتە یەهودی ومەسیحییەکانەو ئێمە بە بیرو بڕوا بە دە فەرمان ویاسای زێڕین پەروەردە دەبین. بەلام لە پراکتیکدا دەبینین کە هەر کەسێك کە ئەم دوو یاسایەی جێ بە جێ کردوە تووشی شکست هاتووە . هەڵبەت بێ جگە لە چەند نموونەیەکی تایبەت، ولە هەندێك نموونەی سنووردار ودیاریکراودا ، تێکەلاو کردنێکی لانی زۆری سەرکەوتن وجێ بە جێ کردنی یاسا ئاکارییەکان دژوارە. من وتار بێژ وخەتیب نیم، بەلام دەروونناسێك بە ئاسانی دەبینێت کە ئەم کەلەبەرە لە ناخی ئێمەدا زیانی زۆری لێدەکەوێتەوە. مرۆڤێك کە بەم " کەلەبەرەوە" دەژی رێز بۆ هەندێك بەها دادەنێت، بەلام بە گوێرەی هەندێك بەها هەڵس وکەوت دەکات کە پێچەوانەی ئەو بەهایانەیە کە رێزیان لێدەگرێت، وتووشی هەست بە تاوانێك دەبێت کە هێزەکانی لە ناو دەبات و ناچاری دەکات هەڵوێستی بەرگری کردن وەربگرێت وبە زۆری ناچاری دەکات هەست بە تاوانی خۆ بۆ کەسێکی دیکە بگوێزێتەوە. لەم رووەوە دەبێ دان بەو ناکوکییەدا بنێن کە لە

ژیانی ئێمەدا بوونی هەیە. ئایا فەرمانەکانی ئینجیلی مەتا جێبە جێ دەکەین یان ئەم بنەمایەکە:" ئامانجی کۆششەکانی ئێمە گەشەو سودوەرگرتن لە تەکنولۆژی ئابووری ئێمەیە؟".

سرنجێکی وردبینانەی دیکەش لە دەروونناسی پیشەیدا پێویستە: دەروونناسی پیشەسازیش وەك دەروونناسییە ئاکادمێکەکانی دیکە هەڵس وکەوت گەرایە، بە پێچەوانەی دەروونناسی قووڵ کە چوارچێوەی کارەکەی "من"ە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا هەوڵ دەدەم کە گرنگی و هۆکاری ئەم ناکۆکییە لە لایەنی کاری شێوازەکانی دەروونناسی لە بەرێوەبەری و بەرنامە رێژیدا شرۆڤە بکەم.

دوهەمین و بنەڕەتیرین خاڵ لە هاو ئاراستەیی نێوان دەروونناسی و زانستی، بەرێوەبەری هاو ئاراستەیی نێوان دەروونناسی کۆمەڵایەتی شیکردنەوەیی و ئەو بۆچوونانەیە کە لە فەلسەفەی بەرێوەبەریدا بەیان کراوە، بە تایبەت لە نوسراوەکانی ئوزبەك خان و چرچمەن. ئەم پرسیارە یان کە زۆر شەفاف و بێ پەردەخستوە روو: "بەرنامەرێژی ئێمە بۆچە مەبەستێکە؟ بەهاکانی بەرنامە رێژی ئێمە چییە؟ و دوپاتی دەکەنەوە کە ئێمە دەبێ لەو نەرێت و بەهایانە ئاگاداربین کە تێکڕای بەرنامە رێژییەکانی ئێمە بەر لەوەی باسی بەرنامە رێژی ستراتیژی، یان تەنانەت تاکتیکی بکەین، دیاری دەکەن.

لە پەیوەندییەکی نزیك لە گەڵ ئەو پرسیارەدا، پرسیارێکی بنەڕەتی دیکە بوونی هەیە: "مەبەستی ئێمە لە بەرنامە رێژی چییە؟" ئایا مەبەست جێ بە جێ کردنی پرۆژەیەکی دیاریکرا، بەریزبەندییەکی

دیاریکراوە یان بە شێوەیەکە کە ئۆزبەك خان گوتویەتی مەبەست "ئێرادە یان مەبەستێك لە داهاتوویە؟" بۆ نمونە رۆڵی ئەم دواییانەی کومپیوتەر لە هەڵبژاردنی هاوسەر لە چاوبگرن. ئایا ئەو بووکەی کە لەم رێگەوە هەڵبژێردراوە، دەبێ بڵێ "بەرنامەی ئێمە ئەوەیە کە مانگێکی دیکە زەواج بکەین" یان بڵێ بەگوێرەی ئەو بەرنامەیە کە کومپیوتەر بۆ ئێمەی داناوە مانگی داهاتوو زەواج دەکەین". بە بڕوای من، لە راستیدا ئەم پرسیارە نە تەنها بۆ پەیوەندی بەو جووتە بەختەوەر و یان بەدبەختەوە هەیە، بەڵکو تێکڕای چەمکەکانی بەرنامەرێژی کۆمەڵگای ئێمە لە خۆ دەگرێت. ئایا بە راستی ئێمە بەرنامە دادەرێژین یان بنەمایەك کە پرسیارێك لە چۆنییەتییەکەی ناکەین و بەرپرسیارەتییەکەمان سەبارەت بەوە نییە، بۆ ئێمە بەرنامە دادەنێت.

ئەو بنەمایانەی کە بنەڕەتی بەرنامە رێژی ئێمەن کەمانەن؟ وادیارە کە یەکێك لە نەریتەکانی بەرنامە رێژی کە کۆمەڵگای تەکنۆلۆژیکی ئێمە دایناوە: **هەر کارێك کە لە لایەنی تەکنیکییەوە ئەنجامدانی مومکینە، دەبێ ئەنجام بدرێت**[1]

ئەم بنەما بەهاییە تەکنولۆژیکیە بەم واتایە دێت کە بۆ نمونە ئەگەر دەتوانین بۆ مانگ سەفەر بکەین دەبێ بە بێ هات و هاوار و بێ دەنگی ئەم سەفەرە ئەنجام بدەین. ئەگەر دەتوانین چەکی وێرانکەرتر دروست بکەن، دەبێ دروستی بکەین. لەم دیمەنەدا دەرفەتی فەنی و هونەری

---

[1] lew is mum ford بەر لە من و ئوزبەك خان ئەم بابەتەی خستوەتە روو.

دەبێتە سەرچاوەی تێکڕای ڕێزەبەندی بەهاکان. ئەگەر لە راستیدا، نەریت، ئەنجامی هەر کارێکی تەکنیکی بێت، کەواتە نەریتە دینی و ئاکارییەکان بەلاوە نراون. نەریتە رۆحانییەکانی ئێمە ئەمە بوو کارێك کە بۆ مرۆڤ سود بەخشە، یان دروستە، یان جوانە، یان گەشەو بەختەوەری مرۆڤی لێدەکەوێتەوە دەبێ ئەنجامبدرێت. ئەگەر سیستەمی ئەو نەریتانەی کە تەنها سود بەخشن قەبوڵ بکەین دەبێ هەر شتێك کە لە لایەنی تەکنیکییەوە ئەنجامدانی مومکینە، ئەنجامی بدەین. لەم حاڵەتەدا هەرچەند بە شێوەیەکی زارەکی بەرێزوە باسی سیستەمە نەریتیەکانی خۆمان دەکەین، بەلاّم لە راستیدا، بەلاوە نراون، هەڵبەت ئەم گریمانە تەکنولۆژیکییە کە "هەرکارێك کە لە لایەنی تەکنیکیەوە ئەنجامدانی مومکینە، دەبێ ئەنجام بدرێت" نەریتێکی شەفاف، کە ئێمە وەك بنەمایەکی بەها ئاگامان لێ بێت، نییە. بەلاّم شێوازی کاری ئێمە دیاری دەکات، لە حاڵێکدا کە ئێمە لەهەستی خۆماندا بە نەریتەکانی یەهودی ـ مەسیحی وەفادار ماوینەتەوە.

کەواتە ئایا روو بە رووی پێکدادانی حاشاهەڵنەگری نەریتەکانی هۆمانیزم و فەرمانەکانی پیشکەوتنی تەکنولۆژێکی بوینەتەوە؟ بە خۆشحاڵییەوە دەرفەتێکی سێهەمیش بۆ سیستەمی بەهاکان بوونی هەیە، نە دەرفەتێك بە گوێرەی ئیلهام، بەڵکو لە سەربنەمای ناسینی ئێمە لە سروشتی مرۆڤ. بنەمای سیستەمی بەهاکان لە سەر ئەم گریمانەیە کە دەرفەتی دیاری کردنی ئەوەی بۆ مرۆڤ باش و یا خود خراپە بوونی هەیە بەو مەرجەی کە سروشتی مرۆڤ بناسین. لێرەدا مەبەست لە "باش یان خراپ" خواستەکان یان ناخۆاستەکانی مرۆڤ

یان باش و خراپ بوون شتێك نییە بۆ ئاسایش و خۆشگوزەرانی مادی مرۆڤ بێت. بەڵکو مەبەست لە باش شتێکە کە دەبێتە هۆی گەشەی تەواو و کامڵ بوونی تواناکان و هێزەکانی مرۆڤ، و مرۆڤ دەگەیەنێتە گەشەی مرۆیی بەڵام بەم شێوازە دەتوانین هەندیك نەریت بە بەهای بابەتییەوە بخولقێنین، بەڵێ ئەوەی پێویستیمان بە پەنابردن بۆ ئیلهام هەبێت، و ئەم نەریتانە وەك نەریتە هاوبەشەکانی تێکڕای ئایینە هۆمانیستەکانی وەك ئیسلام، مەسیحییەت، یەهودی، بودیزم و تائوییزمە.[1] هەرچەند ناتوانم لەم وتارەدا دەرفەتی پراکتیزە بوونی ئەم نەریتانە نیشان بدەم، بەڵام چەندین تێبینی پێ زیاد دەکەم کە ڕەنگە لە نێوان چەمکە بەکارهاتووەکان لە ئانالیزی سیستەمەکان و دەروون شیکاریدا پەیوەندییەك گرێ بدات.

مرۆڤ سیستەمێکە ـ وەك سیستەمە سیاسیەکان و یا خود ئوکولۆژییەکان، سیستەمی جەستیە یان سیستەمی خانە یان کۆمەڵگا و ڕێکخراو. لە شرۆڤە کردنی " سیستەمی مرۆڤ"دا بۆمان دەردەکەوێت کە لە گەڵ سیستەمێکی هێزەکاندا دەستە و یەخەین نەك لە گەڵ بونیادێکی میکانیکی بەشە بچوکە ڕەفتارییەکان وەك سیستەمەکانی دیکە. لە ناخی سیستەمی مرۆڤدا گرێدان و پێکەوە بوونێکی گەورە بوونی هەیە و لە هەمبەر گۆڕانکاری خۆڕاگرییەکی توند نیشان دەدات. دیسان گۆڕانکاری لە بەشێکدا کە "هۆکاری" نەخوازراوی گۆڕانکاری لە بەشێکیتر دایە، گۆڕانکاری تێکڕای سیستەمی لێناکەوێتەوە.

---

[1] ئەم سیستەمەی ئاکاری هۆمانیستیم لە کتێبی "مرۆڤ بۆ خۆ"دا شرۆڤە کردوە.

دژواری تێگەیشتن لە "سیستەمی مرۆڤ" لە دو لایەن دا شاراوەیە. گرفتی یەکەم هەمان گرفتی چەمکی سیستەمی ئەندێشە بە شێوەی هەستی گشتییە. گرفتی دوهەم لەم راستییەدایە کە زۆربەی خەڵك تیوری هەبوونی هەندێك هێز لە پشت هەڵس‌وکەوتی رواڵەتییەوە بە ئاسانی قەبووڵ ناکەن. نموونەیەکی سادە دەهێنمەوە: ئەگەر کەسێك ببینین کە بە روخسارێکی سورۆبوو هاوار دەکات، ئەڵێین " تورەیە" بۆچوونەکەی ئێوە راستە. بەڵام ئەگەر بە وردی لە سیستەمەکەی بروانن رەنگە بڵێن " ئەم کابرایە ترساوە" ودیسان ئەگەر وردتر سەیر بکەن رەنگە بەم ئەنجامە بگەن کە "ئەم کابرایە داماوە". هەرسێ بۆچوونەکە راستن، بەڵام ئێمە لێرەدا لە گەڵ پلەیەکی گۆڕاو لە ریژەیی بوون دەستەو یەخەین، چوونکە ئەم بۆچوونە کە ئەم کابرایە داماوە لە راستی سەرەکی ئەو کارەی کە من پێیەوە سەرقاڵم نزیکترە، بەڵام ئەگەر بە تورەیی سەیری بکەم رواڵەتی پرسەکەم لە بەرچاوە گرتووە.

بە زۆری هێزە پاڵنەرەکان ناوشیارن. بۆ نموونە فەرمانبەرێك لە کیوسکی پۆستەدا دانیشتوە، کوت ومت کاتژمێر ٦ی دوای نیوەڕۆیە(کاتی کۆتایی هاتنی دەوام ) وسەرەڕای ئەوەی هێشتا سێ کەس چاوەڕوانی ئەون ( تا کارەکانیان رایی بکات) ئەو کیوسکە دادەخات. ئەگەر چاودێرێکی باش بن، نیشانەی رازی بوون لە نێوچاوانیدا دەبینن کە چۆن سێ کەسی ناچار کردوە بە بێ ئەوەی بتوانن پوول(Timbr) بکڕن پۆستە خانەکە بە جێ بهێڵن. ئەو خۆی لەم پرسە ئاگادار نییە، بەڵام ئەم دیمەنە ئاگادارت دەکاتەوە کە لە پێگە یەکی زۆر جیاوازدا، لە رژێمێکی تیرۆر وتۆقاندا، ڕەنگە ئەم کەسە

ئەشــکەنجەکەرێکی ساديســتی لــێ دەربچــێت. ڕەنگــە خواســتی سادیستیك لە پێگەیەکدا کە ڕێگەی پێبدرێت خۆی ئاشکرا بکات،وبە روونــی ســەرهەڵبدات. لێرەشــدا بۆمــان دەردەکــەوێت کــە هێزێــك، وەك خواستی سادیستیك، بوونی هەیە کە لە کار یا خود هەستدا ئاشکراو بەر چاو نییە، بەڵام ڕەنگە لە هەل‌ومەرجێکی تایبەتدا ببێتە هێزێکی بە هێز لە سیستەمی تاکدا.

تــوخمێکی دیکــە لــە شــرۆڤەی" سیســتەمی مرۆڤــدا" پێشــبینی کردنیــەتی. واباشــترە پێــی بڵــێن" کاراکتــەر"تــا "سیســتەمی مــرۆڤ " چــوونکە هــەموان لــەوەی کــە پێــدەگوترێت " کاراکتــەر" هاوبەشــین. تەنانەت ئەو کەسانەش کە لە دەروونناسیدا پسپۆڕ نین بە ئەزموون بۆیــان دەرکــەوتوە کــە کاراکتــەری تــاك لــە گــەڵ هەڵس‌وکەوتــە رواڵەتییەکەی و ئەوەی سەبارەت بە خۆی بیری لێدەکاتەوە یەك نین. ڕەنگە سەبارەت بە خەڵك داوەری بکەین، ئەم داوەرییــە بە گوێرەی ئەو کــارە نییــە کــە لــەو کاتــەدا ئەو کابرایــە ئــەنجامی دەدات، بــەڵکوو ئەو هێزانە هەڵدەسەنگێنین کە بە زیرەکی بۆی دەرکەوتووە ولەو بڕوایەدایە کە لە کاتی پێویستدا خۆی دەردەخات. تەنانەت سەرەڕای ئەو ناسینە زۆرەی کــە ڕەنگــە بــە دەســت هاتبێــت، نــاتوانین بــە جیدیەتــەوە هەڵس‌وکــەوتی داهاتووی کەسێك پێشبینی بکــەین، بەڵکوو ئــەم کــارە تــەنها لــە ئاســتی ئەگــەردا مومکینــە. بــەڵام بــە دڵنیاییــەکی زیــاترەوە دەتــوانین هــەڵس وکــەوتی جــەماوەر پێشــبینی بکــەین بــەو مەرجــەی کــە بونیادی کاراکتەری گشتی تێکڕای کەسانی گروپ بۆ ئێمە روون بێت.

لە پەراوێزی ئەم بابەتە دا پێویستە بڵێم کە لە ساڵی ١٩٣٢ ئێمە حەزمان کرد بزانین ئەگەر هیتلەر بێتە سەر حوکم پەرچەکرداری کرێکار وفەرمانبەران چۆن دەبێت؟ بیرو بۆچوون وخواستەکانی ئەوانمان تا رادەیەك لە بەر دەستدا بوو، لە سەداسەد دژی نازیزم بوون، بەڵام لەو بڕوایەدا بووین کە ئەو پەرچەکردارە کە نیشانی دەدەن گرێدراوی هێزی رێژەیی هێزە دەسەڵاتگەرا و نادەسەڵاتگەراکانە لە بونیادی کارەکتەری ئەو توێژەدا، کە یان دژی هیتلەر خەبات دەکەن ویا خود بەرەو نازیزم رادەکێشرێن، یان تەنها سەرقاڵی ژیانی خۆیان دەبن بە بێ ئەوەی دوژمنێکی جیدی یان دۆستێکی گەرم‌وگوڕی هیتلەر بن. ئێمە دەمانتوانی بە شێوەیەکی گریمانەیی رێژەی ئەو کەسانەی کە یەکێك لەو سێ شێوازە دەگرنە بەر بە شرۆڤەکردنێك بونیادی کاراکتەری گروپەکان پێش بینی بکەین، پێش بینییەکەی ئێمە دواتر لە گەڵ راستیدا هاوئاهەنگ بوو.

تیوری سەرەکی من ئەمەیە کە شیکردنەوەی "سیستەمی مرۆڤ" دەبێ بەشێکی جیانە بووی شیکردنەوەی سیستەمی کڕین‌وفرۆش لە گەڵ سیستەمی کۆمەڵگادا بێت، بە دەربڕینێکیتر بەشێك لە زانستی مرۆیی یان زانستی بە رێوە بەری بێت. تەنانەت ئەگەر دەرفەتی دروست بوونی بەهای برەوداری بابەتی لە سەربنەمای زانستی مرۆیی قەبوڵ نەکەین، دیسانیش ئەم راستییە لە جێگای خۆیدایە کە ئێمە لە چۆنیەتی بەرنامەرێژی خۆمان بێ‌خەبەرین، مەگەر "سیستەمی مرۆڤ" بناسین ولەگەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتی ورێکخراوەی تێکەڵی بکەین. ئەگەر وانەبێت روبەروی شیکردنەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی دەبینەوە

بەبێ‌ئەوەی یەکێك لە سیستەمە لاوەکییە گرنگەکانی حەسێب بکەین. دیسان دوای ئەوە لە"سیستەمی مرۆڤ " تێگەیشتین، ڕەنگە گرفتی پرسەکە، دیاری کردنی بەها گشتی وبرەودارو بابەتیەکان تاڕادەیەك گرنگی خۆیان لەدەست بدەن.

بەسرنج دان بەم پرسانە ئێمە دەتوانین بۆئەم پرسیارە وڵامێکی گشتی بدۆزینەوە، هەرچەند کە وڵامێکی تایبەت بەگوێرەی برەو وبەهای سیستەمی ئاکاری عەقڵی مومکین نەبێت. پرسیار ئەمەیە: "سیستەمێکی دیاریکراوی بەڕێوەبەری دەتوانێ چەکارێك بۆمرۆڤ ئەنجامبدات ؟ "لەگەڵ ئاگادار بوونەوەمان لە دەرئەنجامەکانی بەرنامەرێژی خۆمان بۆ مرۆڤ، دەتوانین بڕیاربدەین کە ئایا بەگوێرەی ئەم دەرئەنجامانە ئامانجێکی بەرنامە رێژی بەلامانەوە گرنگە یان شێوازێکی بەڕێوەبەری لە بەراورد لە گەڵ شێوازێکی دیکەدا. تەنها لە ڕێگەی توێژینەوە لە " سیستەمی مرۆڤ " لە نێو سیستەمی کۆمەڵایەتی کە بەرنامە رێژی ئاماژەی پێدەکات دەتوانین لەم دەرئەنجامانە تێبگەین - ئەمە خاڵێکی گرنگە - بەبێ هەبوونی زانیاری سەبارەت بە مرۆڤ تەنها بیر لەوە دەرئەنجامانە دەکەینەوە کەئەو شێوازانەی کە ئێمە حەزیان لێدەکەین ، بەڵام ڕاستە قینە نین، پاساودەدات . لە هەر حاڵدا خاڵی گرنگ ئەمەیە کە نابێ خۆمان بەم پرسیارەوە سنوردار بکەینەوە: "دەرئەنجامەکانی ئەو لە گەڵ بەڕێوە بردنی ٧یان٨ ساعەت کار بۆ هەڵس‌وکەوتی مرۆڤ چییە؟" بەڵکو دیسانیش دەبێ پرسیار بکەینەوە:" دەرئەنجامەکانی ئەو بەرنامەرێژییە بۆ هەڵس‌وکەوتی مرۆڤ لە دەرەوەی پێگەی کارکردنەوەچییە؟ "

نمونەیەکی دیاری کراو لە بەرچاو بگرین:" کرێکارێك بە کارێکی تیکراریـیـەوە( لـە ئـەمریکا). ئـەم کەسـە بێزارونارەحـەت و توڕەیەولـە کارەکەی هیچ چێژێك وەرناگرێت، بەڵام ئـەم نـەبوونی چێژە لـە کار بـەو بەکارهێنانەی کە لە کاتی حەسانەوەوپشوی کۆتایی حەفتە دا ئەنجامی دەدات قەرەبوو دەبێتەوە. بەڵام بەکار هێنـانیش هەنـدێك سنووری هەیە کە ئازاراوییں. ئەم کرێکارە لـە جیهانێکدا دەژی کـە دەتوانـێ ڕێژەیـەکی سنوردار لـە کاڵا ڕێکلام کراوەکـان بـەکار بهێنێت. سـەرەڕای سـتانداری باڵای ژیانی، لە بەراورد لـە گـەڵ کرێکارەکانی شـوێنەکانی جیهانـدا، لە بـەکار هێنانـدا سـنوردار کراوەتـەوە. لـە قورسـی بـاری بـاج، لـە جیرانـی ڕەش پێسـت ویان لـە ترسـی لـە دەسـت دانـی کارەکـەی گازنـدە دەکـات ونیگەرانـە. ئـەم نارەحـەتی وتـوڕەیی ئـەوە چـە کاریگـەرییـەك لـە سـەر پەیوەندییەکـەی لـە گـەڵ هاوسـەرومنداڵەکانیدا دادەنێت ؟ ئەرکـەکانی وەك هاووڵاتییـەك چـۆن ڕادەپـەڕێنێت؟ ئایـا ناکەوێتـە داوی فریـودانی خەڵکەوە تا لە نارەحەتییەکانی ئەو بۆ دابین کردنـی ئەو مەبەستانەی کە بەهیچ شێوەیەك لە گەڵ بەرژەوەندی کرێکارەکانـدا نایەتـەوە کـەڵك وەربگرن؟ ئەوەی دەمەوێت بە شێوەیەکی ساف وسادە بیڵێم ئەمەیـە کە ڕەنگـە لـەو سیسـتەمە کارییـەدا کـە بـە ڕواڵـەت سـەرکەوتوانە ئـەنجامی دەدەن هەندێك شتی سودبەخش بخولقێنن، بەڵام لە هەمان حاڵدا ڕەنگە هەنـدێك شـتی زیانبـەخش، چـە لـە لایـەنی تاکـەوە وچـە لـە لایـەنی کۆمەڵگـەوە، لـە ئورگـانی بـوونی مرۆڤـدا دروسـت بکـەن کـە بەرژەوەندییـەکانی هەنووکە بخاتـە بن کاریگەرییەوە و وکۆمـەڵگا لـەوە هەم لەلایەنی مادی وهـەم لە لایـەنی مەعنەوییەوە زیـان ببینێت. تـەنها

لێکۆڵینەوەیەکی شیکردنەوەیی ووشیارانە لە مرۆڤ دەتوانێ نیشانی بدات کە کاریگەرییە گشتییەکانی بەرنامەرێژی وبەرێوەبەری تا چە ئاستێکە.

هەڵبەت بە ناچاری رووبەروی چەمکێك لە نەریتەکان دەبینەوە کە لە ڕوانگەی ئەو کەسانەوە کە بە سیستەمەکانەوە سەرقاڵن بەهایەکی تایبەتی هەیە. ئەگەر پرسیاربکەن کە "کاری گونجاو" ی مرۆڤی سیستەم چییە؟ دەتوانین لە وڵامدا بڵێین کە " کاری گونجاو" بریتییە لە کامڵبوون وگەشەکردنی تێکڕای تواناکانی مرۆڤ، لانی کەمی پێکدادان وبە فیڕۆدانی هێزی ناوەکی مرۆڤ ، لە نێوان مرۆڤ ومرۆڤ ، ومرۆڤ وژینگەی ئەو".

یەك یان دوو نموونە دەتوانێ بە شێوەیەکی بەرجەستە وهەستپێکراو ئەم بنەما گشتییە روون بکاتەوە. مرۆڤ پێویستی بە نزیك بوونەوە لە کەسانی دیکە هەیە. ئەم نزیك بوونەوەیە چەندین جۆرە- بۆ نموونە نزیکی پیاوێکی فەرمانبەر لە سەرەوەی خۆی. نرخی ئەم جۆرە نزیکییە ، نەبوونی سەربەخۆیی، نەبوونی داوەری یان خواستی یاخی بوونی ناوشیار لە هەمبەر هەمان کەسی سەردەستە. ئەم جۆرەنزیکییە کە لە سەر بنەمای ملکەچ بوون وفەرمانبەرییە، لە بەردەم گەشەکردن وکامڵبوونی تاك ڕێگرە ودەبێتە هۆی سوان وولە ناو چوونی وزەو خۆشەویستی، مەبەستم لە خۆشەویستی، گەرم وگوڕی ونزیکی تەواوەتی لە نێوان دووکەسە. کە هەر دوانیان سەربەخۆیی تەواوەتی خۆیان، یان لە واتایەکی دیکەدا تاك بوونی خۆیان دەپارێزن. خۆشەویستی لە بنەڕەتدا ناکۆکی هێنەر وبە

فیرۆدەری هێز نییە، چوونکە دوو پێویستی قووڵی مرۆڤەکان پێکەوە تێکەڵ دەکات: نزیکی وسەربەخۆیی. نموونەکانی دیکە بریتین لە هاوسەنگی نێوان هێزە عەقڵی وسۆزدارییەکان، لە نێوان بنەمای لێبووردنی بێ قەید ومەرج وبنەمای بەرپرسیارەتی. گەلێك نموونەی دیکە بوونیان هەیە کە ئەم راستییە دەسەلمێنن کە چییەتی سیستەمی مرۆیی بە شێوەیەکە کە هەندێك رێگەچارەی دیاریکراوی باش وهەندێکیتریش کاری خراپی لێدەکەوێتەوە[1]. دەتوانین ئەم شێوازە بە روونی لە خەسار ناسی خەمۆکی دەروونی[2] وپەرێشانی دەروونی[3]دا ببینین. بەڵام دەبێ خەسارناسی نەریتی لە بیر بکەین، واتە ئەو کەم وکۆڕییانەی کە خاوەن مۆدێلی کەلتوورین ونیشاندەری دژکردەوەی سیستەماتیکن، چوونکە زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگا تێیدا بەشدارن بە شێوەی خەسارناسی تاقی ناکرێتەوە.

بەم زانیاریانەی ئێمە لە" سیستەمی مرۆڤ" ڕەنگە بونیادێکی کاراکتەری نموونە کە بۆ کاری باش ولانی کەمی بە فیرۆدانی وزە رێنوێنیمان بکات، بێتە کایەوە. ئەم مۆدێلە ریزبەندییە بابەتییانە بەهاگەلێکی برەودارن. لە راستیدا ئەرەستۆ وسپینوزا ئەم مۆدێلەیان دارشتوە، هەرچەند لە گەڵ ئەم مۆدێلەدا کە ئێستا باسمان کرد جیاوازە. فرۆیدیش هەرچەندە راستەوخۆ وبێ پەردە نەهاتوەتە نێو

---

[1]. Dysfunctioning

[2]. Neuroses

[3]. Psychoses

پرسی بەهاکانەوە، بەڵام نا راستەوخۆ هەندێك بەهای خولقاندوە کە بۆ گەیشتن بە کاری باش بۆ مرۆڤ زۆر یارمەتی دەرە.

کە واتە بەرنامەرێژی ، پێویستی بە تێکەڵاو کردنی " مرۆڤی سیستەم" لە سیستەمی " ئابووری – دەوڵەت-کۆمەڵگە" هەیە. ڕەنگە ئەوەی کە لە لایەنی ئابوورییەوە سودمەندە، لە لایەنی مرۆیی وکۆمەڵایەتییەوە زیانبار بێت، کە واتە دەبێ ئامادەیی ئەوەمان هەبێت کە ئامانجی کۆتایی وراستەقینەی خۆمان هەڵبژێرین: یان گەشەی تەواوەتی مرۆڤ یان لانی زۆری بەرهەمهێنان وبەکار هێنان. ئەم هەڵبژاردنە کاتێك مومکینە کە لەم باوەڕەی خۆمان دەست هەڵبگرین کە: لە کۆنەوە هاوئاهەنگییەك لە نێو ئەم دوو گەشەیە دا بوونی هەیە ویان بە زمانی ئاینی داخوازییەکانی خوا وقەیسەر چوون یەکن. گەلێك بەڵگەمان لە بەردەستدایە نیشان دەدات کە ئێمە، لە ئەمریکا وتێکڕای جیهانی پیشەسازی خۆراوا – کە لە ڕوانگەی منەوە روسیاش لە خۆ دەگرێت- گیرۆدەی قەیرانێکی قووڵین کە ئابووری نییە، بەڵکوو مرۆییە. ئێمە شاهیدی زیاد بوونی دەستدرێژی، بێزاری، نیگەرانی، ونەفرەتین وبەکار هێنانی لە رادەبەدەری ئێمە وڵامی رق وچاوچنۆکی مرۆڤ ناداتەوە.

ئایا رێگایەك بۆ دەرچوون لەم قەیرانە مرۆییە بوونی هەیە؟ واباشترە بپرسین: ئایا پێویستمان بە دروستکردنی کەموکوڕییەك لە " مرۆڤی سیستەم" بە مەبەستی دابین کردنی سیستەمێکی سودبەخشی بەڕێوەبردن وبەرهەم هێنانی ئابووری هەیە؟ یان ئایا دەبی بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی تەندروست مرۆڤ نەخۆش بخەین؟ من

گومانم لەوەدا نییە کە دەتوانین کۆمەڵگەیەکی پیشەیی بونیاد بنێن کە ناوەند و ئامانجەکەی گەشە وکامڵ بوونی مرۆڤ بێت، نەك لانی زۆری بەرهەمهێنان وبەکار هێنان. بەڵام ئەم کارە پێویستی بە گۆڕانکارییەکی ڕادیکاڵ لە بونیادی کۆمەڵگای ئێمە، لە ئامانجە هەمە لایەنەکانمان، لە ئەولەویەتەکانی بەرهەمهێنان وشێوازەکانی بەڕێوەبردنی ئێمە هەیە. ئایا ئێمە دەتوانین ئەم گۆڕانکاریانە دروست بکەین وئەدەرئەنجام لێکترازان ئاستەنگ بکەین؟ شتێکی دڵنیا ومسۆگەر لە ئارادا نییە. بەڵام چەندین هۆکار بوونیان هەیە کە هیوادارمان دەکات. یەکەم وگرنگتر ئەوەی کە ئێمە خاوەن ئامرازی مادی وتەکنیکین و ئاگاهی وشارەزایی تیوریکمان هەیە، کە واتە دەتوانین کۆمەڵگەی تەکنۆلۆژیکی بکەینە کۆمەڵگایەکی مرۆیی. دوهەم : داخوازی وخواستێکی ڕوولە زیادبوون بۆ ئەم مرۆیی کردنە بوونی هەیە، ئەم خواستە نە تەنها لە نێو " هیپییەکان" وخوێندکارانی ڕادیکاڵی زانکۆ، بەڵکو لە نێو ئەو ئەمریکایانەدا کە هێشتا نەریتە مرۆییەکانیان لە بیر نەکردوە وهێشتا ویژدانیان بێ دەنگ نەبووە، لە نێو ئەو کەسانەدا کە ئاگاهییەکی زیاتر سەبارەت بەوەی کە ژیانی ئێمە بەرەو بێزارییەکی ئازاراوی دەڕوات، بە دەستدەهێنن ، بوونی هەیە. بە بڕوای من زانیاری ڕوولە زیاد بوون لە کەم وکوڕی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی ئێمە و بەرنامەڕێژی بێ بەهای ئێمە، هۆکارێکی ڕاستەقینەی قەیرانە لە مانەوەی شارستانی ئێمەدا.

# ٥- گرێی ئودیپ
# پەراوێزێك لە سەر سەربۆردەی "هانسی بچکۆلە[1]"

لەساڵی ١٩٠٥ فرۆید" سێ نامیلکەی سەبارەت بە تیوری جنسی "خۆی بەلاو کردەوە. ئەو زانیارییانەی کە لە توێژینەوەی دەروون شیکاری کەسانی پێگەیشتو بە دەستی هێنا بوو، پێویستی زانستی ئەوی وروژاند تا متمانە و برەوی لێکۆڵینەوەکانی، بە توێژینەوەی راستە وخۆ لە ژیانی منداڵدا بسەلمێنێت. دەرئەنجام چوار ساڵ دواتر "لێك دانەوی ترس لە کوڕێکی تەمەن ٥ ساڵە[2]"ی بەلاو کردەوە، نوسراوەیەکی لێوانلێو لە خاڵی پڕ بایەخ کە بە بڕوای فرۆید رۆڵی نەخۆشی هێنەری گرێی ئودیپی دەسەلماند.

بە بڕوای فرۆید "هانس" ئودیپێکی بچوك بوو. هانسی بچوك لە خەوتن و حەمام کردن لە گەڵ دایکی چێژی وەردەگرت. لە لایەکی ترەوە وەك رکەبەرێك سەیری باوکی دەکرد. "سەرتا لە، گمونەدەن،

---

[1] ئەم وتارە لە رێکخراوی دەروونشیکاری میکزیك لە بەردەم ژمارەیەك لە مامۆستایاندا خوێندراوەتەوە.

[2] . Analysis Of Phobia Ina Five Years Old Boy

دەیەویست کە باوکی لەوان دووربێت، و دواتر لە ڤییەنا ئەم خواستە بوو بە ئارەزۆی مەرگی باوکی. ئەو ترسەی کە لە ئارەزۆی مەرگی باوکی دەستە و یەخەی هانس بوو، و دەتوانین بڵێن کە خواستێکی ئاسایی بوو، رێگری سەرەکی لە بەردەم لێك دانەوەی دەروونی ئەو منداڵە بوو، تا دوای گوت و وێژ لە عیادەکەی من ئەوترسە لە ناو چوو[1]"

لە روانگەی فرۆیدەوە ترسی هانس دەر ئەنجامی ئەو خواستە حەرامە بۆ کە لە لیبیدۆی ئەو بۆ دایکی سەچاوەی دەگرت، کە بە لە دایك بوونی خۆشکە کەی توندتر ببوو- ئەو رووداوەی کە بووە هۆی ئەوەی هانس لە لە دایکی دور بکەوێتەوە و بایەخ و سرنج دایکی بۆ ئەو کەم ببێتەوە. دەبێ نەفرەتی ئەو لە باوك وەك رکەبەرێك، ترسی ئەو لە خەساندن لە لایەن باوکییەوە وەك تۆڵەی ئارەزوی مردنی ئەو و گەڕاندنەوەی میهرەبانی، بەو بارودۆخە زیاد بکەین. هانس بە هیوایە کە باوکی بمرێت و لە خەساندن لە لایەن باوکییەوە دەترسا، نیشانەی سەمبۆلێکی ئەم ترسە، ترس لە قەپ گرتنی ئەسپە. لەم روە وە ئەو ترسەی کە لە کەوتنە خوارەوە لە ئەسب تووشی ئەم کوڕە دەبێت نیشاندەری ئارەزۆی مەرگی باوکییە. و هەوڵدانی ئەو بۆ نە دیتنی ئەسپ سەمبۆلی هەڵهاتنە لە هەر دوو ترسە کە.

سەرەڕای ئەم لۆژیکە و عاقڵانە بوونی باسەکەی فرۆید و دەوڵەمەندی بەڵگە کلینیکییەکانی هەندێك پرسیار و گومان دێنە ئاراوە. پرسیاری یەکەم: ئایا دایك و باوکی هانس، بە هەمان ئەندازە

---

[1] لە کتێبی شیکردنەوەی ترس لە کوڕێکی تەمەن ٥ساڵدا

کە فرۆید دەڵێ، لە هەڵس و کەوتی خۆیان لە گەڵ منداڵەکەیاندا ڕاستگۆن؟

"دایك و باوکی هانس لە لایەنگرانی نزیکی من بوون و خۆیان دانیان بەوە دا دەنا کە لە پەروەردە کردنی یەکەمین منداڵی خۆیاندا دیسپلین پێویستیان بۆ بە دەست هێنان و پاراستنی هەڵس و کەوتی باش و گونجاو بەکارنەهێناوە. و بۆ ئەوەی کە منداڵەکە، کوڕێکی بزیو، شاد بوو سەربەستیان کرد تا گەشە بکات و خۆی بنوێنێت، بە بێئەوەی هەڕەشەیەك لە ئارادا بێت."

و فروید درێژەی پێدا و دەڵێ:

"بە سرنج دان بەو پەروەردەیە کە دایك و باوك بە منداڵەکەیان دابوو، کە هەڵە باوەکانی پەروەردەی ئێمەی تێدا بە لاوە نرا بوو، بێگومان ئەوان هەر لەسەرەتاوە بڕیاران دابوو کە منداڵەکەیان ڕووبەڕوی گاڵتە و کونترۆڵ کردن نەبێتەوە[1]"

بەڵام ئایا ڕاستە کە دایك و باوکی هانس لانی کەمی دیسپلین و زۆریان بە کار هێناوە و لە "هەڵە کانی پەروەردەی ئاسایی ئێمە" خۆیان دورگرتوە؟ فرۆید، بیرمەندێکی گەرم گوڕ، هەمیشە زانیاری ڕاست و دروست پێش گەشی ئێمە دەکات و بەڵگەی پێویست دەکاتە ڕوو تا نیشان بدات کە هەڵسەنگاندی ئەو لە شێوازەکانی دایك و باوك دروست نییە.

١- شێوازی پەروەردەکردنی دایك و باوك قەت بێ هەڕەشە نییە. دایك بە ڕاشکاوی لە خەساندن دەیترسێنێت "ئەگەر تۆ ئەم کارە بکەیت

---

[1] هەمان سەرچاوە.

(دەست بە ئەندامی زاوزێ خۆتەوە بدەیت) دەنێرم( ئەلف) بێت و بیبڕیتەوە [1] و دیسان هەڕەشە لە منداڵەکەی دەکات کە بە جێی دەهێلێت. هانس دەڵێ "دایە گوتی ئیدی ناگەڕێمەوە.[2] "

٢: درۆ کردنیش بە شێوازەکانی پەروەردەی دایك و باوك زیاد بووە. دەبێ بڵێم کە درۆکردن لە گەڵ منداڵدا بەو شێوەیە کە دایك و باوك دەڵێن بێ زەرەر نییە. بە پلەی یەکەم درۆ کردن جۆرە گاڵتە پێکردنێکی فیلاویانەی منداڵە، بە تایبەت ئەگەر نەیتوانی لێی تێبگات-هەرچەند کە ناتوانێت دڵنیا بێت کە قسەی گەورەکان راست نییە. بە پلەی دوهەم درۆکردن لە گەڵ منداڵ شێوازێکی دیکەی بەکار هێنانی زۆرە، منداڵ هیچ شێوازێکی بۆجیاکردنەوەی درۆ لە راست لە بەر دەست دا نییە، دەبێ متمانە بە دایك و باوکی بکات و دیسان هیچ کەرەستە و ئامێر و دەرفەتێکی بۆ بەرگری کردن لە خۆ لە هەمبەر قسەی درۆ لە بەردەستدانییە. خودی فرۆید گوتویەتی کە " دایك و باوك بۆ منداڵ تەنها سەرچاوەی متمانە پێکراو و سەرچاوەی تێکڕای بیرو و بڕواکانن"

لە ڕوانگەی ئێمەوە، هانس، بەو شێوەیەکە دایکی بیری لێدەکاتەوە وڕ وکاس نییە. ئایا بە راستی منداڵ رازی بووە کە حاجی لەق لەق منداڵ دەهێنێت[3]؟ فرۆید بە ئێمە دەڵێ: "ئەوە لاسایی کردنەوە و تۆڵە کردنەوەی هانس لە باوکی بوو". وەك ئەوەی بڵێ: " ئەگەر بە راستی چاوە ڕوانی ئەوە دەکەیت کە من بڕوا بەوە بکەم کە حاجی لەق لەق لە

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە.

مـانگی ئوكتوبـەردا "هانـا"ی هێنـاوە، لـە حاڵێكـدا لـە سـەفەرەكەی گموندندا بینیم كە چۆن زكی دایكم بەرز ببووەوە، منیش چاوەڕوانی ئەوە لە ئێوە دەكەم كە بڕوا بە درۆكانم بكەن[1].

ڕەنگە ئەم میكانیزمە لە پەیوەندی لە گەڵ درۆیەكی دیكەشدا بەكار بێت. دایكی هـانس دەڵـێ كـە ئـەو ئەنـدامی زاوزێـی پیاوانـەی هەیـە و باوكیشی جەختی لە سەر دەكاتـەوە. هەندێك هۆكار بوونیان هەیـە كە نیشـان دەدات هـانس لـە قبـووڵ كردنـی ئـەم قسـەیەدا دودڵـە. ئێمـە لـەو بڕوایـە دایـن كـە كاتێـك ئـەو وڵامدەداتـەوە كـە بـەڵی ئەنـدامی زاوزێی داێكی بە گـەورەیی ئەنـدامی زاوزێی ئەسپەكەیە، بـە شـێوەیەكی نێـوە وشیار گاڵتـەی پـێ دەكات.

نمونەكانی دیكەی شێوازی پەروەردەكردنی دایـك و باوكی هـانس بەلاوە دەنێن، بەڵام ئەم پرسیارە دەخەینە ڕوو: چۆن فرۆید دەتوانێ لەو بڕوایەدا بێت كە ئەوان لـە هەڵـە باوەكـان خـۆدوردەگرن بـەڵام لـە هـەمان حاڵـدا هـەمان شـێوازی سـزادان و كـونترۆڵ كـردن بـە كـار دەبـەن كـە شێوازی تێكڕای دایك و باوكانە؟ (نەرم و نەهێنی لە توێژی مامناوەندی و سەروتر، توندوتیژو ئاشكرا لە توێژی خواروی كۆمەڵگادا).

فرۆید لە بۆچوونەكانی خۆیدا "خاڵیكی تاریكی" هەیە. بۆچوونی ئەو لە سەر كۆمەڵگای بورژوازی، ڕەخنە گرانە و لیبراڵ بوو نە ڕادیكاڵ. ئـەو دەیەویسـت توندوتیـژی لـە شـێوازەكانی پـەروەردەدا كـەم بكاتـەوە. بەڵام لە قۆناغی ڕەخنە لە ئەساس و بنەڕەتی كۆمەڵگای بورژوازی زیاتر نەڕۆیشت: بنەمای زۆر و هەڕەشە. ئەم ڕاستییە كە ئـەو تیـوری یەكـەمی

[1] هەمان سەرچاوە.

خۆی سەبارەت بە ترسی منداڵان گۆڕی بە هۆی هەمان شێوازە بوو. فرۆید لە کۆتایی‌دا گەیشتە ئەو ئەنجامە کە ئەم ترسانە بە شێوەیەکی گشتی هیچ بناغە و بنەڕەتێکیان نییە، بەڵکو نیشانەکانی ترسی خۆشەویستی حەرام و هەڵچوونەکانی منداڵی. لە ڕوانگەی ئێمە ئەو پێداگرییەی کە لە سەر ئارەزۆحەرامەکانی منداڵ دەکرێتەوە، تا ڕادەیەك ئاماژە بە بەرگری دایك و باوك دەکات کە لە ئارەزۆ حەرامەکانی خۆیان و ئەو کارانەی کە ئەنجامیان دەدا رزگار بوون (هەروەها کە دەبینین، لە نمونەی هانس دا، دایك ڕۆڵی فریودەرێکی ئاکتیڤ یاری دەکات).

لە گەڕانەوەی بۆ بەڵگە کلینکییەکان رووبەروی چەمکی نیشانەکانی پەرێشانی هانس بچوك دەبینەوە. بێ گومان هانس لە خەساندن دەترسێت. بەڵام ئەم ترسە بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی فرۆیدەوە لە سەربنەمای "وەهمی لاوەکی" نییە. بەڵکو هەمان وەهمیات، هەڕەشە گەلێکی زۆر روون و توندن. بەڵام ئەم هەڕەشانە لە کوێوە سەرهەڵدەدەن؟ ئەوانە لە لایەن باوکەوە دروست نەبوون بەڵکو دەرئەنجامی بەسەردابڕینەکانی دایکن. دایك نەتەنها بە هەڕەشەی خەساندن منداڵ دەترسێنیت، بەڵکو هەڕەشەی جێهێشتنیشی لێدەکات. ترسی هانس لە دایك نیشانەیەکی تریشی هەیە: "لە حەمام دا لە کەوتنە نێو بانیۆ گەورە کە دەترسم". باوك دەڵێ: "بەڵام دایە دەتشوا، دەترسی بتخاتە نێو ئاوەکەوە؟" هانس لە وڵامدا دەڵێ: "دەترسم وازم لێبهێنێت، سەرم بکەویتە بن ئاوەکەوە[١]".

---

[١] هەمان سەرچاوە.

بێ گۆمان هۆکاری ترسی هانس لە ئەگەرەکانی داهاتو دایکییە نەك باوکی.

بیرکرنەوەی ئەم کوڕە سەبارەت بە بۆری چی (ئەوەی ئیشی بۆری دەکات) ترسی ئەو لە خەساندن پەیوەندی بە باوکییەوە نییە، و تەنانەت لێکدانەوە یەکیش لە ترس لە خەساندن بوونی نییە. بەڵکو لانی کەم ئەم ئەگەرە دەگەیەنێت کە ئەم بیرکردنەوە ئارەزۆی هانس بۆ هەبوونی ئەندامێکی زاوزێی پیاوانە بە گەورەیی ئەندامەکەی باوکی بەیان دەکات و یان ئەم ئارەزۆیە بەیان دەکات کە خۆزگە دەیتوانی ئەندامی زاوزێکەی لە گەڵ دانەیەك گەورەتردا بگۆڕێتەوە. بەدەر بڕینێکی دیکە لێك دانەوەی بیرکردنەوەی هانس ئەمەیە کە دەیەوێت گەورە ببێت و پێ بگات (باڵغ بێت): نەك لە خەساندن دەترسێ.

وت وویژ سەبارەت بە بۆچوونی فرۆید لە بارەی ئەوەی کە منداڵ بە تایبەت لە باوکی دەترسێ (و ئەم ڕەنگدانەوەیە یەکێکی دیکە لە خاڵە تاریکەکانی ئەندێشەی ئەوە) لەم بابەتەدا جێگەی نابێتەوە. فرۆید نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە ڕەنگە هۆکاری سەرەکی ترس ژن بێت بەڵام لێکۆڵینەوە کلینیکیەکان بە باشی دەریدەخات کە توندترین و یا نەخۆشی هێنەرترین ترسەکان لە دایکەوە و سەرچاوە دەگرن، و ترس لە باوك لە بەراورد لە گەڵ ترس لە دایك کەمە.

لە باتی ترس لە باوك پێچەوانەکەیمان بۆ روون دەبێتەوە: لەوە دەچێت کە هانس پێویستی بە باوکی هەبێت تا لە دایکی هەڕەشەکەر بیپارێزێت، و سەرکەوتن لە چارەسەریدا ئەوەندەش گرێدراوی لێك

دانەوەی خەون نەبووە، بەڵکو دەرئەنجامی رۆڵی پشتیوانی باوك و "باوەگەورە" واتە خودی پرفیسۆر فرۆیدە.

بە شێوەیەکی کلاسیك، بنەرەتی گرێی ئودیپ لە خۆشەویستی حەرامی منداڵ بۆ دایکە. فرۆید لەوە بڕوایە دابوو کە ئەم ئارەزۆیە دەرئەنجامی فریودانی دایك نییە. بێ گومان منداڵێکی تەمەن ٥ یان ٦ ساڵ خاوەن ئارەزۆ و حەزی جنسییە و ئامانجەکەی بەزۆری دایکییەتی. بەم حاڵەوە دەپرسین: ئایا ئەم ئارەزۆ جنسییە بە هەمان توندییە کە فرۆید بڕوای پێبوو؟ و دیسان ئایا ئارەزۆی جنسی بە هەمان شێوە کە فرۆید لەو بڕوایەدابوو کە لە نەبوونی فریودانی ئاکتیڤ لە لایەن دایکەوە وە ،خۆی دەوروژێت؟

لێکۆڵینەوە کلینیکیەکانی فرۆید بۆئەم وڵامی پرسیارانە بەڵگەی گرنگ دەخەنە بەردەستمان. لە فریودانی دایکدا گومانم نییە، ئەو دەیەویست هانس لە باوشی خۆیدا بخەوێنێت و لە گەڵ خۆی دا بیباتە حەمام ـ بەڵام سەرەڕای ئەم هەڵس و کەوتە، دایك ئامانجی تایبەتی ئارەزۆی جنسی هانس نییە. ئەو زۆر حەزدەکات لە گەڵ خانمی "ماریدل"دا بخەوێت و بە ئاشکرا دەڵێ کە زیاتر حەز دەکات لە گەڵ ئەودا بێت تا دایکی. هانس ئارەزۆی جنسی بۆ دایکی هەیە، بەڵام تا ئەو ڕادەیە نییە کە نەفرەتێکی توند سەبارەت بە باوکی لە ئەودا دروست بکات و دەرئەنجام لە باوکی دەترسێ.

سەرەڕای ئەمەش نابێ گرنگی گرێدانی کوڕ بە دایك کەم بایەخ لە قەڵەم بدەین و بە پێچەوانەوە ئێمە دەڵێین ئەم گرێدانە زۆر لەوە قوڵترە کە لە سەربنەمای ئارەزۆی جنسی دامەزرابێت. لە راستیدا تەنها حەزی

ان و دورکەوتنەوە لە خەم و دڵتەنگی پێویستە. خۆشەویستی دایك
ۆشە ویستییەکی بێ شەرت و مەرجە و رازی بوون و تەنانەت
ختەوەرەیشی لێدەکەوێتەوە.

ئەگەر ناوەندی ترسی هانس دایکە نەك باوك، کەواتە چۆن
توانین ترسەکەی لێك بدەینەوە؟ ئێمە لەم بڕوایەدایین کە توخمەکانی
س ئەمانەن: بۆ ئەوەی هانس گرێدراوی دایکەیەتی، ترس لە دایك بە
ڕەشە لە خەساندن و بەجێهێشتن زیاد دەبێت. ترسەکەی لە یەکەمین
وبەروو بوونەوە لە گەڵ مەرگدا توند دەبێت. بەر لە دەرکەوتنی ترس،
انس ڕێوەرسمێکی بە خاك سپاردنی لە گموندن بینیوە. دواتر
سپێکی کەوتووی بینی وایدەزانی کە مردوە . یەکەمین روو بە
وبوونەوەی لە گەڵ مەرگ روداوێکی جیدیە لە ژیانی منداڵدا، کە
توانی خەم و نارەحەتییەکی زیادە لە منداڵێکی هەستیاردا، بەبۆنەی
س لە خەساندن، دروست بکات.

کەواتە بەم ئەنجامە دەگەین کە ترس لە ئەسپ دو سەرچاوەی
ەیە: ١) ترس لە دایك بە بۆنەی هەڕەشەی خەساندن ٢) ترس لە
ەرگ. هانس بە مەبەستی خۆدورگرتن لە هەردوو ترسەکە گیرۆدەی
سێك[1] دەبێت کە لە بینینی ئەسپ و ئەزموونی هەردوو دڵەراوکێکە
ور دەخاتەوە.

لێرەدا بۆ قەبووڵ کردنی ئەم گریمانەیە ئامادە دەبین کە بە
ەگەرێکی زۆرەوە ترسی هانس لە ئەسپی گالێسکە پەیوەندی بە
ایکەوە هەیە و بە پێچەوانەی لێك دانەوەی فرۆید هیچ پەیوەندییەکی

---

(١). Ohobia

جنسـی بنـەمای پەیوەنـدی جنسـی بـەردەوام نییـە. بـاوك بـە ئاسـ
دەتوانێ بابەتی حـەزی جنسـی خـۆی بگۆڕێـت، ئـەم پرسـە سـەبارت
کوڕیش راستە. فرۆیـد لـەو بڕوایەدایـە کـە گرێدانـی زاوزێیـی بـە دا
دوای ئارەزۆی "بەر لە زاوزێ" دێت.[1]

فرۆید لە کتێبی "بابەتەکانی دەروون شیکاری"دا دەنوسێت:

"بابــەتی خۆشەویســتی ســـەرەتایی منــداڵ ســێنگی دایکــە
خواردنی پێ دەدات، خۆشەویستی لـە ئارەزۆی دامرکاندنی پێویس
خۆراکـەوە سەرچـاوە دەگرێـت. دواتـر ئـەم خۆشەویسـتیە سـەرەتا
دەگوێزرێتەوە بۆ خودی دایك کە نە تـەنها خـۆراکی دابین دەکات بە
پارێزگاریشی لێدەکات، دەرئەنجام هەندێك هەستی جەستەیی دیکا
منداڵدا دەوروژێـت کـە هەنـدێکیان بـاش و هەنـدێکیان خـراپن. دایك
پاراسـتنی جەسـتەیی، یەکـەمین فریـودەری منداڵـە. ریشـەی گرنـ
بێوێنـەی دایـك لـەم دو پەیوەندییەدایـە، کـە بـە شـێوەی نـەگۆڕ لـە گ
یەکەمین و بەهێزترین خۆشەویستی بونیـاد نـراوە و نمونـەی پەیوەن
خۆشەویستی دواتر بۆ هەر دوو ڕەگەزەکەیە.

حەز و خۆشەویسـتی سـۆزداری نێـوان منـداڵ و دایـك، لـە راسـت
قووڵتر لەوەیە کە بەدەستەواژەی "جێگربوونی پێش - زاوازێ"[2] پێن
بکرێت، بەڵکو حەزێکی زۆر قووڵە کەتێدا دایك نوێنەری گەرمی، یار
پشـتیوانی کردنـە. لـە راسـتیدا دایـك پشـتیوانی ژیانـە و بـۆ بـەردەو

---

[1] سەبارەت بە ئارەزۆ زاوزێیی وبەر لە زاوزێیی وپێناسە وچۆنایەتی ئەوانەلە برگە
نۆهەمی ئەم کتێبەدا بە تێر وتەسەلی شرۆڤە دەکرێت.

[2] Paregenital Fixation

بە باوکەوە نییە. ئایا دوژمنایەتییەکی توند و سەرکوتکراو لە گەڵ دایك، بە بۆنەی هەڕەشەکان و "خەیانەتەکەی" دایکی بە هێنانە دونیای کچێك ـ رکەبەرـ و هەروەها ئارەزۆی کوڕ بۆ رزگاری لە گرێدراوی بە وی، بوونی هەیە؟ هەرچەند کە ئەم بابەتە ئەگەری بوونی هەیە بەلاّم بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی بوونی نییە. بەم حاڵەشەوە راستیەکمان لە بەردەستدایە کەئاماژە بەم گریمانە دەکات. دەگەڕینەوە بۆ لای هانس، کە کاتێك ئەسپەکەی لە تەویلەکە دەهێنێتە دەرەوە باوکی لێی دەپرسێ: "ئەوت لە تەویلە کە هێنایە دەرەوە؟" هانس لە وڵامدا دەڵێ "هێنامە دەرەوە چوونکە دەمەوێت بە قەمچی لێی بدەم".

باوك دەتەوێت لە کێ بدەیت؟ دایکت، هانا، یان من؟

هانس: دایکم!

باوك بۆچی؟

هانس: حەزدەکەم

باوك: ئایا تا ئێستا کەسێکت بینیوە لە دایکیخۆی بدات؟

هانس: لە ژیانمدا قەت شتی وام نەبینیوە.

باوك: بەلاّم سەرەڕای ئەوە تۆ دەتەوێت کارێکی وەها ئەنجام بدەیت؟

هانس: بەڵێ بە کلکە گسك لێی دەدەم (دایکی هەمیشە هەڕەشەی لێدەکرد کە بە کلکە گسك لێ دەدا)[1]

ئەم وت و بێژە ئاماژە بۆ یەکبوونی ئەسپ و دایك و دژومنایەتی لە گەڵ وی دەکات. فرۆید سرنج دەداتە ئەگەری خواستێکی سادیستیکی

---

[1] هەمان سەرچاوە.

نادیار سەبارەت بە دایك، بەڵام لەم بڕوایە دایە كە توخمێكی دیكە "ورژندانێكی روون بۆ تۆڵە كردنەوە لە باوەكە" [1]ئەم بۆچوونە بنەمای لێكدانەوەی دەروون شیكاری هانسە. بەڵام ئایا بە راستی دوژمنایەتییە كە ئاراستەی باوكی دەبێت، بە هەمان شێوە كە فرۆید جەختی لە سەردەكاتەوە؟ و ئایا ئەم دوژمنییە بە كردار و قسەكردنی هانس سەلمێندراوە؟

لە لێك دانەوەی بەڵگەكاندا، وادیارە فرۆید لەم تیۆرییە پیشتیوانی دەكات. دەبێ لە بیرمان نەچێت كە ئەو خۆی هەندێك شت بە هانسی بچكولە تەڵقین دەكات، بە بێ ئەوەی بەڵگەیەكی بۆسەلماندنی ئەوانە لە بەر دەستدا بێت: "بە كورتی من (فرۆید) پرسیارم لێكرد ئایا مەبەستی پەڵەی رەشی دەوری دەم، سمێڵە؟ دواتر ئاشكرام كرد كە ئەو لە باوكی دەترسێ، كوت و مت بەو بۆنەیەوە كە زۆر لە دایكی حەزدەكات[2]"

بە سرنج دان بە شایستە بوونی مامۆستا وەك (باوەگەورە) دەبوایە ئەم تەڵقینە كاریگەرییەكی زۆری لە سەر منداڵ هەبوایە. دەبێ بپرسین: گەڕانەوەكانی هانس تا چە ڕادەیەك لەم تەڵقینەوە سەرچاوە دەگرێت و تاچە رادەیەك (خۆهەڵقوڵاوە)) [3].

هەست بە هەڵچوون لە هەمبەر باوك لەم وت ووێژەی خوارەوەدا بەروونی ڕەنگدەداتەوە!

باوك: كەواتە بۆچی هەر كاتێك من دایە ماچ دەكەم تۆ دەگریت؟

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3]. Spontaneous

هانس: ئیرەیی دەبەم

باوك: ئایا دەتەوێت خۆت باوك بیت؟

هانس: بەڵێ، بەڵێ

باوك: ئەگەر باوك بویت چیت دەكرد؟

هانس: وتۆش هانس؟ حەزم دەكرد هەموو یەك شەمەیەك بتانبەم بۆ "لینز" ـ نە، لە حەفتەیەكدا حەوت رۆژ ئەگەر باوك دەبووم زۆر باش و میهربان دەبووم.

باوك: لە گەڵ دایەدا چیت دەكرد؟

هانس: ئەویشم دەبرد بۆ لینز.

باوك: ئیدی چی؟

هانس: هیچ

باوك: كەواتە بۆچی ئیرەیی دەبەیت؟

هانس: نازانم [1]

لە كۆبوونەوە یەكی دیكە دا ئەم وت وویژەی خوارەوە لە نێوان كوڕ و باوكدا ئەنجام دەدرێت:

باوك: ئایا لە گموندن زۆر لە گەڵ دایەدا دەنوستی؟

هانس: بەڵێ

باوك: و واتدەزانی كە باوكی؟

هانس: بەڵێ

باوك: كەواتە لە باوك دەترسای؟

---

[1] هەمان سەرچاوە.

هانس: تۆ هەموو شتێك دەزانی و من هیچ نازانم!

باوك: كاتێك فریتزل (ئەسپەكەیان) كەوت گوتت خۆزگە باوكم ئاوەها دەكەوت، كاتێك بەرخەكە بە شاخ لێ دای گوتت خۆزگە ئاوەها لە باوكمی دەدا. ئایا رێورەسمی بە خاك سپاردنەكەت لە گموندن لە بیرە؟

هانس: بەڵێ، مەبەستت چییە؟

باوك ئەوكات لە بەرخۆتەوە بیرت لەوەكردەوە كە خۆزگە باوك دمرد و خۆم دەبووم بە باوك

هانس: بەڵێ.[1]

ئایا ئەم وت و وێژە ئەوە دەسەلمێنێت كە هانس لە گەڵ باوكی دوژمنایەتییەكی قوڵی هەبووە؟ هەڵبەت، بەو مەرجەی لەم بڕوایە دابین كە ئەو وت و وێژە باس لە گرێی ئودیپ دەكات، لێك دانەوەیەكی راستە و قسەكانی هانس دەیسەلمێنیت. بەڵام ئەگەر كەسێك بابەتەكە بە بێ ئەم بڕوایە لێك بداتەوە، دەرئەنجامێكی دیكە بە دەست دەهێنێت: ئارەزۆی هانس بۆ جێگری باوكی، لە سەداسەد نەفرەتی و ئارەزۆی مەرگی باوك بەیان ناكات. نابێ لە بیرمان بچێت كە یەكێك لە گشتیترین خواستی منداڵان، گەورە بوون، رزگار بوون لە ژێر دەستەیی گەورەكان، و گاڵتە پێ نەكردنە. هەر بەم بۆنەویەوە كچەكان حەزدەكەن بە بووكە شوشە یاری بكەن و كوڕ خۆی بە گەورە لە قەڵەم دەدات، یەكێك لە ئارەزۆ گشتیەكان كە پێویستە حەسێب بكرێت، تاقی كردنەوەی بابەتێكە بە شێوەیەكی ئاكتیڤ كە بە شێوەی هەڵچوونی بێ لایەنانە بێت. فرۆید لە كتێبەكەی خۆیدا (ئەو پەری بنەچەی چێژ[2]) بە

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2]. Beyond The Pleasure Pinciple.

خواستی گشتی گۆڕینی بنەمای فەرمانبەری بۆ بنەمای ئاكتیڤ بوون ئاماژە دەكات.

" لە سەرتادا ئەو لە پێگەی فەرمانبەریدا بوو - ئەزموون بە سەریدا زاڵ بوو، بەلام بە دوپات كردنەوەی، هەرچەند كە ناخۆش بوو، وەك پێش بركێی وەزرشی بۆ لایەنی ئاكتیڤ گوێزرایەوە..."

" بۆ ئەوەی منداڵ لە لایەنی فەرمانبەری ئەزمونەوە بۆ لایەنی ئاكتیڤ گوێزرایەوە، ئەزموونی ناخوش بۆ لایەنی بەرامبەری یارییەكە دەگۆیزرێتەوە و لەم رێگەیەوە لە جێگرەكەی تۆڵە دەكاتەوە.[1] بە هەمان شێوە كە فرۆید دوپاتی كردوتەوە، ئەزموونی كلینیكی نیشان دەدات كە حەز و خواستی گۆڕین لە بارودۆخێكی فەرمانبەرییەوە بۆ پێگەیەكی چالاك (فەرماندەری) هێزێكی بە هێزە كە لە منداڵان و گەورەكاندا گەلێك داخوازی پێك دەهێنێت. ئارەزۆی بوون بە باوك، كاركردنی چالاك ئەوەی بە شێوەیەكی فەرمانبەرانە ئەنجام دەدرێت، و ئیرەیی نەرم بە باوك دەتوانێ بە گشتی رەوشی هانس بەیان بكات، بە بێ پشت راست كردنەوەی گریمانەی دوژمنایەتی توند لە هەمبەر باوكی ، وەك هۆكاری نیگەرانی و ترسی ئەو، پێویستە هۆكارێكی دیكەش حەسێب بكرێت. ئەگەر كوڕێكی تەمەن ٥ ساڵ دەڵێ: "بەڵێ دەمەوێت باوكم بمرێت" ئەم گوتەیە لە سەدا سەد نەفرەت بەیان ناكات. بەڵكو ڕەنگە ئەو ئارەزۆیە بەیان بكات كە لەو تەمەنەدا منداڵ پێی خۆشە، بە بێ ئەوەی ئارەزۆی مەرگی تێدا بێت. دەروون شیكاری

---

[1] هەمان سەرچاوە.

هانس نیشان دەدات کە ئەو لە باوکی زۆر نەدەترساو بێزاریش نەبوو. ئەگینا بەو شێوەیە سادە و بێ پەردە لە گەلێدا قسەی نەدەکرد ولامی پرسیارەکانی باوکی پوزتیڤ نەدەدایەوە، بە بێ پشت بەستن بە گرێ ئودیپ بە روونی بۆمان دەردەکەوێت کە پەیوەندی ئەم باوك و کوڕە لە سەر بنەمای دروستی ومتمانە دامەزروە.

ئەم پرسیارە دێتەپێشەوە کە: "رزگار بوون لە ترس لە سەر بنەمای گۆڕانکاری نیوە راست بە چەشتێك پاساودەدرێتەوە؟ سەیری ئەم تێبینیانەی خوارەوە بکەن:

١) لێك دانەوەی هەڵەی بەشێك لە ناکۆکییە سەرەکییەکان لە قەڵەم دەدرێت لە حاڵێکدا کە سەمبولێك و لاوەکییە.

٢) سەرەڕای ئەم راستیە کە لێك دانەوە راست نییە بەلام گەڕان بە دوای ئەوشتەدا کە لە ئەوپەڕی رەفتاردا ئاشکرایە خۆی یارەمەتی دەرە.

٣) رەنگە لە هەندێك نمونەدا، وەك ئەم نمونەیە تەڵقینەکان کاریگەربن: مامۆستا کە یارمەتییان دەدات وهم و خەیاڵەکان لە خۆتان دور بخەنەوە. بە تایبەت کە ئەم مامۆستایە وەك فرۆید بە ناوبانگ و متمانە پێکرا و بێت. بە میهرەبانی و رێزوە پەرچەکردار نیشان بدات، بەو شێوەیە کە لە تێکڕای چاوپێکەتنەکاندا لە گەڵ هانس دا هەڵس و کەوتی کرد.

٤) گرنگترین هۆکار- ئەگەر ئەم گریمانەیە کە ترسی سەرەکی هانس لە دایکی بوو راست بێت، بایەخ دان و

پیشتیوانی باوك و مامۆستاكەی منداڵەكەیان هاندا و بوونە هۆكاری ئەوەی تا زیاتر هەست بە هێز بكات و كەمتر نیگەران بێت.

٥) بە كورتی، ئەمە ترسێكی لاوەكییە كە یەخەی زۆربەی مندالأن دەگرێت و رەنگە بۆ خۆی بە بێ چارەسەری پشتیوانی باوك نامێنێتەوە.

بە كورتی :وادیارە فرۆید كە لە بن كاریگەری دەمارگرژی باوك سالارانە و بالأ بوونی رەگەزی نێر دابوو، بەڵگە كلینیكییەكانی یەك لایەنە لێك داوەتەوە و وڵامی ئەو بابەتانەی كە لە گەڵ لێك دانەوەكانی ئەودا ناكۆك بوون نەداوەتەوە.

# ٦-گرنگی تیوری مافەکانی دایك[1] لەم سەردەمە ئێمەدا

خـۆڕاگری و مانـەوەی سیسـتەمی بـاوك سـالاری لـە ئـەورووپا و ئەمریکا تاکۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم نیشانی داوە کە تیوریيەکانی باخ ئۆفن سەبارەت بە مافەکانی دایك و کۆمەڵگا دایك سالارەکان لە سەدەی ١٩ ونیوەی یەکەمی سەدەی ٢٠ بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە، بە شێوەیەك کە خەیاڵی ژن وەك ناوك و سەنتەری کۆمەڵگا و ئایین و وەك کارێکی هیچ و پوچ و بێ واتا خۆی دەنواند. بە سرنج دان بەم پرسە، ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و دەروونناسیانە کە لەم ٤٠ ساڵەی دواییەدا هاتونەتە ئاراوە، دەبێ هۆکاری ئەم کارە کە بۆ چی پرسی دایك سالاری بایەخ و حەزێکی تازەی وروژاندوە بخاتە روو. بە رواڵەت هونووکە هەندێك گۆڕانکاری رودەدەن کە هەڵسەنگاندنی دوبارە لەو ئەندێشەیەدا کە بە ماوەی سەد ساڵ جێگیر مابوو، پێویست دەکات. بەلاّم بەر لەوەی سەبارەت بەم گۆڕانکارییانە بدوێم بۆ ئاگاداری ئەو

---

[1]. Mother Right

خوێنەرانەی کە باخ ئۆفن ناناسن کورتەیەك لە بنەما و بەهاکانی ئەو لە کۆمەڵگای دایك سالاری‌دا دوپات دەکەمەوە[1]:

لە ڕەوانگەی باخ ئۆفنەوە دایك سالاری ژیان، یەکبوون و ئوقرەییە. ژن بە پەروەردە کردنی منداڵ خۆشەویستی خۆی بۆ دەوروبەری خۆی و بۆ مرۆڤەکانی دیکە فراوانتر دەکات و تێکڕای بیرکردنەوە باش و بەکەڵکەکانی خۆی بە مەبەستی پاراستن و جوانکردنی بوونی مرۆڤەکانی دیکە بە کار دهێنێت. بنەمای دایك سالاری پێکەوە بوون و کامل بوونە. بەڵام بە بەرفراوان بوونی کۆمەڵگای باوك سالاری ئەم دەمارە وشك دەبێت. دایك سالاری بنەما و بنەڕەتی ئازادی و یەکسانی گشتی و میهرەبانی مرۆییە. دایك سالاری بنەچەی ئاسایشی مادی و بەختەوەری جیهانییە.[2]

مۆرگان، بەم ئەنجامە گەیشت کە پادشایەتی خەڵکە کۆنەکەی (خۆجێ) ئەمریکا ـ وەك سیستەمەکانی ئاسیا، ئەفریقا و ئوسترالیا ـ لە سەربنەمای دایك سالاری دامەزرا بوو، ئەو لاقی ئەوەی لێداوە کە لە شێوەکانی باڵاتری شارشتانییەت دوپات کردنەوی بنەماکانی ئازادی، یەکسانی، برایەتی، لە ئاستێکی بەرزتردایە کە ئاماژە بە تایبەتمەندی بنەماڵەکانی ڕۆمی کۆن دەکات. تەنانەت ئەم ئاماژە کورتە بە بنەماکانی

---

[1] لە برگەی ٧دا، تیوری دایك سالاری وگرنگی ئەو لە دەروونناسیدا شرۆڤە کراوە. سەبارەت بە لایەنەکانی تری ئەم باسە، کتێبی "زمانی لە بیرکراو " لە نوسینی خودی نوسور بخوێنەوە.

[2] کتێبی "ئەرەستۆی ئایین ومافی دایك" لە نوسینی باخ ئۆفن.

دایك سالاری دەبێ خوێنەرانی تێگەیاندبێت کە بۆچی گۆڕانکارییە کۆمەڵگایەتی ـ دەروونییەکانی خوارەوە ئەوەندە بە لامەوە گرنگن.[1]

١) **شکستی سیستەمی دەسەڵات خوازی باوك سالاری لە راپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆیدا**، داماوی ئەم سیستەمە لە رێگرتن لە شەڕی گەورە و وێرانکەر و دیکتاتۆریەتی تیرۆریستی، داماوی لە رێگرتن لە کارەساتەکانی داهاتو وەك شەڕی ناوەکی، بیولوژێکی، کیمیایی، مردن لە برسێتیدا لە بەشێکی فراوانی جیهان و ئەنجامی کارەسات باری پیس کردنی رو لە زیاد بوونی هەواو ئاو و خاك.

٢) **شۆڕشی دیموکراتیك**، کە بونیادی دەسەڵات گەرای نەریتی وێران دەکات و سیستەمی دیموکراتیکی لە باتی بونیاد دەنێت. پرۆسەی دیموکراتیزە کردن هاوکات لە گەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵگای تەکنولۆژیك و خۆشگوزەران کە پێویستی بە فەرمانبەری تاك نییە بەڵکو لە سەربنەمای کاری گروپی و رازی بوون تەڵقین کراوە.

٣) **شۆڕشی ژنان**، هەرچەند کە کامڵ نییە بەڵام بۆ پراکتیزە کردنی بیرکردنەوەکانی چەرخی رووناك گەری سەبارەت بە یەکسانی ژن و پیاو رێگایەکی زۆری بڕیوە.

---

[1] ئەم برگەیە تەنها پێشەکییەکە بۆ برگەی داهاتوو، لەم روەوە بە کورتی باسی دەکەین.

٤) **شۆرشی منداڵان و نەجوانان:** لە رابردودا یاخی بوون و سەرپێچی منداڵان بەم شێوەیە کاریگەر نەبوو - تۆران و نان نەخواردن، خۆقەبز کردن، گریان، میزکردنی شەوانە، پێداگری و سەرپێچی گشتی. بەڵام لە سەدەی نۆزدەیەمەوە هەندێك قسە کەریان پەیدا کردووە، (فرۆید، پستالوتزی[١] و کەسانی دیکە) کە جەخت دەکەنەوە منداڵ خاوەن ئیرادەو خواستە و دەبێ بە هەندوەربگیردرێن. ئەم خواستە بە هێزی روو لە زیاد بوونی رووناکبیری سەدەی ١٩ بەردەوام بوو و دوکتۆر بنیامین سپاك بوو بە کارگەرترین و بە ناو بانگترین قسەکەر ونوێنەری. نەوجوانان و گەنجانیش، هەنووکە چالاکن و ئێدی دەستە مۆو ئارام نین. چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە مافە ڕواکانیان بە هەندوەربگرێت و لە سیستەمی زاڵ بە سەر ژیانیاندا توخمێکی چالاك بن نەك فەرمانبەر (ئەمر بەر)، ئەوان راستە وخۆ و بە توندی ـ هەندێك جاریش بە فێڵ ـ هێرش دەکەنە سەر پلە و پایە باوك سالارییەکان.

٥) **داهاتووی بەهەشتی بەکارهێنان:** کەلتووری بەکارهێنانی ئێمە ڕوانگەیەکی نوێ دروست دەکات، ئەگەر ئێمە رێگای پێش کەوتنی تەکنولۆژیکی درێژە پێ بدەین، بە ناچاری دەگەینە خاڵێك کە هەموو جۆرە خواست و ئارەزۆێك بە دی دێت، بە دی هاتنی خواستەکان خێرا دەبێت و

---
[١]. Pesta Lozzi

پێویستی بە هەوڵدان نابێت. لەم داهاتوویەدا تەکنێك ڕۆڵی (دایکی گەورە) دەبینێ، داکی تەکنیکی لە باتی دایکی ئاسایی، کە پارێزگاری لە منداڵەکانی دەکات و بە لایە لایە کردن هێوریان دەکاتەوە و ئوقرییان پێ دەبەخشی (بە رادیو و تەلەفیزیۆن). لەم پرۆسەیەدا مرۆڤ لە لایەنی سۆزدارییە دەبێتە منداڵێك، بەم هێوایە کە مەمکەکانی دایك هەمیشە شیرێکی زۆری پێ دەدات هەست بە ئاسایش دەکات. ئێدی بڕیارەکان لە لایەن کەسەکانەوە ناگیرێت، بەڵکو ئامێرە تەکنیکیەکان بڕیار دەدەن و تەکنوکراتەکان لێکی دەدەنەوە و جێ بە جێی دەکەن، ئەمانە ڕەبەنەکانی ئاییني دایك سالاری تازە سەرهەڵداون و تەکنێك خواوەندی ئەوانە.[1]

٦) **هەندێك بۆچوونی دایك سالارانە کەم تا زۆر لە نێو چینە رادیکاڵە گەنجانیشدا دەبیزێت:** ئەمە نە تەنها بە بۆنەی دژایەتی توندی ئەوانە لە گەڵ دەسەڵات خوازی، بەڵکو بە بۆنەی قبووڵ کردنی بەهاو شێوازەکانی جیهانی دایك سالارییە کە باخ و مۆرگان شرۆڤەیان کردوە. تیوری پەیوەندی

---

[1] شایانی سرنج دانە کە ئەم خواستە بە دایکسالاری لە نێوان گروپێکدا پەیدا دەبێت کە لە کۆمەڵگەی خۆشگوزەراندا دەژین ولە بەشە ئابوورییە سیبرنتیك بووەکاندا کار دەکەن. چینی مامناوەندی وخوارووی کۆن- جوتیاران وبازارییەکان کە لە شارە بچوکەکاندا دەژین- و لە بە کارهێنانی زۆر بێبەهرەن و بەهاکان وپێناسەی خۆیان لە بەردەم هەرەشەدا دەبینن، لە سەر سیستەمی کۆنی باوکسالاری پێداگری دەکەن ودوژمنی سەرسەختی بۆچوونە تازەکانن، بە تایبەت دوژمنی ئەو گروپانەیکە بەها وشێوازە تازەکان بە توندییەکی زیاترەوە جێ بە جێ دەکەن.

جنسی گروپی پەیوەندییەکی نزیکی لە گەڵ پێناسەکەی باخ ئۆفن لە قۆناغی دایك سالاری سەرەتایی مرۆوایەتی هەیە. ڕەنگە ئەم پرسیارەش بێتە ئاراوە کە ئایا خواستی لە ناوبردنی جیاوازییە رواڵەتییە جنسیەکان، جل و... و بە دارمانی پێگەی نەریتی ڕەگەزی نێر و هەروەها نزیکترکردنی دو جەمسەری جنسی لە یەك، کە گەڕانەوە (لە لایەنی سۆزدارییەوە) بۆ قۆناغی پێش زاوزێی منداڵی لێدەکەویتەوە، پەیوەندی نییە؟

نیشانەیەکی دیکەشمان لە بەردەست دایە کە ئاماژە بە خواستی رو لە زیاد بوونی دایك تەوەری لە نێو ئەم توێژە لە جیلی گەنج دەکات. وادیارە کە "گروپ" خۆی، ئەرکی دایکایەتی لە ئەستۆ دەگرێت، پێویستی دامرکاندنی خێرای خواستەکان، شێوازی هەڵچوونی وەرگیراو کە لە تووش بوون بە مادەی سڕکەر بەروونی دیارە، پێویستی پێکەوە بوون و بەریەك کەوتنی جەستەیی، تێکڕا ئاماژەی گەڕانەوەیە بۆ پەیوەندی منداڵ لە گەڵ دایك. لە تێکڕای ئەم نمونانەدا جیلی گەنج جیاوازییەکی ئەوتۆی لە گەڵ جیلی لە خۆی گەورەتر دانییە، هەر چەند کە چۆنایەتی بە کارهێنانی گەنجەکان ناواخنێکی دیکەی هەیە، ئەوان لە دژی بێ بەشکردنی خۆیان بە بێ پەردە وئاشکرا وبە توند وتیژییەوە نارەزایەتی دەردەبڕن . توخمی بەر بەست لەم دایك گەراییە نوێیەدا ئەوەیە، کە خواستی باوك تەوەری رەت ناکاتەوە و گەڕانەوەیەکی راستە وخۆیە بە خەیاڵی منداڵانە، نە پێشکەوتنێك لە ئارستەی خواستی دایك سالاری بالاتر. پشت بەستنی "مارکۆزە" بە

گەنجان لەم راستیە دا شاراوەیە کە ئەوقسەکەری گەڕانەوەی مندالآنەیە بۆ دایك سالاری و ئەم بۆچوونەی خۆی بە هەندێك رەستەی شۆڕشگەرانە، سرنج ڕاکیشتر دەکات.

٧) رەنگە پەرەپێدان و کامڵ بوونی دەروون شیکاری "کە فێکری کۆنی فرۆید سەبارەت بە رۆڵی سەرەکی گرێدراوی جنسی نێوان کوڕ و دایك ودوژمنایەتی لە گەڵ باوك کە لەوەوە سەرچاوەی گرتوە، و تیوری پەیوەندییەکی "پێش ئودیپی[1]" نێوان منداڵ و دایك بە لە بەرچاوگرتنی رەگەزی منداڵ، چاك دەکات." لە گەڵ ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانەدا پەیوەندییان هەبێت. لە بڕگەی یەکەمدا نیشانم دا کە کامڵ بوون لە نوسراوەکانی دیکەی فرۆیدا چۆن دەستی پێکرد و کەسانی دیکە درێژەیان پێدا، بەڵام زۆر بە پارێزەوە: بۆچوونەکانی باخ ئۆفن، ئەگەر لە لایەن دەروون شیکارانەوە بە باشی توێژینەوەی لە سەر بکرێت، بەهای گەورە و فراوانی پەیوەندی ناجنسی لە گەڵ دایك دەسەلمێنن.

ئەم بڕگەیە کە حاڵەتی پێشەکی هەیە بە تێبینییەکی تیورێك کۆتایی پێ دەهێنم. بە هەمان شێوە کە لە بڕگەی داهاتوودا دەیبینن بنەمای دایك سالاری بنەمای خۆشەویستی بێ قەیدو مەرج، یەکسانی سروشتی، جەخت کردنەوە لە سەر پەیوەندییە خوێنی و نیشتمانیەکان و هەروەها بەزەیی و میهرەبانییە و بنەمای باوك سالاری بنەمای

---

[1] .Preedipal

خۆشەویستی مەرجدار، بونیادی زەنجیرە پلە، ئەندێشەی ئینتیزاعی و یاسای دارێژراو لە لایەن مرۆڤ و حکومەتەوەیە.

وا دیارە بە درێژایی مێژوو هەندێك جار ئەم دو بنەمایە بە توندی روو بەرووی یەکدی بوونەتەوە و هەندێك سەنتێزیان دروست کردوە (بۆ نمونە لە کلێسای کاسۆلیك و لە مەبەستی مارکس لە سوسیالیزم).

هەر چەند کە ئەو دوانە دژی یەکدین، بەڵام بنەمای دایك سالاری پێکەوە گونجانێکی لە رادەبەدەری دایکانەی لە گەڵ منداڵدا هەیە و لە بەردەم پێگەیشتن تەواوەتی ئەوەدا رێگرە، هێزی باوکانە دەبێتە هۆی زاڵ بوون و کونترۆڵی توندوتیژی کە سەرچاوەی ترس و هەست بە تاوان و هەڵە و سەرپێچی منداڵە. ئەم بارودۆخە لە پەیوەندی منداڵ لە گەڵ دایك و باوك لە بنەماڵە و جەوهەری کۆمەڵگای باوك سالاری و دایك سالاری کە بونیادی بنەماڵە دیاری دەکات بوونی هەیە. کۆمەڵگای دایك سالاری تەواو (بێگەرد) لە بەردەم کامڵ بوونی تاکدا رێگرە، و لەم رووەوە لە بەردەم پێش کەوتنی تەکنولوژیکی، لۆژیکی و هونەریدا ئاستەنگە. کۆمەڵگای باوك سالاری تەواو (بێگەرد) بایەخ بە خۆشەویستی و یەکسانی نادات، بەڵکو تەنها یاسا دارێژراوەکان لە لایەن مرۆڤ و دەوڵەتەوە، بنەما ئینتیزاعی و فەرمانبەرییەکان بە لایەوە گرنگن. ئەم بابەتە لە "ئانتیگۆن" لە نوسینی سۆفۆکل، لە کەسایەتی و سیستەمی کریون دا کە مودێلی رێبەریکی فاشیستە[1] بە جوانی خراوەتە روو.

---

[1] لەم بارەیەوە کتێبی " زمانی لە بیرکراو" بخوێنەوە.

هەرچەند کە دوبنەمای دایك سالاری و باوك سالاری سەنتێزێك دروست دەکەن، بەڵام هەر کام لەم دو بنەمایە رەنگێکی ئەوەی دیکە پێوەیە: خۆشەویستی دایکانە رەنگی دادپەروەری و لۆژیك و خۆشەویستی باوکانە رەنگی بەزەیی و یەکسانی.

هەنووکە خەبات دژی پلەی باوك، بنەمایی باوك سالاری لە ناودەبات و گەرانەوە بۆ بنەمای دایك سالاری بە شێوەیەکی نادیالیکتیکی تەڵقین دەکات کەواتە رێگە چارەیەکی و مودێرن و هەمیشەیی لە تێکەڵاوەییەك لە دژەکان دا شاراوەیە و ئەوە رێگە چارەیەکە کە یەکگرتنی نێوان میهرەبانی و دادپەروەری لە ئاستێکی باڵاتردا لە باتی ناکۆکی نێوانیان سەقامگیر دەکات.

# ٧-تيورى مافى دايك وپەيوەندييەكەى لە گەڵ دەروونناسى كۆمەڵايەتيدا[١]

كتێبى "مافى دايك"[٢] لە نوسينى "باخ ئوفن"[٣] كە لە ساڵى ١٨٦١لە چاپ درا لە گەڵ دوو كتێبى زانستى ديكەدا كە سێ ساڵ بەر لەوە بڵاو كرايەوە چارەنوسێكى هاوبەشى هەبوو. ئەو دوو كتێبە بريتى بوون لە "منشاءانواع"( بنەچەى جۆراو جۆر) لە نوسينە دارڤين و"ڕەخنەيەك لە ئابوورى سياسى " لە نوسينى ماركس( هەر دوكيان لە ساڵى١٨٥٩دا بەڵاو كراونەتەوە ). هەر سێ كتێبەكە نوسراوەى بيرمەندانە وزانستى بوون وڕووبەڕوى هەندێك پەرچەكردار لە لايەن بيرمەندان وخەڵكى ئاساييەوە بوونەوە.

سەبارەت بە دارڤين ومارکس هۆكارى ئەم پەرچەكردارانە ئاشكرايەو پێويستى بە شرۆڤەكردن نييە. بەڵام بە چەند هۆيەك بارودۆخى باخ ئۆفن ئاڵۆزترە. يەكەم ئەوەى كە پرسى دايكسالارى لە گەڵ ئەو پرسانەدا كە بۆ پاراستنى كۆمەڵگاى بوژوازى ژيانى بوون كەمتەرخەم بوو. دوهەم: تيورى دايك سالارى لە لايەن دوو جەمسەرەوە

---

[١] ئەم وتارە بۆ يەكەم جار لە ١٩٣٤ لە لاپيزيك بەلاو كراوەتەوە

[٢] . Mother right

[٣] .Bach ofen

قەبووڵ کرابوو کە لە لایەنی ئایدۆلۆژیا وسیاسەتەوە دژبە یەك بوون. باخ ئۆفن یەکەمجار لە لایەنی بلۆکی سوسیالیست– مارکس، ئەنگلس، ببل[١] وکەسانی دیکەوە دۆزرایەوە و دەستخۆشی لێکرا. دواتر، دوای دەیان ساڵ بێ ناوی، لە لایەن چەند فەیلەسۆفێکی دژە سوسیالیست وەك گلاکس[٢] و بوملر[٣]دۆزرایەوە وبایەخی پێدرا.

لە هەمبەر ئەم دوو جەمسەرە دژ بەیەکە پلەی زانستی ئەو کاتە هەبوو، کە بەرەی هەمیشەیی رەدکردنەوە بوو –لەم بەرەیەدا تەنانەت لایەنگرانی سوسیالیزمیش وەك هاینریش کانۆ[٤] بوونیان هەبوو. بە هەر حاڵ لەم ساڵانەی دواییەدا پرسی دایکسالاری لە وتووێژە زانستییەکاندا رۆلێکی روولە زیادبوونی هەبوە. هەندێك لایەنگری لێدەکەن وهەندێکیتر دژایەتی دەکەن ولە دروست بوونی بۆچوونی گشتی سۆزداریداخاوەن رۆڵە.

دەبێ بزانین کە بۆچی پرسی دایکسالاری پەرچەکرداری توندی سۆزداری دەوروژێنێت وچۆن لە گەڵ بەرژەوەندییە ژیانییە کۆمەلایەتییەکان پەیوەندی وگرێدراوی هەیە. هەروەها دەمانەوێت لە هۆکارەکانی لایەنگری کردنی دوو بلۆکی شۆڕشگەر ودژە شۆڕش لە تیوری دایکسالاری پەردە هەلماڵین، تا بتوانین لە پەیوەندی پرسەکە بە توێژینەوە لە سەر بونیادە کۆمەلایەتییەکانی هەنووکە وگۆڕانکارییەکانی تێبگەین.

---

[١] .Bebel
[٢] . Glages
[٣] .Baumler
[٤] .Heinrich cunow

توخمێکی هاوبەش لە شێوازەکانی دژایەتی دایکسالاری مەودای لێکچوو ویەکسانی ئەوانەیە لە کۆمەڵگای بورژوا- دیموکراتیکدا. بە دڵنیاییەوە ئەم مەودایە پێویستە، بەو مەرجەی کە بمانەوێت لە سەر بونیادی کۆمەڵگە لە بەڵگە ئەفسانەییەکان، سەمبوولەکان وبونیادە وێنەییەکان لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەین ولێیان تێبگەین- هەڵبەت ئەگەر ئەم کۆمەڵگایە لە گەڵ کۆمەڵگای بورژوازی لە ڕوانگەی لایەنە تایبەتی وئامارژەییەکانی دەروونی -کۆمەڵایەتی جیاوازی بنەڕەتیان هەبێت. باخ ئۆفن لەم چۆنایەتییە تێگیشتوە، بە شێوەیەك کە لە پێشەکی کتێبەکەی خۆیدا دەنوسێت:

"تێگەیشتن لە دیاردەی دایکسالاری تەنها بە مەرجێك مومکین دەبێت. لێکۆڵینەر دەبێت بە تەواوەتی بۆچوونەکانی سەردەمی خۆی وئەو بیروبڕوایانەی کە لە رۆحی ئەودا کەڵەکە بووە بە لاوە بنێت، وخۆی بگوێزێتەوە بۆ ناوەندی ئەندێشەیەکی بە تەواوەتی جیاواز... ئەو لێکۆڵینەرە کە شێوازی جیلەکانی داهاتوو وەك خاڵی دەستپێك دەگرێتەبەر ناتوانێت لە رابردوی خۆشی تێبگات"[1].

ئەو مەرجەی کە باخ ئۆفن لە مێشکیدا بوو، بە دڵنیاییەوە لە کەسانێکدا کە نکۆڵیان لە سەردەم وچاخی خۆیان دەکرد بوونی هەبوو-ئەوانەی کە لە بەهەشتی ون بووی رابردوو دەگەڕان یان هیوایان بە داهاتوویەکی باشتر هەبوو. بەڵام ڕەخنە لەم سەردەمە تەنها شتێك بوو کە ئەو دوو جەمسەرە دژ بەیەکە، بەڵام لایەنگری تیوری

---

[1] لە کتێبی مافی دایك لە نوسینی باخ ئۆفن

دایکسالارییە تێیدا هاوبەش بوون. جیاوازی بۆچوونی دووگروپی دژبەیەك ئەوە دەگەیەنێت کە جۆراوجۆری توخمە لێك نەچووەکان دەبێت لە خودی تیوری دایکسالاری وئەو بابەتانەدا بێت کە پێیەوە خەریکن. گروپێك لایەنە تیوریکەکە وەك توخمی سەرەکی لە قەڵەم دەدات وگروپەکەی دیکە لایەنێکی تر، کە واتە هەردوو گروپەکە دەتوانن بۆ لایەنگری کردنی خۆیان هۆکاریان هەبێت.

نووسەرە محافیزەکارەکانی وەك بوملر، لە رابردوودا بە دوای ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیاندا دەگەڕان. کەواتە هۆکارەکانی ئەوان بۆ لایەنگری لە دایکسالاری چی بوو؟

ئەنگڵس بە ئامارژە – وڕەخنە لە– لایەنگرانی باخ ئۆفن لە ئلیین، وڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە دەداتەوە. باخ ئۆفن سەبارەت بە ئایین دەڵێت:

"تەنها یەك پاڵپشتی بە هێز بۆ شارستانییەتەکان بوونی هەیە کە ئایینە. هەر بەرز بوونەوە یان دابەزینی بوونی مرۆڤ لە بزوتنەوەیەکەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەم سەرچاوە باڵایەوە سەرچاوە دەگرێت.[1]

بە دڵنیاییەوە ئەم بۆچوونانە تەنها تایبەت بە باخ ئۆفن نین. بەڵام بۆ تیورییەکەی ئەو گرنگییەکی بنەڕەتی هەیە چوونکە بڕوای بە پەیوەندییەکی نزیك لە نێوان ژنان وبیروبڕوا ئایینییەکان هەیە:

" ئەگەر پێویست بێت دایکسالاری مۆر ونیشانەی راهیبی بە نێوچاوانەوە بێت، بە هۆی سروشتی زاتی ژنایەتی، ئەو هەستە قووڵە رۆحانیو ونوقم لە خۆشەویستییە، کە بە ژن وبە تایبەت بە دایك،

---

[1] هەمان سەرچاوە

پیرۆزی ئایینی دەبەخشێت لە سەردەمەکانی هۆڤایەتیدا چالاکتر بوو"[١]

لەم رووەوە باخ ئۆفن تواناکاری ئایینی بە خواستێکی تایبەتی ژنانە وئایین بە نیشانەی تایبەتی دایکسالاری دەزانێت. ئەو ئایین وەك جۆرە عیبادەتێکی ئایینی وئاگاهی لە قەڵەم نادات. یەکێك لە فیکرە پرشنگدارەکانی ئەم خاڵەیەکە هەر بونیادێکی تایبەتی دەروونی مرۆڤ گرێدراوی ئایینێکی تایبەتە- هەر چەندە کە ئەم پەیوەندییە بە پێچەوانە دەزانێت وئەڵێ بونیادی دەروونی لە ئایینەوە سەرچاوە دەگرێت.

لایەنی رۆمانتیك وشاعیرانەی تیوری باخ ئۆفن لە تێگەیشتنی ئەو لە رابردوو باشتر دەردەکەوێت: ئەو خۆشەویستی وبایەخی خۆی، لە پێوانەی فراواندا، بۆ دورترین رابردوی مرۆڤ کە دەتوانێ بیری لێبکاتەوە ئاراستە دەکات. تەنانەت لەوەش گرنگتر، ئەو رێزلێنانی مردۆ بە یەکێك لە سەرەکیترین نیشانەکانی کەلتوری دایکسالاری دەزانێت. باخ ئۆفن لە باسی دایکسالاری باودا لە "لید"ێکدا ئاماژە دەکات کە" دەتوانی لە تێکڕای شێوازەکانی ژیانی نەتەوەیەك لە رێگەی شێوازی هەڵسوکەوتی ئەوان لە هەمبەر مردوکانەوە تێبگەین. رێزدانان بۆ مردوکان لە رێزدانان بۆ باووباپیران ولە خۆشەویستی بۆ نەریت وئایدۆلۆژیای لاگرتوو بۆ رابردوو جیا نابێتەوە"[٢].

---

[١] هەمان سەرچاوە

[٢] هەمان سەرچاوە.

باخ ئۆفن لە ئاماژە ئایینییەکاندا " زەمینەیەکی دایکی"بە ریشەی قووڵی پاڵپشت وجەخت کردنەوە لە سەر بەشی تاریك وکوشندەی ژیان لە سروشتدا لە قەڵەم دەدات، کە لە تایبەتمەندییەکانی ئایدۆلۆژیای دایکسالارییە. بوملر جیاوازی نێوان ئایدۆلۆژیای رۆمانتیك و ئایدۆلۆژیای شۆڕشگەرانە لەم بارەیەدا بەروونی بەیان دەکات.

" ئەگەرکەسێك بیەوێت لە ئەفسانە تێبگات، دەبێ سەبارەت بە هێزی رابردوو هەستێکی قووڵی هەبێت. هەر وەها ئەگەر کەسێك بیەوێت لە شۆڕش تێبگات ومرۆڤی شۆڕشگەر بناسێت دەبێ سەبارەت بە داهاتووی هێزی داهاتوو زانیارییەکی قووڵ بە دەست بهێنێت. بە مەبەستی تێگەیشتن لە چییەتی راستە قینەی ئەم ئایدولۆژیایە تاك دەبێ بە باشی تێبگات کە ئەو تەنها چەمکێك لە مێژوو نییە. لە هەستێکی قووڵ سەبارەت بە داهاتوو دەتوانێ چەمکێکی دیکە لە مێژوو بە دەست بهێنێت، چەمکێك لە هەوڵدانی چالاك وبێوچان، چالاکی وشیارانە وئامانجە شۆڕشگەرانەکان لە خۆ دەگرێت. لەم بۆچوونەی دوایەدا (شۆڕش) مرۆڤی ئازادوبێکۆتوبەند لە هەنووکەدا جێدەگریت وداهاتو لە هیچ دروست دەکات. لە چوارچێوەی یەکەمدا (رۆمانتیك) مرۆڤ لە"تەوەری لە دایك بوون "، لە نێو گواستنەوەی گرێدراوییە خوێنییەکان وداب ونەریتە پێویستەکانی رۆژگاردا گیرۆدە بووە وبەشێك لەو "گشتەیە" کە خۆی لە گوشەیەکی نەناسراوی رابردودا وون کردوە. ئەگەر بەم شێوە ژیان لە برەوو قەدر بکەوێت، مەرگ دێتە ئاراوە. باو و باپیران نەمردون وبۆ هەمیشە لەم دونیایە

کۆچیان نەکردوە، هێشتا بوونیان هەیە ودرێژە بە ئامۆژگاری وکارەکانی خۆیان دەدەن لە کۆمەڵگای رابردوی خۆیاندا "[1]

لە تێگەیشتنی باخ لە بونیادی دەروونی لە دایك سالاری وبڕوا بە رۆح وهۆکاری سەر سوڕهێنەر – کە لە گەڵ ئەوانەدا پەیوەند دراوە – خاڵی سەرەکی روبەرو بوونەوەی هەڵس وکەوتی کۆمەڵگای دایك سالاری لە گەڵ سروشت وئاراستەکەی سەبارەت بە شتە مادییەکان لە هەمبەر راستیە مەعنەوی و رۆحانییەکانە.

"دایك سالاری لەگەڵ ئەو بەشە لە ئایین وپلەی کامڵ بوونی ئایینی پەیوەندی هەیە کە تەنها ئاماژە بە ژیانی جەستەیی دەکات " ...

" سەرکەوتنی باوك سالاری ئازادی رۆح لە نیشانە کانی سروشت پێش کەش دەکات، کە هەمان بالا بوونی، بوونی مرۆڤە بە سەر یاساکانی ژیانی مادیدا. لە حاڵیکدا بنەمای دایك سالاری لە تێکڕای ژیانی مادیدا بەر بەلاوە، مرۆڤ لە پێگەی بالاتری خۆی کە لەگەڵ هێزی بەرهەم هێنان وخولقاندایە، زەنجیرەکانی گرێدراوی وپەیوەندی خۆی دەپچڕێت ولەو دەنگە بالایە کە بانگی دەکات ئاگادار دەبێتەوە. ژیانی رۆحی لە بوونی جەستەیی بەرزتر دەبێتەوە وپەیوەندی لە گەڵ بەشی نزمی بوون بە جەستە سنووردار دەبێتەوە. دایك سالاری پەیوەندی بە رەهەندی جەستەیی مرۆڤەوە هەیە، تەنها شتێك کە لە هەبوونی دا لە گەڵ گیانلە بەرانی دیکەدا هاوبەشە، بنەمای" دەروونی – باوکی " تەنها

---

[1] . لە کتێبی ئەفسانەکانی رۆژهەلات ورۆژ ئاوا لە نوسینی باخ ئوفن.

مــرۆڤ دەگرێتــەوە. بــەم بنەمایــە مــرۆڤ خــۆی لــە کۆتوبەنــدی خــاك ( نیشتمان ) رزگار دەکات و چاو دەبڕێتە شوێنە بالآکانی گەردون".[1]

لەم روەوە دو نیشانەی تایبەت پەیوەندی کۆمەڵگای دایك سالاری لە گەڵ سروشتدا دیاری دەکات: قەبووڵ کردنی کاریگەری سروشت، دان پێدانان وقەبووڵکردنی بەها سروشتی وبیولۆژیکەکان، یان دژایەتی لە گەڵ بەها مەعنەوییەکان. سروشتیش وەك دایك کەلتورێکی دایك سالارییە ومرۆڤ هەمیشە وەك منداڵێکی داماوە لە هەمبەر سروشت:

"ئەگەر کەلتوری دایك سالاری بە مادیات سنوردار بکەینەوە، لە کەلتوری باوك سالاریدا گەشە کردن وکامڵ بوونی مەعنەوی ورۆحی بوونی هەیە. لە یەکەمیاندا ڕەوا بونێکی ناوشیارانەمان هەیە ولە دوهەمدا تاك گەرایی. لە یەکەمینیاندا خۆمان دەدەینە دەست سروشت ولە دوهەمیندا لە بەرزبوونەوە لە سروشت هەست بە بالا بوون دەکەین و لەمپەرە کۆنەکان تێك دەشکێنین، هەوڵدانی پرۆمتوس ئاسا، لە باتی ئوقرەیی هەمیشەیی دادەنێین، بە بەردەوامی هەست بە چێژی هێور کەرەوە دەکەین وهاوکات لە گەڵ گەشە کردندا لە دونیای منداڵیدا پیاسە دەکەین. لێبوردەیی وفیدا کاری دایك لە ئایینی "دیمیتر"[2] کە چارەنووسی تۆوە چاندنییەکانە بەرجەستە کراوە."پیاوی یونانی"[3] ئیدی دەیەوێت هەموو شتێك بە دەست بهێنێت، تەنانەت ئەو شتەی کە

---

[1] . لە کتێبی "ئەفسانەی ئایین ومافەکانی دایك"

[2] . Demeter خوا وەندی بەرەکەتی خاك لە میتولۆژی یوناندا

[3] . Hellenic man

لە ئاسمانە کاندایە، ئەو لەم هەوڵدان وکۆششەدا لە سروشتی پیاوانەی خۆی ئاگادارە وخۆی لە مادە گەرایی کەماویەك جەستە ورۆحی داگیر کردبوو دەرباز دەکات وئێدی بە دوای ئەو ئاوی ژیانە دا ناگەڕێت کە لە ژنەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵکوو هەنووکە لە داهێنەری پیاودا لەو کانییە دەگەڕێت، وئەوە کە ماویەك تەنها هی دایك بوو تەسلیمی باوك دەکات.[1]

سیستەمی بەهای کەلتوری دایکسالاری بەم زانستە هەڵچوون ئامێزە بە دایك، سروشت وخاك رۆڵی سەنتەری هاوئاهەنگی ئەوانە. تەنها ئەو شتە بە نرخە کە سروشتی وبیولۆژیکییە، وئەوەی رۆحی وکەلتووری وعەقڵی بێت بە کەڵك نایەت. باخ ئۆفن ئەم هێڵە بیرکردنەوەی لە مەبەستی خۆی لە دادپەروەری روونتر وکامڵتر کردوە. بە پێچەوانەی یاسای سروشتی بورژوازی، کە تێیدا سروشت هەمان کۆمەڵگەی باوکسالاری رەها ودیکتاتۆرانەیە، لە یاسای سروشتی دایك سالاریدا بەها غەریزی، سروشتی وخوێنییەکان بالاترن. لە یاسای دایکسالاریدا هیچ هاوسەنگییەك لە نێوان تاوان وسزادا بوونی نییە، بەڵکوو بنەچەی سروشتی (قصاص) بالادەستە. رێزوحورمەتی تایبەتی پەیوەندی خوێنی لە " یاسای سروشتی" دایکسالاری لە لایەن باخ ئۆفنەوە لە شرۆڤەی خۆی سەبارەت بە "ئورسیتا"[2] لە نوسینی "ئاسکیلۆس"[3] بە روونی بەیان کراوە.

---

[1] لە کتێبی میتولۆژی خۆرهەلات وخۆراوا لە نوسینی باخ.

[2]. Oresteia

[3] Aeschylus. شاعیرو درامنوسی یونانی کۆن

کلیتمنسترا[1] بە بۆنەی دۆستەکەی خۆی "ئاگیستۆس"[2] مێردەکەی "ئاگامنمون"[3] ی لە کاتی گەڕانەوە لە تراژان[4] کوشت. ئورستز[5] کوڕی ئاگامنمون وکلیتمنسترا تۆڵەی ئەم تاوانەی بە کوشتنی دایکی کردەوە. ئەرینیس[6] خواوەندی دایکی، کە ئیدی بن کەوتبوو بە بۆنەی ئەم تاوانەوە، ئورستزی ڕاو نا، بەڵام ئیدی ئەم کوڕە لە لایەن خوا تازەکانی باوکسالاری سەرکەوتوو – ئاپۆلۆ وئەسینا– پشتیوانی لێدەکرا، ئەوان لە نێو سەری زیوسدا دروست ببوون نەك لە منداڵدانی دایکدا!! ناکۆکی سەرەکی لێرەدا چییە؟ لە ڕوانگەی یاسای دایکسالارییەوە تەنها تاوانێك ڕووی داوە: سەرپێچی لە یاسای پەیوەندی خوێنی. ئیرینس، خواوەندی دایك، لە ژنە تاوانبارەکە ناگەڕێت چوونکە " ئەو پەیوەندی خوێنی لە گەڵ کوژراوەکەدا نەبووە". خەیانەت بە مێرد هەرچەندەش ناشیرین بێت، ئیرینس بایەخی پێنادات، بەڵام کە کەسێك لە یاسای پەیوەندی خوێنی سەرپێچی بکات، هیچ پاساودانێکی لۆژیکی ناتوانێ تاوانبار لە قصاصی توند وبێ بەزەییانەی سروشت ڕزگار بکات.

حکومەتی ژنان[7] لە هەرێمی خۆشەویستی وپەیوەندی خوێنی، و" حکومەتی پیاوان لە هەرێمی کاری وشیارانە وبە پلاندایە. سنووری

---

(١). Clytemnestra

(٢) .Agisthus

(٣) .Agamemnon

(٤). Trajan

(٥) .Orestes

(٦) . Erinyes

(٧) .Gynecocracy

حکومـــەتی ژنـــان نـــەریت، زاوزێ وژیـــان بـــە پەیوەنـــدی خـــوێنی وخولقاندنە."[1] ئەم سنووورە لە واتایەکی رێك وپێك لـە نوسینەکانی باخـدا بـە کـار هـاتووە. چـەمکی نادیـاری سروشـت وشـێوازی " سروشـتی" ژیـان شـوێنی خـۆی داوەتـە وێنـەی رێـكوپێکی دایـك وسیسـتەمێکی یاسـایی دایکسـالاری کـە لـە لایـەنی ئەزموونییـەوە شایستەی خستنە روویە.

باخ ئۆفن تەنها بەشداری ئایدۆلۆژیای سروشت تەوەری رۆمانتیست نییە. ئەو یەکێك لـە سودبەخشـترین بۆچوونەکانی رۆمانتیزمی وەك تەوەری کاری خۆی هەڵبژاردوە ولەوەی کە لە فەلسەفەی رۆمانتیکدایە بەرزتری کردوەتەوە وکاملی کردوە. وئەو بۆچوونە جیاوازی نێوان نێر ومێیە، کە لەلایەنی چییەتی ئورگانیك، رۆحی، دەروونی وعەقلی دوو چۆنایەتی بە تەواوەتی لێك جیاوازن. بەم چەمك خولقاندنە، رۆمانتیك ( وچـەند ئیـدەیالیزمی ئـەڵمانی) بـە تونـدی لـە هەمبـەر بۆچـوونە بایەخدارەکانی ڕای گشتی لە سەدەی ١٧و١٨بە تایبەت لە فەرەنسا سەری هەڵدا.

خـاڵی سـەرەکی تیۆرییـەکانی رابـردوو لـەم رەسـتەیەدا کـۆ دەبێتەوە:" رۆح ڕەگەزی نییە". لە گەلێك کتێبدا لـە سەر پەیوەندی ژن وپیـاو لێکۆڵینـەوە کراوە ودەرئەنجامی هەموویان چوون یەك بووە. نێرومێ نوێنەری چۆنایەتی گەلێك نین کە بە شێوەیەکی دیاریکراو لە عەقڵ وناخدا ریشەیان داکوتابێت. هەر جۆرە جیاوازییەکی رۆحی کە

---

[1] لە ئەفسانەی خۆرهەلات وخۆراوا

ڕەنگە لە نێوان ژنان وپیاواندا بە دی بکرێت، تەنها وتەنها بە گوێرەی پەروەردە وبارهێنانی ئەوان پێناسە کراوە. هەر ئەم هۆکارەیە کە ژن وپیاوی لێك جیاکردوەتەوە، هەچەند کە ئەم جیاوازی وناکۆکییانە لە ژیانی کۆمەڵایەتیشدا بێت.

وێنای کۆن سەبارەت بە دوو ڕەگەز لە گەڵ خواستی سیاسیدا پەیوەندیەکی بە تەواوەتی نزیکی هەیە، کە بە ئەو پەڕی پلەی جیاوازییەوە لە شۆڕشی بورژوازیدا ڕۆلێکی گرنگ دەگێڕێت. ئەو مەبەستەش ئازادی ژن ویەکسانی کەلتووری، کۆمەڵایەتی وسیاسی ئەو بوو. بە باشی دەتوانین ببینین کە چۆن تیوری وهۆکاری سیاسی لەم بارەیەدا پێکەوە گونجاون. تیوری یەکسان بوونی ژن وپیاو بوو بە بنەمای چاوەڕوانی ژنان بۆ یەکسانی سیاسی لە گەڵ پیاوان. بەڵام یەکسانی ژن وپیاو چە بە شێوەی ئاشکرا چە نائاشکرا، بەم واتایە بوو کە ژن لە کۆمەڵگەی بورژوازیدا وەك پیاوە. کە واتە چەمکی ئازادی ئەمە نەبوو کە ژن لە کاملکردن وفراوان کردنی هێز وتایبەتمەندییەکانی خۆی، کە هێشتا نەناسراو مابوونەوە، ئازادە، بە پێچەوانەوە ژن ئازاد دەکرا تا وەك پیاوێکی بورژوای لێبێت. ئازادی " مرۆیی" ژن لە ڕاستیدا ئازادی ئەو بۆ بوون بە پیاوێکی بورژوا بوو.

لە گەڵ فراوانبوونی سیاسەتی کۆنەپەرستانە گۆڕانکارییەك لە نێوان دوو ڕەگەزەکە و"سروشتدا" هاتە ئاراوە. لە ساڵی ١٧٩٣ یانەکانی ژنان لە پاریس داخران. تیوری بنەڕەتی شۆناسی دەروونی شوێنی خۆی دا بەم بڕوایە کە لە نێوان دوو ڕەگەزدا جیاوازی بنەڕەتی وهەتایی بوونی هەیە.

لە بەرهەمە رۆمانتیکەکانی دیکەدا چەمکی جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ژن وپیاودا، بە ئاماژە بۆ پرسە مێژوویی، کۆمەڵناسی، میتۆلۆژی و فیزیۆلۆژیکەکان، زیاتر توێژینەوەی لە سەر کرا. لەم بەرهەمانەدا، بە پێچەوانەی ئیدەیالیزمی ئەڵمانیا ورۆمانتیزمی سەرەتایی چەمکی وشەی ژن تا ڕادەیەك تووشی گۆڕان بوو، لە حاڵێکدا پێشتر وشەی ژن واتای خۆشەویستی لە مێشکدا بەر جەستە دەکرد وزەواج ولێك نزیکبوونەوە گرێدراوی ئەزموونی جەستەیی بوو، ئەم وشەیە وردە وردە بوو بە چەمکی دایك وپەیوەندی لە گەڵ ئەودا گەڕانەوە بۆ سروشت وژیانی پێکەوە گونجان لە منداڵدانی سروشتدا بوو.

چەرخی رووناك گەری، نکۆڵی لەجیاوازی جنسی لە رۆحدا دەکرد و لافی یەکسانی نێوان دوو رەگەزی لێدەدا و مرۆوایەتی لە گەڵ پیاوی بورژوا دا یەکسان دەدیت. ئەم تیورییە ئاماژە بە هەوڵدانی ئەو سەردەمە بۆ دانی ئازادی کۆمەلایەتی بە ژنان ویەکسانی لە گەڵ پیاواندا دەکات. کاتێك کومەڵگەی بورژوازی دەستکەوتەکانی خۆی توکمە کردو لە هەلوێستە سیاسیە پێشکەوتووەکانی خۆی پاشەکشەی کرد ئیدی پێویستی بە یەکسانی ژن وپیاو نەما، بەڵکوو خوازیاری خستنە رووی جیاوازی وناکۆکییە سروشتییەکان بوو . تا بتوانێ بنەمایەکی تیوریکی بۆ نایەکسانی کۆمەلایەتی دوو رەگەزەکە لە بەردەستدا بێت. بەلام لە حاڵێکدا تیوری نوێ لە لایەنی دەروونناسییەوە قووڵتر دەبوو، هەندێك وشەی جوان سەبارەت بە

شکۆمەندی ژن بە کار هات کە تەنها بە مەبەستی پاراستنی پێگەکەی لە پۆستی خزمتکاری پیاودا بوو.

هەوڵدەدەم لە لاپەڕەکانی داهاتوودا نیشان بدەم کە بۆچی وچۆن کۆمەڵگەی چینایەتی بەم شێوەیە لە گەڵ حکومەتی پیاو لە بنەماڵەدا پەیوەند دراوە. یەکەم: دەبێ بڵێین کە هەر تیوریی‌ەك کە جیاوازی گشتی دوو رەگەز دەخاتە روو، بە توندی پەنا دەباتە بەر پاڵەوانە نێرەکان( یاسای چینایەتی زەنجیرە پلە ) یەکێك لە هۆکارەکانی خۆشەویست بوونی باخ ئۆفن لە بلۆکی‌محافیزەکاران لەم خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە. بەلام پێویستە بەبیری بهێنینەوە کە باخ ئۆفن بە دۆزینەوەی بنەمای جیاوازییەکانی نێوان ژن وپیاو، بە شێوەیەکی رادیکاڵ، وبە دۆزینەوەی بونیادی کەلتووری وکۆمەلایەتی کۆن کە تێیدا باڵا بوونی دەسەلاتی ژن دەبینرا، بە شرۆڤە کردنێکی کۆنە پەرەستانە لە تیوری خۆی‌دا سەرکەوتنی بە دەست هێنا.

یەکێك لە لایەنە سەرەکییەکانی چەمکی رۆمانتیك ئەمەیە کە جیاوازی نێوان دوو رەگەز وەك ئەو شتەی کە لە کۆمەڵگەدا مەرجی( شەرتی ) بوەتەوە یان وردە وردە کامڵ بووە ، نەبوو ، بەڵکوو راستییەکی بیولۆژیکی لە قەڵەم دەدرا کە قەت گۆڕانکاری بە سەردا نەدەهات. تا ڕادەیەك بۆ سەلماندنی سروشتی راستەقینەی چۆنایەتییەکانی نێر ومێ کەمتر هەوڵدراوە، هەندێك، کارەکتەری ژنی بورژوایان وەك نیشاندەری، جەوهەری ئەو لە قەڵەم دەدا. هەندێکی دیکە تێگەیشتنێکی رووەکییان لە جیاوازی نێوان ژن وپیاو هەبوو: بۆ

نموونە" فیختە " لەو بڕوایەدا بوو کە تێکڕای جیاوازییەکان لە سەر بنەمای جیاوازییە (سروشتییە) کانی هەڵس وکەوتی جنسی ئەوانە.

رومانتیکە تازەکان"ژن " یان بە"دایک " بوون لە قەڵەم دا، بەڵام ئەوانیش لە دەرئەنجامە گرنگەکان پاشگەز بوونەوە وخەریکی توێژینەوەکانی ئەزمونی بنەچەی دایکانە، لە راستینەی بیولۆژیکی ومێژوویی بوون، و بەم کارەوە قولاییەکی لە رادەبەدەریان بە چەمکی دایک بەخشی. بە تایبەت باخ ئوفن، هەرچەند کە خۆشی تاڕادەیەک پشتی بە " سروشتی بوونی " جیاوازی نێوان ژن وپیاو دەبەست بەڵام لە هەمانحاڵدا گەلێك شتی تازەی دۆزیەوە. یەك لەوانە ئەمە بوو: کە سروشتی ژن لە "کار " راستەقینەی ئەو لە ژیاندا سەرچاوەی گرتوە – پاراستنی سەرەتایی منداڵ کە کارێکی بیولۆژیکییە.

ئەم راستیە، وراستیەکانی دیکە کە باسمان لێوە کرد، نیشان دەدات کە زۆر دژوارە کە باخ ئوفن بە رۆمانتیکێکی سەرسەخت لە قەڵەم بدەین – وەك کلاگس وبوملر کە رۆمانییکی سەرسەخت بوون . بە شێوەیەك کە دەبینین لە نێوان کۆمەڵگای "بەختەوەر" ی دایك سالاری باخ ئوفن لە گەڵ ئامانجەکانی سوسیالیزم رێژەیەك لە نزیکی بوونی هەیە. بۆ نمونە بایەخ دان بە ئاسایشی مادی مرۆڤ وخۆشحاڵی دنیایی یەکێك لە بیروبڕوا سەرەکییەکانی کۆمەڵگای دایك سالاری لە قەڵەم دراوە. لە خاڵەکانی دیکەش دا راستینەی کۆمەڵگای دایك سالاری، بە گوێرەی پێناسە کردنەکانی باخ ئۆفن، گریدانێکی نزێکی لە گەڵ ئامانجە کانی سوسیالیزم دا هەیە و دژی ئامانجە کۆنە مێژووییەکان لە قەڵەم دەدرا و تێدا پەیوەندی جنسی لە سوکایەتی مەسیحییەت بەدوور بوو، خۆشەویستی ومیهرەبانی دایکانە یەکێك لە بنەما ئاکارییە

دەسەڵاتدارە کانە و زیان گەیاندن بە هاوچەشن تاوانێکی گەورەیە، لەم کۆمەڵگایەدا هێشتا موڵکییەتی تایبەت پێك نەهاتووە.

کیلس کراتز[1] تایبەتمەندی کۆمەڵگای دایك سالاری بە گەڕانەوە بۆ ئەفسانەی داری پڕ میوە وبەهاری موعجیزە ئاسا وەسف دەکات : هەر کە پیاوان ئەوانیان کردە موڵکی تایبەتی خۆیان دارەکە سیساو وبەهاربوو بە گەلاریزان.

باخ ئوفن چەندین جار، نەك هەمیشە،بە بیرمەندێکی دیالیکتێك خۆی دەنوێنێت. سرنج بدەنە ئەم ئامارژەیە: " تێگەیشتن لە چۆنییەتی حکومەتی ژنان لە ئایینی دیمیتری‌دا پێویستی بە بایەخ دان بە رەوشی نالە بارو نەپڕاوی سەرەتاییە کە دژی بنەماکانی ژیانە لە رێبازی "دیمیتر"دا. لەم روەوە راستینەی مێژوویی دایك سالاری شاهیدێکە لە سەر راستینەی مێژوویی " خۆشەویستی ژنان"[2]. فەلسەفەی باخ ئوفن لە گەلێك لایەنەوە لە فەلسەفەی هیگل نزیکە:

"بەرزو بڵند بوونەوەی مرۆڤ لە تێگەیشتنی دایکانە بۆ تێکەیشتنی باوکانە ، گرنگترین خاڵە لەمێژووی پەیوەندی نێوان دو رەگەزدا. ئێمە لە پشت بەستنی خۆمان لە سەر تایبەتمەندییەکانی باوك جەوهەری مرۆڤ لە دیاردەی سروشت جیادەکەینەوە ولە هەڵس وکەوتی بڵندی باوکانەدا، ئێمە بوونی مرۆڤ لە یاسا جەستەییەکانی ژیان بەرزتر دەکەینەوە.[3]

---

[1] .Kelles Krauz

[2] Hetaerism خۆشەویستی ژنان بۆ پیاوێکی‌تر جگە لە مێردەکەیان( یان پەیوەندی جنسی لە گەڵ پیاوێکی دیکە)

[3] کتێبی ئەفسانەکانی خۆرهەلات وخۆراوا لە نوسینی باخ ئۆفن.

بی بڕوای باخ ئۆفن ئامانجی بڵندی مرۆڤ " بەرزبوونەوەیە لە ژیانی خاکی بۆ خۆشی ئاسمانی بنەمای باوکسالارانە"[1]. ئەو سەرکەوتنی بنەچەی رۆحانی بوونی باوك بە سەر بنەچەی مادی دایکدا، کە لە لایەنی مێژووییەوە بە زاڵبوونی رۆم بە سەر خۆرهەڵاتدا – بە تایبەت بە سەر کارتاژ وئورشەلیم دا– دەستەبەر بوو ، دەبینێت.

" ئەندێشەی رۆمی ئەوروپای هاندا کە مۆری خۆیان لە سەر ئەم گۆی زەوییە بدەن. ئەندێشەکە ئەمە بوو: تەنها یاسای ئازادی مەعنەوی، نەك یاسای مادی، چارەنووسی خەڵك دیاری دەکات[2]".

ئاشکرایە کە ناکۆکی قووڵ لە نێوان ئەو باخ ئۆفنەی کە بە دیموکراسی حکومەتی ژناندا هەڵدەڵێ وباخ ئۆفنی ئاریستیوکراسی شاری" بال" کە دژی ئازادی سیاسی ژنان بوو، بوونی هەیە. ئەو لە نموونەیەکدا دەڵێ:" گوشار لە سەر بارودۆخ هەمیشە دیموکراسی دەکاتە دیکتاتۆری، ئامانج کۆمار وحکومەتێکە کە لە رێگەی باشترین خەڵکەوە بە رێوە دەچێت، نەك زۆرترین خەڵك". لە ئاستە جۆراوجۆرەکانیشدا هەندێك ناکۆکی بەرچاو دەکەوێت. لە ئاستی فەلسەفیدا بیروبڕوای پرۆتستانەکان وئیدەیالیستەکان دژی رۆمانتیکەکانە وفەیلەسوفەکانی دیالیکتیك دژی خواگەرا سروشتگەراکانن. لە ئاستی کۆمەڵایەتی وسیاسیدا دژە دیموکراسییەکان دژی لایەنگری بونیادی کۆمەڵایەتی کومونیست–

---

[1] هەمان سەرچاوە

[2] هەمان سەرچاوە

دیموكراتیكن. لە ئاكاریشدا، لایەنگرانی ئاكاری پرۆتستان–بورژوا، دژی لایەنگرانی رەوشتی كۆمەڵایەتین كە تێدا ئازادی پەیوەندی جنسی زاڵە نەك یەك هاوسەری.

بە پێچەوانەی گلاكس وبوملر، باخ ئۆفن بۆ هاوئاهەنگ كردنی ناكۆكییەكان هەوڵ نادات. ئەم شێوازە یەكێك لە هۆكارەكانی خۆشەویست بوونیە لە لایەن سۆسیالیستەكاندا كە بە دوای سەراوبن بوونی تەواوەتی كۆمەڵایی‌تی و دەروونیدا ودەرووندا دەگەڕێن ، نەك ریفۆرم وچاكسازی .

ئاشكرا كردنی ئەم ناكۆكییانە و نەشاردنەوەیان، پەیوەندی بە هەل‌ومەرجی دەروونی وئابووری ژیانی باخ ئۆفنەوە هەیە. فراوانی رەهەندی مرۆیی وعەقڵی ئەو جێگای سرنج وبایەخە، بەڵام لایەنگری ئەو لە دایكسالاری رەنگە لە گرێدراوی لە رادەیەدەری ئەو بە دایكی سەرچاوە بگرێت. باخ ئۆفن تا تەمەنی ٤٠ساڵی –تا مردنی دایكی– زەواجی نەكرد. دیسان میراتێكی ١٠ ملیۆن دۆلاری بوو بە هۆی ئەوەی كە لە هەندێك لە ئامانجەكانی بورژوازی دوربكەوێتەوە، ئەم دوورر كەوتنەوەیە پێویستییەك بوو بۆ لایەنگرانی دایك سالاری. لە لایەكی ترەوە ئەم كوڕە دەوڵەمەندەی خەڵكی بال بە شێوەیەك لە سەنگەری نەریتی باوكسالارانەی خۆیدا جێگیر ببوو كە نەیدەتوانی جگە لە ئامانجە نەریتییەكانی پرۆتستان– بورژوا بیر لە هیچ ئامانجێكی دیكە بكاتەوە. رۆمانتیكە نوێكان، وەك شولر، گلاكس، بوملر، تەنها باخ ئۆفنێكیان دەدەیت كە دژە عەقڵ، مل كەچ بە سروشت ویاسای تایبەتی بەها سروشتگەراكانی گرێدراوی پەیوەندی خوێنی وخاكی

بەرەودار بوو. ئەوان پرسی ناکۆکییەکانی باخ ئۆفنیان بە شرۆڤەکردنێکی یەك لایەنەی تیورییەکانی چارە سەرکرد[1].

---

[1] کلاگس کە خۆگەرایی بۆ رۆح بە زیانبار دەزانی پرسەکە بەم جۆرە دەخاتە روو کە ئامۆژگارییە سروشتگەرایانەکەی باخ ئۆفن ناوك وسەنتەری ئەندێشەکانی ئەوە وئیدەیالیزمی پرۆتستانی ئەو لاوەکییە. بوملر کە شرۆڤەکەی کلاگسی بە لاوە پەسەندە ، زیاتر ئەندێشەی باخ کەم وکورت وناشیرین دەکات، لە حاڵێکدا کلاگس لانی کەم باخ ئۆفنی دژی پرۆتستان ودژە ئیدەیالیزم دەبینی، بوملر لە ڕوانگەی باوکسالارانەی ئەوەوە باسەکەی دەستپێکردوە وگرنگترین کاری باخ ئۆفن بە لاوەکی وکەم بایەخ لە قەڵەم دەدات. واتە گوتە مێژوویی ودەروونناسانەکانی ئەو سەبارەت بە دایکسالاری، وروخساری ژن وەك بازنەی سەرەکی پەیوەندی نێوان زۆربەی ئورگانە شارستانییەکان رەد دەکاتەوە. لە روانگەی بوملرەوە نەبوونی نەریتی یەك هاوسەری لە دەستپێکی مێژووی مرۆڤایەتی گومانناوییە ودایکسالاری وەك راستینەیەکی مێژوویی، بابەتێکی لاوەکییە:

"گرنگی ئایینی پەرەستش کردنی خواوەندی خاك بۆ تێگەیشتن لە سەردەمەکانی بەر لە مێژوو هێشتا وەك خۆیەتی، تەنانەت ئەگەریش بسەلمێت کە قەت دایکسالاری هیندو ئەوروپی بوونی نەبووە. شرۆڤەکانی باخ ئۆفن بە تەواوەتی لە دۆزراوە زانستییە کانی ئاکار وزمان ناسی سەربەخۆیە، چوونکە لە سەر بنەمای تیورییە مێژوویی وکۆمەڵناسییەکان نییە...بنەمای فەلسەفەی مێژوویی باخ ئۆفن لە سەر زانیاری میتافیزیکی وی دامەزراوە. قووڵی ئەم زانیارییە خاڵی سەرەکییە. دەتوانین بە ئاسانی لە هەڵەی ئەو لە فەلسەفەی کەلتوور( هەلە کۆمەڵناسیی ومێژووییەکانی ) تێبگەین. تویژینەوەیەکی زانستی بە تەواوەتی دوور لە هەڵەیە، شتێك بۆ راستکردنەوە وهەڵەبڕی ناهێڵێتەوە، بەڵام دەرئەنجامێکی بە نرخیش بە دەستەوە نادات. ئەفسانەکانی خۆرهەڵات وخۆراوا).

باخ ئۆفن بە گرێدانی پێشکەوتنی سەرەتای مرۆڤایەتی بە ژن لە تیوری خۆیدا زێدەرەویی کرد، بوملر دەڵێ: ئەمە تیورییەکی درۆینەیە. بابەتی گرنگ تێگەیشتن لە دایك وەك دیاردەیەکی گرنگی دەروونی وکۆمەڵایەتی نییە، بەڵکوو باڵابوونی ئایینی دایکە کە باخ ئۆفن لە ڕێگەی ئەوەوە ئاگاهی مرۆڤایەتی، بە تایبەت فەلسەفەی مێژوویی، بەهێز ودەوڵەمەند کردوە. ئەگەر بوملر ئارەزۆ جنسییەکان وەك مۆدێلێکی خۆرهەڵاتی مەحکوم دەکات جێگای سەرسوڕمان نییە، لە حاڵێکدا باخ ئۆفن وەك ئاماژەیەکی سەرەکی دایك سالاری لە قەڵەمی دەدات، بێ پەرردەیی ئەو لە پرسە جنسییەکان بێ گەردی ئەو بەیان دەکات.

سوسیالیستەکانیش دان بە عیرفانی باخ ئۆفن دادەنێن، بەڵام زیاتر بایەخ دەدەنە باخ ئۆفنی دەروونناس ونەتەوەناس( ئەتنۆلۆژیست)[1].

فردریك ئەنگلس، زیاتر لە هەر کەسێکی دیکە لە سەدەی ١٩دا کارەکانی باخ ئۆفنی ناساند. ئەو لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی " بنەچەی بنەماڵە ومولکییەتی تایبەت ودەوڵەت " جەخت دەکاتەوە کە مێژووی بنەماڵە لە مافی دایکی مەبەستی ئۆفنەوە دەست پێدەکات. ئەنگلس لە پێگەی ئیدەیالیستی ئۆفن، کە دەڵێ: پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان لە ئایینەوە سەرچاوە دەگرێت رەخنە دەکات ودەڵێ:

" بەلام هیچکام لەمانە لە گرنگی کارە سەرەتاییەکانی ئەو کەم ناکاتەوە . ئەو یەکەمین کەس بوو کە پەیوەندی جنسی دەرەوەی یاسا ورێسای لە شوێنی پەیوەندی سەرەتایی نادیار ولێڵ دانا. باخ ئۆفن دوپاتی دەکاتەوە کە ئەدەبیاتی کلاسیکی کۆن نیشان دەدات کە بەر لە یەك هاوسەری شێوەیەکی دیکە لە نێو یۆنانی وئاسیاییەکاندا باو بووە. لەو بار و دۆخەدا نەتەنها پیاو لە گەڵ زیاتر لە یەك ژن پەیوەندی هەبووە، بەڵکوو ژنانیش لە گەڵ زیاتر لە یەك پیاو پەیوەندی جنسییان هەبووە و ئەم کارە پێچەوانەی ئاکاری گشتی ئەو سەردەمە نەبووە. دیسان ئەو نیشانی داوە کە مندالآن ناو نازناویان لە دایکیانەوە وەرگرتووە نەك لە باوکەوە، ئەم هێڵە تایبەتە تا ماوەیەکی درێژخایەن وەك خۆی مایەوە– تەنانەت لە سەردەمی یەك هاوسەریشدا کە باوك ناسراو بوو، ئەم پێگە سەرەکییەی دایك، کە تەنها بەرپرسی"

---

(١). Ethnalogist

بێ قەيد ومەرجی" منداڵ بوو، بۆ دايكان و"هەروەها ژنان" لە ڕوانگەی كۆمەڵايەتييەوە پێگەيەكی باشتر وبالاتری خولقاند كە تا هەنووكە برەوی ماوە. باخ ئۆفن ئەم تيۆرييە بە ڕاشكاوی بەيان ناكات، چوونكە تايبەتمەندی عيرفانی ئەو ڕێگەی پێنادات. بەڵام ئەو خولقێنەری ئەم تێزەيە كە لە ساڵی ١٨٦١دا هەنگاوێكی شۆڕشگەرانە لە قەڵەم دەدرا".

شانزە ساڵ دوای ئەو لويس مۆرگان، ئەكۆلۆژيستی ئەمريكی، بونيادێكی كۆمەڵگای دايكسالاری ديكەی خستەروو وشێوازێكی بە تەواوەتی جياوازی لە باخ بە كار هێنا. ماركس وئەنگلس كتێبەكەی ئەويان بە ناوی "كۆمەڵگەی دێرين" بە وردی لێكدايەوە و ئەم كتێبە بوو بە بنەمای كتێبەكەی ئەنگلس سەبارەت بە بنەماڵە.

ئەنگلس لە شرۆڤە كردنێك سەبارەت بە دۆزينەوەی بنەماڵەی دايكسالاری لە لايەن مۆرگانەوە بەم شێوەيە دەدوێت" گرنگی دۆزينەوەكەی مۆرگان بۆ سەردەمی بەر لە مێژوو هاوسەنگی تيۆرييەكەی دارڤين سەبارەت بە كامڵبوونی بيولۆژيك وتيۆرييەكەی ماركس سەبارەت بە ئابووری سياسييە". ئەنگلس بەم قسەی خۆيە ڕێز وپێزانينی لە ڕادەبەدەری بۆ مۆرگان دەردەبڕێت:" بنەماڵەی دايك سالاری بوەتە تەوەرێك كە تێكڕای زانست وئاگاهی ئێمە بە دەوریدا دەسوڕێتەوە. هەنووكە دەزانين كە دۆزينەوەكانی خۆمان لە كوێدا بە كار بهێنين وچۆن ڕێك وپێك و ڕيزبەندييان بكەين".

دۆزينەوەی دايكسالاری تەنها ئەنگلسی نەخستە بن كاريگەرييەوە. ماركسيش هەندێك تێبينی ڕەخنەگرانەی لە خۆی بە جێهێشت كە دواتر ئەنگلس لە نوسينەكانی خۆیدا بە كاری هێنان.

بنەڕەتی کتێبی پڕفرۆشی "[1]بیبل" بە ناوی " ژن وسوسیالیزم" لە سەر تیوری دایك سالاری دامەزراوە . هەروەها زاوەکەی مارکس بە ناوی( پۆل لافارك )[2]کتێبێکی سەبارەت بە ژن بە ناوی " ڕۆڵی ڕێزداری ژن لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا لە گەڵ پۆستی پارێزگاری کردن وڕەبەنی ڕێو ڕەسمە ئایینییەکان، لە ئەستۆ گرتنی ئەم ڕۆڵە لە داهاتوودا "هەیە. کلس کروتز دەڵێ باخ لە رینسانسی بورژوا تۆوێکی بە نرخی رینسانسی شۆڕشگەرانەی نوێی وە دەست خست: رینسانسی جەوهەری کومونیزم.

بنەمای یارمەتی دانی سوسیالیستەکان بۆ تیوری دایك سالاری چییە؟ یەکەمین هۆکار، بە هەمان شێوە کە پێشتر سەبارەت بە ڕۆمانتیکەکان شرۆڤەم کرد، دوری سۆزداری ئامانجی ئەوانە لە کۆمەڵگەی بورژوازی. باخ ئۆفن ئاماژە بە ڕێژەیی بوونی پەیوندی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی دەکات، وجەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە یەك هاوسەری قەت ئورگانێکی هەمیشەیی" سروشتی" نییە. ئەم بۆچوونە تەنها لە لایەن ئەو تیوری وچالاکی سیاسییەوە پێشوازی لێدەکرێت کە لە گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگەی هەنووکە پشتیوانی دەکرد. لە هەڵوێستی سیاسی باخ ئۆفندا ئەمە خاڵێکی نادیار ولێڵە:

"پەیوەندی دایکانە بە شێوەیەکە کە ناتوانرێت چاوپۆشی لێ بکرێت وبە شێوەیەکی گەرم وگوڕ بە بنەچەی سروشتی مرۆۆ وپێگەی

---

[1] F.A. Bebel سوسیالیست ونوسەری ئەڵمانی(١٨٤٠-١٩١٣)

[2] . Paul lafargve

بڵندی مرۆیی پەیوەند دراوە کە زۆربەی خەڵك وەك پرەنسیپی سەرەکی کارەکان چاوی لێدەکەن. ئەم لافە کە لە سەرەتای بوونی مرۆڤدا پەیوەندی بێ مەرج وقووڵ لە نێوان دوو رەگەزدا بوونی هەبوە ، پێشبینییەکی هەڵە وبێهودە لە قەڵەم دەدرا. چە کەسێك ئەم تیۆرییە گشت پەسەندە قەبووڵ ناکات تا لە بیرەوەری شەرمەزارکەری سەردەمانی سەرتایی ئاسودە ببێت؟ بەڵام بەڵگە مێژووییەکان ئێمە لە ملکەچ بوون بە لە خۆبایی بوون وخۆپەرەستی، لە دودڵی لە پێشکەوتنی هێدی ودژواری مرۆڤ بەرەو رێورەسمی زەواج رزگار دەکات .[1]

دیسان ناوەڕۆکی تیوری دایکسالاری، بە پێداگری لە سەر رێژەیی بوونی شادەماری کۆمەڵگای بورژوازی، لە لایەن مارکسیستەکانەوە بایەخی پێدرا. چوونکە یەکەم: سەردەمێکی دۆزیبوەوە کە تێدا ژن سەرچاوەی دەسەڵات وسەنتەری کۆمەڵگا بووە ، نەك کەنیزی پیاو وکاڵایەك بۆ فرۆشتن، ئەم پێگەیە پشتیوانییەکی گرنگ لە هەوڵدانی ژن بۆ ئازادی سیاسی وکۆمەڵایەتی بوو. خەباتی گەورەی سەدەی ١٨یەم دەبوایە خەڵکێك وەك بەڵگە کەڵکیان لێ وەر بگرتبایە کە بۆ بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی بێ چین هەوڵیان دەدا.

بونیادی کۆمەڵگای باوکسالاری لە لایەن پابەندییە کۆمەڵایەتی- دەروونییەکانەوە، پەیوەندییەکی نزیك لە گەڵ تایبەتمەندی چینایەتی کۆمەڵگەی هەنووکە هەیە. ئەم کۆمەڵگەیە تا ڕادەیەکی زۆر، لە سەر ئەساسی خواستە دەروونییە تایبەتەکان دامەزراوە کە بەشێکیان لە

---

[1] لە ئەفسانەکانی خۆرهەڵات وخۆراوا

ورووژێنەرە ناوشیارەکاندایە، ئەم خواستانە ناشیرینی رواڵەتی ئورگانی حکومەتی کامڵ دەکەن. بنەماڵەی باوکسالار یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی دروستبوونی هەڵسوکەوتە دەروونییەکان وپارێزگاری مانەوەی کۆمەڵگەی چینایەتییە.

هەنووکە دەچمە سەر گرنگترین بابەت. لێرەدا لە گەڵ کۆمەڵێکی سۆزداریدا سەرقاڵین کە تایبەتمەندییەکانی بریتین لەم توخمانەی خوارەوە: گرێدانی سۆزداری بە هێزی باوك، تێکەڵاوییەك لە دڵەراوکێ کان، خۆشەویستی ونەفرەت، منێکی باڵای بەهێز ودوگم، کە ئەرك لە سەرەوەی شادی وخۆشحاڵی دەبینێت، هەست بە تاوان کە لە ناکۆکی نێوان خۆاستەکانی منی باڵا و پێویستییە راستەقینەکان دروست دەبێت وکاریگەرییەکی تەسلیم وملکەچ بوونە لە هەمبەر سەرچاوەکانی دەسەلات. هەر ئەم هەل ومەرجە دەروونی - کۆمەلایەتییەیە کە بنەماڵەی لە ئاستی جیهاندا پابەند (یان لانی کەم پشتیوانێکی گرنگی ) کۆمەڵگە لە قەڵەم داوە، ودیسان هەربەم بۆنەیەوە کە نارەزایەتی تیوریك لە هەمبەر کۆمەڵگە، وەك تیوری باخ ئۆفن، پشتیوانی بیرمەندانی سوسیالیستی بە دەست هێناوە.

لە بەشە گرنگەکانی پرسی ئێمە وێنەیەکە کە باخ ئۆفن ومۆرگان لە تایبەتمەندییەکانی پەیوەندی کۆمەلایەتی، دەروونی، ئاکاری وسیاسی باوکسالاری کێشاویانە. لە حاڵێکدا باخ ئۆفن بە نارەحەتییەوە سەیری قۆناغە سەرەتاییەکانی رابردوو دەکات وبە لە ناو چوو لە قەڵەمیان دەدات، مۆرگان لە قۆناغێکی سەروتر لە شارستانی دەدوێت کە لە روانگەی ئەوەوە لە داهاتوو دا پەیدا دەبێت:" دەرکەوتنی ئەو شارستانییە وەك گەرانەوەی بنەماڵەی دێرینە،( بنەماڵە لە رۆمی دێرین ) لە گەڵ ئازادی، برایەتی ویەکسانی لە ئاستێکی بەرزتردا." باخ ئۆفن خۆی ئەم ئامانجانەی ئازادی، برایەتی

و یەکسانییە کە دەبوایە لە کۆمەڵگەی دایکسالاریدا هەبوایە، بنەمای زاڵ بە سەریاندا نەك دڵەراوکێ وملکەچ بوون، بەڵکوو خۆشەویستی ومیهرەبانی بە روونی وەسف دەکات[1].

---

[1] پەیوەندی دایك ومنداڵ سەردێری تێکڕای کەلتوورەکان، هەر چاکە وهەر لایەنێکی بە شکۆی ژیانە. ئەم پەیوەندییە لە دونیای زوڵم وزۆردا وەك یاسای ئاسمانی، خۆشەویستی، یەکبوون وئاشتی وئاسوودەییە. ژن بە پەروەردە کردنی منداڵی خۆی، بەر لە پیاو فێری بەڵاو کردنەوەی خۆشەویستی بۆ دەرەوەی چوارچێوەی خۆی و کەسێکی دی دەبێت ، و تێکڕای چاکە خولقێنراوەکانی خۆیلە پێناو پاراستن وکامڵکردنی بوونی ئەو بە کار دەهێنێت. ژن لەم قۆناغەدا مەخزەنی فەرهەنگ، خێرخوازی، فیداکاری، خۆشەویستی ژیان وخەمی مردنە. ئەو خۆشەویستییەی کە لە بوونی دایکێکەوە بڵاو دەبێتەوەنەتەنها توند بەڵکوو تەواو ورەهایە... چوونکە بنەچەی باوکی لە زاتی خۆیدا سنوور دەخولقێنێت وبنەچەی دایکی تەواوە، کەواتە بنەچەی باوکی گروپگەلێکی دیاریکراو لە خۆدەگرێت، بەڵام بنەچەی دایکی وەك ژیانی سروشت سنوور ناناسێت. وێنای زەینی دایك هەستی برایەتی گشتگیر لە زەینی هەمووواندا دروستدەکات کە بە فروانبوونی باوکسالاری لە ناو دەچێت. بنەماڵە بە گوێرەی حەقی باوك ئورگانێکی داخراوە، بەڵام بنەماڵەی دایك سالار خاوەن تایبەتمەندی گەلێکی تەواوە کە لە سەروی تێکڕای کەمالاتەوەیە وژیانی دایکانە لە رێگای ژیانێکی بڵندتری مەعنەوییەوە بێ وێنە دەبێت. منداڵدانی هەر ژنێك وێنەی لە ناو نەچووی ، دیمیتر، خواوەندی بەرهەمدان، بە منداڵان ، برایان وخۆشکان دەبەخشێت، نیشتمان تەنها برایان وخۆشکان دەناسێت وتا رۆژێك کە فراوانبوونی سیستەمی باوکسالاری یەکبوونی جەماوەر لە ناو بەرێتوبنەچەی ناکۆکی لە باتی ئەو سەقامگیر بکات.

کولتوورەکانی دایکسالاری، دەرکەوتن وتەنانەت رێزبەندی گەلێکی حقوقی لەم لایەنەی بنەچەی دایکسالاری دەخەنەروو . بنەچەی باسکراو بنەما وبنەڕەتی ئازادی ویەکسانی رەهای نێوان خەڵکی دایکسالار، خۆشەویستی بۆ هاوڕەگەزەکان وسنووربەزاندنە. ریشەی هەستی دەستخۆشی ئامێزی نزیکی وخزمایەتی، هاودڵی، کە سنوورناناسێت وتێکڕای ئەندامانی نەتەوەیەك بە یەکسانی لە ئامێز دەگرێت، لە هەمان بنەچەی دایکسالاریدایە. وڵاتە دایك سالارەکان بەوە بە ناو بانگن کە کە شەڕ وململانێیان نییە. خەڵکانی دایك سالاررەنج وئازاری مرۆڤ وتەنانەت گیانلەبەرانی دیکەش بە تاوان دەزانن. روخسارێکی دڵسۆزی مرۆیی، تەنانەت لە پەیکەرە میسرییەکانیشدا، ئاماژە بە دونیای کەلتووری دایکسالاری دەکات.

( باخ ئۆفن ،ئەفسانە، ئایین ومافی دایك)

رۆڵــی جیــدی ســرنجدان بــه رازی بــوونی پیــاو لــه کۆمــەڵگای دایکسالاریدا هۆکارێکی دیکەی پێشوازی سوسیالیستەکانە لە باخ ئۆفن، هەرچەند کە لە ئاستی تیوریکدا ئەم ماتریالیزمە سروشت گەرایانە، گرێدراوی فیداکاری ووزەی دایك بۆ باشتر کردنی ژیانی پیاو، لە گەڵ ماتریالیزمی دیالیکتیکدا ناکۆکی بنەڕەتی هەیە، بەڵام ناوەڕۆکی چێژ گەراییەکی کۆمەڵایەتییە کە هۆکاری قەبووڵ کردن لە لایەن سوسیالیستەکانە روون دەکاتەوە.

باس کردنی چەند خاڵێکی گشتی سەبارەت بە بنەچەی ئازادی تەواوەتی پەیوەندی جنسی، کە باخ بە کۆمەڵگەی سەرەتایی لە" حکومەتی ژناندا" گریّ دەدات پێویستە. هەڵبەت ئەگەر بگوترێت سنووورداری لە پەیوەندی جنسی بە شێوەیەکی رەها تایبەتمەندی کۆمەڵگەی چینایەتییە وپەیوەندی جنسی ئازاد کە مەبەستی باخ ئۆفنە تایبەتە بە گۆمەڵگەی بێ چین هەڵەیە. دیسان ئەو رەوشتەی کە چێژی جنسی بە شتێکی خراپ وبێ کەڵك دەزانێت رۆڵێکی گرنگی لە پاراستنی کۆمەڵگەی چینایەتیدا هەیە. وهەر هێرش وناڕەزایەتی دەربڕینێك کە لە هەمبەر ئەم رەوشتە ئەنجام بدرێت وەك هێرشکردنە سەر تیورییەکەی ئۆفن دەبێت بە هۆکارێکی دیکەی خۆشەویست بوونی ئەو لە نێوان سوسیالیستەکاندا.

ئارەزۆ جنسییەکان پێگەگەلێکی سەرەتایی بە هێز بۆ چێژو خۆشی دابین دەکەن. ئەگەر دەرفەتی پێبدرێت تا ئاستی هەرە بەرز( کۆتایی) بۆ گەشەی کەسیەتی مرۆڤ فراوان دەبێت، نەك بە مەبەستی کونترۆڵی جەماوەر سنووردار بکرێتەوە، دەرکەوتنی

خواستی توندی سەبارەت بە دامركاندنی خواستەكانی دیكەی ژیانی لێدەكەوێتەوە. بۆ ئەوەی دامركاندنی ئەم ئارەزۆیانە تەنها بە دەرفەتی مادی مومكین دەبێت، لەم رووەوە دەبێتە هۆی پەرژ وبلاو بوونی سیستەمی كۆمەلایەتی. كارێكی كۆمەلایەتی دیكەش لە چوار چێوەی دامركاندنی جنسیدا بوونی هەیە. مادام كە دامركاندنی بێ سنووری هەستی جنسی تاوان لە قەڵەم دەدرێت، لە حاڵێكدا كە ئارەزۆی سیكسی هەمیشە چالاكە، بەر بەستە ئاكارییەكان دەبنە سەرچاوەی دروستبوونی تاوان كە بە زۆری ناوشیارانەیە ویاخود دەگوێزرێتەوە بۆ زەمینەكانی دیكە.

ئەم هەست بە تاوانە لە لایەن كۆمەلایەتییەوە گرنگە، و ئەویش ئەمەیە كە ئازار دیتن لە تاوانباری، وەك سزا تاقی دەكرێتەوە نەك ئەوەی بە كەم وكوڕی كۆمەلایەتییەوە گرێبدرێت. هەست بە تاوان بە ناچاری ترسی سۆزداری لێدەكەوێتەوە: بەربەلاوی فیكری– بە تایبەت رەخنەگرانەی – خەڵك سنووردار دەكاتەوە، بەلام لە باتی ئەوە گرێدانێكی سۆزداری سەبارەت بە ئاكاری كۆمەلایەتی دروست دەكات. ئەم خاڵە كۆتاییەش زیاد دەكەم كە توێژینەوە دەروونشیكارییەكانی تاك نیشانی داوە كە سەركوت كردن یان قەبووڵ كردنی دامركاندنی ئارەزۆی جنسی كاریگەرییەكی گرنگی لە سەر پاڵنەرەكان وكاراكتەری مرۆڤ هەیە.[1]

---

[1] بگەرێنەوە بۆ بڕگەی ٨

مەرجی کامڵبوونی " کاراکتەری زاوزێیی" بێ بەش نەبوون لە پەیوەندی جنسییە، چوونکە بێ بەشبوون دەبێتە هۆی دابەزینی کامڵبوونی تاك. یەکێك لە چۆنایەتییەکانی گرێدراوی کاراکتەری زاوزێیی سەربەخۆیی دەروونی وفیکرییە، گرنگی چۆنایەتی کۆمەڵایەتی ئەو پێویستی بە جەخت کردنەوە نییە. لە لایەکی ترەوە سەرکوتکردنی ئارەزۆی جنسی زاوزێیی توندبوونەوەی خواستە غەریزییەکانی، ئانال، سادیستیك وهاو ڕەگەزبازی شاراوەی لێدەکەوێتەوە، کە لە بنەمای غەریزی کۆمەڵگەی هەنووکەییدا گرنگییەکی حاشا هەڵنەگری هەیە.

بارودۆخی توێژینەوەی هەنووکەیی لە سەر دایکسالاری هەر چییەك بێت، بە دڵنیاییەوە بونیاد گەلێکی کۆمەڵایەتی بوونیان هەیە کە دەتوانین دایك تەوەر ناوزەدی بکەین. وئەگەر بمانەوێت لە بونیادە کۆمەڵایەتییەکانی هەنووکە وگۆڕانکارییەکان تێبگەین، دەبێ بە دۆزینەوەکانی هەنووکە وداهاتوو ی ئەم توێژینەوانە بایەخ بدەین. هەوڵدان وڕاکێشانە لیبیدۆییەکانی مرۆڤ یەکێك لە " هێزە بەرهەم هێنانەکانی" کۆمەڵگەیە. بە بۆنەی نەرمبوون وگۆڕانکاری، ئەم هێزانە دەتوانن بە شێوەیەکی بەرچاو خۆیان لە گەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتی وئابووری هەیی هاوئاهەنگ بکەن- هەرچەند ئەم هاوئاهەنگییەش سنووردارە. بونیادی دەروونی ئەندامانی گروپێکی کۆمەڵایەتی ئاماژە بە پشتیوانی حاشا هەڵنەگر بۆ سەقامگیری کۆمەڵگە دەکات. هەڵبەت ئەم بونیادە تا کاتێك پشتیوانی لە سەقامگیری دەکات کە ناکۆکییەکانی نێوان بونیادی دەروونی وهەل ومەرجی ئابووری

شاراوە نەبێت، کە لەو حاڵەتەدا هێزە دەروونییەکان یان سیستەمی هەیی سەراو بن دەکەن، یان لە ناوی دەبن. دەبێ لە بیرمان نەچێت کە بونیادە دەروونییەکانی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان دەتوانن لە گەڵ یەکدی جیاواز یان تەنانەت لە هەمبەر یەك بن، ئەم جیاوازی یان لە هەمبەر یەك بوونە گرێدراوی پرۆسەی کۆمەڵایەتییە.

هەر چەند کە تاك، بە بۆنەی ئەزموونەکانی ژیان و ئۆرگانە تایبەتییەکان، لە لایەنی دەروونییەوە لە گەڵ ئەندامانی دیکەی گروپەکەی خۆی جیاوازە – بە تایبەت لە سەردەمانی سەرەتایی ژیاندا– بەڵام بەشێکی گەورە لە بونیادی دەروونی ئەو بەرهەمی هاوئاهەنگی لە گەڵ پێگەی چینی خۆی وکۆمەڵگەیەکە کە تێدا دەژی. زانیاری سەبارەت بەو هۆکارانەی کە بونیادی دەروونی چین یان کۆمەڵگەیەکی تایبەت دیاری دەکەن، وزانیاری ئێمە سەبارەت بە " هێزە بەرهەمهێنەرە" دەروونییەکان کە لە کۆمەڵگایەکدا بە شێوەیەکی دیاری کراو کار دەکەن، لە ئاگاهی وزانیاری ئێمە سەبارەت بە بونیادی ئابووری وکۆمەڵایەتی زیاترە. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم کارە ئەمەیە کە توێژینەرەکانی ئەم پرسانە خۆیان کەوتونەتە نێو چوارچێوەی بونیادی دەروونی کۆمەڵگەی خۆیان، لەم روەوە تەنها لە شتێك تێ دەگەن کە لە خۆیان دەچێت. ئەوان بە هەڵە بونیادی دەروونی خۆیان وکۆمەڵگەی خۆیان بە " سروشتی مرۆڤ " لە قەڵەم دەدەن، و ئەمە لە بەر چاو ناگرن کە لە ژێر هەل ومەرجی کۆمەڵایەتی جیاوازدا بونیادەکانی هەڵچوونگەلێکی بە تەواوەتی جیاواز، وەك هێزە بەرهەمهێنەرەکان خەریکی کارکردنن ویاخود دەتوانن کار بکەن.

کۆمەڵی باوکسالار بونیادێکی دەروونییە کە پەیوەندی منداڵ لە گەڵ باوك لە ناوەندی ئەو کۆمەڵەدا جێدەگرێت. فرۆید لە توێژینەوەی خۆی سەبارەت بە گرێی " پوزوتیڤی" ئودیپ یەکێك لە لایەنە جیدییەکانی ئەم بونیادەی ئاشکرا کرد، هەرچەندە لە کامڵبوونیدا زێدەرەوی کرد چوونکە لە گەڵ کۆمەڵگەکەی خۆیدا بە گوێرەی پێویست نزیك نەبوو. نیازی جنسی کوڕێکی منداڵ، کە وەك یەکەمین ژن سەیری دایکی دەکات، دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەك رکەبەرێك سەیری باوکی بکات. بەڵام لە بنەماڵەی باوکسالاریدا، باوك بە سەر ژیانی منداڵدا زاڵە. جگە لە نەبوونی دەرفەتی فیزیۆلۆژیکی لە پراکتیزە بوونی داخوازییەکانی منداڵ، رۆڵی دوو پێوەرە بوونی باوك( رکەبەر ودەسەڵاتداری ژیان) هەستێکی دیکەش لە منداڵدا دەوروژێنێت کە فرۆید ئاماژەی پێکردوە: ئارەزۆی منداڵ بۆ جێگری باوك، هەستی یەکسانی لە گەڵ باوك، لە ئەودا دروست دەبێت. منداڵ تایبەتمەندی دەروونی باوك وەردەگرێت تا ئەو شوێنەی کە باوك دەبێتە سەرچاوەی تەڵقین وفەرمانە ئاکارییەکان وتایبەتمەندییە وەرگیراوەکان لە باوك دەبێتە ئامرازێکی بەهێز بۆ دروست بوونی وێژدان. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم پرۆسەیە تا ڕادەیەك سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، دەر ئەنجام رکەبەرایەتی کوڕی منداڵ لە گەڵ باوك دوولایەنە بوونی خواستی سۆزداری ئەوی لێدەکەوێتەوە. لە لایەکەوە خوازیاری میهرەبانی باوکە ولە لایەکی ترەوە کەم تا زۆر بە ئاشکرا سەرپێچی دەکات.

کۆمەڵی باوکسالاری بەو پرۆسە دەروونییە دروست دەبێت کە لە باوکدا بوونی هەیە. باوك لە لایەکەوە ئیرەیی بە کوڕەکەی دەبات چوونکە دەبینێت لە بەراورد لە گەڵ کوڕەکەی ژیانی ئەم بەرەو کۆتای دەڕوات، بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەم ئیرەیی بردنە مەرجی کۆمەڵایەتییە: بەم واتایە کە ژیانی منداڵ تا ڕادەیەك ناچاری تێدا نییە. ئاشکرایە کە بەر پرسیارەتی باوکێتی، هەر چەندە قورستر بێت ئەم ئیرەیی بردنە زیاترە.

هۆکارە گرنگە کۆمەڵایەتی وئابوورییەکانیش هەڵسوکەوتی کوڕ سەبارەت بە باوك دیاری دەکەن. بە گوێرەی پێگە وهەلومەرج، کوڕ یان میراتگەری سەرمایەی باوکە یان پشتیوانی ئەوە لە کاتی نەخۆشی وسەردەمی پیریدا. کوڕ جۆرە سەرمایەگوزارییەك لە قەڵەم دەدرێت. لە ڕوانگەی ئابوورییەوە ئەو پارەیە کە خەرجی پەروەردە وبارهێنانی ئەو دەکرێت بە تەواوەتی لە پارەی بیمە وخانەنشینی بۆ سەردمی پیری دەچێت. دیسان کوڕ ڕۆڵێکی گرنگی لە شەرافەتی کۆمەڵایەتی باوکدا هەیە. بەشداری بە ناوبانگی ئەو لە کۆمەڵگە، حورمەتی باوك بەرز دەکاتەوە وشکستی کۆمەڵایەتی ئەو ئابڕوی باوك کەم دەکاتەوە ویان تەنانەت لە ناویشی دەبات ( زەواجی سەرکەوتوانەی کوڕیش هەمان ڕۆڵی هەیە).

بە بۆنەی ئەرکە کۆمەڵایەتی وئابوورییەکانی کوڕەوە، ئامانجی پەروەردە کردنی ئەو بە زۆری بە بێ ڕازی بوونی ئەو ئەنجام دەدرێت- واتە گەشە وکامڵبوونی تەواوەتی ئەو، بەڵکوو ئەوەی کامڵ دەبێت، ئەوپەڕی لێهاتووی کوڕە سەبارەت بە بەشداری لە پێویستییە

کۆمەڵایــەتی وئابووریـیــەکانی باوکــدا. لــەم رووەوە چــەندین جــار رووبـەروی نـاکۆکی نێوان رازی بـوون ولێهاتووی کوڕ دەبینـەوە، بـەڵام ئـەم ناکۆکییانـە لـە لایـەن باوکـەوە بـە شـێوەیەکی وشـیارانە هەسـتی پێناکرێت. چوونکە ئایدۆلۆژیای کۆمەڵگـە فێری کـردوە کـە هـەر دوو ئامانجەکە بە یەکسان  سەیر بکات. بارودۆخ کاتێك ئاڵۆزتر دەبێت کە باوك خۆی لە گەڵ کوڕەکەیدا یەکسان لە قەڵەم بدات. ئەو لـە کوڕەکـەی چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە نە تەنها لـە لایـەنی کۆمەڵایەتییەوە لێهاتوو بێت، بەڵکوو  چاوەڕوانە ئارەزۆ دانەمرکاوەکانیشی دابمرکێنێت.

کارە کۆمەڵایەتییەکانی کوڕ رۆڵێکی جیدیان لـە میهرەبانی باوکدا هەیـە: بـاوك بـە مـەرجێك کوڕەکـەی خـۆش دەوێت کـە ئارەزۆکـانی ئـەو دەسـتەبەر بکـات. ئـەگینا ڕەنگـە خۆشەویسـتی بـاوك بکوژێتـەوە ویـان تەنانەت ببێتە کەمتەر خەمی ونەفرەت.

سروشـتی شـەرتی( مـەرجی) خۆشەویسـتی بـاوك  دوو ئـەنجامی لێدەکەوێتەوە: ١) لە دەست دانـی ئاسایشـی دەروونـی کـە دەرئـەنجامی شـارەزا بـوون لــە چـۆنایەتی خۆشەویسـتی بــێ قەیـد ومەرجـە.٢) توندبوونەوەی ( زیادبوونی) رۆڵی ویژدان- واتـە لـە مرۆڤدا ڕوانگەیـەك دروسـت دەبێـت کــە تێیــدا ڕاپەڕانــدنی ئەرکــەکان خــاڵی ناوەنــدی وسـەنتەری ژیانـە، چوونکە لـەم حاڵەتـەدا لانـی کـەمی خۆشەویسـتی گەرەنتی کراوە. بەڵام تەنانەت جـێ بـەجێ کردنـی فەرمانـەکانی ویـژدان لـە ئاسـتی هـەرە بەرزیشـدا دەرکـەوتنی هەسـت بـە تـاوان ئاسـتەنگ ناکات، چوونکە کاری تاك سەبارەت بەو ئامانجانەی بۆی دانراوە کـەم وکورتە.

لـە بەرانبـەردا، خۆشەویستی دایك بۆمنـداڵ بە تـەواوەتی خـاوەن تایبەتمەندییەگەلێکی جیاوازە. گرنگترین ویەکەمین هۆکار ئەمەیە کە خۆشەویستی دایك بۆ منداڵ لە چەند ساڵی سەرەتای ژیـانی منداڵیدا بێ قەیـد ومەرجـە. بـە خێوکردنی منـداڵی دامـاو، گرێدراوی ئـەنجامی ئەرکـە کۆمەڵایـەتی وئاکارییـەکانی منـداڵ نییـە، تەنانـەت چـاوەڕوانی میهرەبانی لـە ئـارادا نییـە. سروشتی بـێ مـەرجی خۆشەویستی دایـك پێویستییەکی بیولۆژیکە کە ڕەنگە خواستێك بۆ عەشقی بـێ مـەرج لـە ژنیشدا دروست بەکات. بڕوا بە بێ مەرج بوونی خۆشەویستی دایـك ئەم چەمکە دەگەیـەنێت کـە پێویستییە ئەخلاقییـەکان گرنگایـەتییـەکی ئەوتۆشیان نییە، چوونکە مەرجی خۆشەویست بوون نین.

ئـەم تایبەتمەندییانــەی کــە شــرۆڤە کــران لــە گــەڵ روخســاری ئەودایکەی کە لـە کۆمەڵگای بـاوك سالاری هەنووکەییـدا میهرەبانی در حەق دەکرێت جیاوازییەکی زۆری هەیە. ئەم کۆمەڵگایە، لە بنەڕەتدا، لە پیـاودا تـەنها دلێـری و پاڵـەوانی دەناسـێت ( ئـەم تایبەتمەندییانـە تێکەڵاوی خۆپەرەستی بووە )، ولە دایك وێنەیەی ناشرینی هەستیاری ولاوازی کێشاوە. لە باتی خۆشەویستی بێ قەیدومـەرجی دایکانە، کـە نە تەنها منداڵەکەی خۆی بەڵکو تێکڕای منداڵانی دیکـەش دەگرێتـەوە، روبەروی هەستی بـوژوازی خاوەنداریـەتی دەبینـەوە کە بە سەر دایکدا سەپێنراوە.

گـۆڕینی روخسـاری دایـك نیشـاندەری لادانێکـی کۆمەڵایەتییـە لـە پەیوەندی دایك ومنداڵدا. یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەم لادانە — وهـەر وەهـا نەمایشـێك لـە گرێی‌ئودیـپ — شـێوازێکە کـە تێـدا ئـارەزوی

خۆشەویستی دایك بوون شوێنی خۆی داوەتەوە پارێزگاری کردن وبەخێو کردنی منداڵ. ئیدی دایك ئەرکی پارێزگاری وپشتیوانی نییە، بەڵکو دەبێ خویشی پشتیوانی لێبکرێت تا پاك و بێگەرد بمێنێتەوە. ئەم شێوە پێچەوانەیە ( بە لارێدا بردنی پەیوەندی سەرەتایی دایك) لە گەڵ سەمبولەکانی دیکەی دایکدا کێشراوە، وەك وڵات، نەتەوە، نیشتمان، رۆڵێکی گرنگی لە ئایدولۆژییەکانی باوك سالاری هەنووکەییدا هەیە. دایكو هاوسەنگییە مەعنەوییەکانی لەم ئایدولوژییانەدا لە ناو نەچوون بەڵکو رۆڵی ئەوان لە پشتیوانی کردن بۆ پشتیوانی لێکردن گۆڕانی بەسەردا هاتووە. بەکورتی دەتوانین بڵێن کە تاك – وکۆمەڵگای – باوك سالاری هەندێك تایبەتمەندییان هەیە کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە: منێکی بالای جیدیوسەختگر، هەست بە تاوان، خوشەویستی فەرمانبەرانە لە هێزی باوك ئاسا، خواستوهەست بە خۆشی لە زاڵ بوون بە سەرخەڵکی لاواز، قەبووڵ کردنی رەنج وەك سزای پڕبەپێست لە هەمبەر تاوان وتوانایەکی کەموکورت بۆ شادی وکامەرانی. لە بەرانبەردا دایك سالاری، لە گەڵ گەش بینی، متمانە لە خۆشەویستی بێمەرجی دایك ، هەست بە تاوانی زۆر کەمتر، منی بالای لاوازتر، توانای زیاتر بۆ شادی وکامەرانی دیاری دەکرێت. هاوکات لەگەڵ ئەم تایبەتمەندییانەدا ئامانجی میهرەبانی وخۆشەویستی دایکانە بۆ هەژارن پەرە دەستێنێت.

لە حاڵێکدا دەتوانین هەم باوك سالاری وهەم دایك سالاری لە کۆمەڵگادا ببینین – بە پلەی یەکەم گرێدراوی رێکخراوی بنەماڵەومنداڵ – وەك هەر خوویەکی دیکە هەر کامەیان تایبەت بە جۆرێکی تایبەت لە

کۆمەڵگایە. ڕەنگە باوك سالاری لە کۆمەڵگای بورژوا پرۆتستاندا باوبێت، بەڵام دایك سالاری لە چاخەکانی ناوەڕاستدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە وهەنووکەش لە باشوری ئەورووپادا برەوی هەیە. ئەم بابەتە ئێمە بۆ باسەکەی " ڤێبر" سەبارەت بە پەیوەندی سەرمایەداری بورژوا لە گەڵ جەوهەری پرۆتستان، لە هەمبەر پەیوەندی کاسۆلیزم لە گەڵ جەوهەری وڵاتە کاسۆلیکەکان ڕێنوینی دەکات.

هەر نارەزایەتییەك کە لە هەمبەر تیوری تایبەتی "ڤێبر" دەر ببڕدرێن، ئیدی هەنووکە ئەو پەیوەندییەی کە باسمان کرد بنەمایەکی سەلمێندراوی زانستییە وپرسەکە لە ئاستی وشیارانە وئایدولۆژی دا تۆێژینەوەی لە سەر دەکرێت. تێگەیشتنی تەواو لەو پەیوەندییە بەرانبەرە بە شیکردنەوەی پاڵنەرێك کە وەك بنەڕەتی بورژوا — سەرمایەداری وجەوهەری پرۆتستانە مومکین دەبێت.

لە حاڵێکدا لە کاسۆلیزم دا گەلێك ئاماژەی باوك سالاری بەرچاو دەکەوێت —" خواوەند"ی باوك، زەنجیرە پلەی پیاوانی ئاینی و... بەڵام ناتوانین لە ڕۆڵی گرنگی کۆمەڵی دایك سالاری تێیدا نکۆڵی بکەین. مەریەمی پاکیزە وکلێسای خۆی نوێنەری ڕۆحی " دایکی گەورەن"، دایکێك کە تێکڕای منداڵەکانی لە ئامێزی خۆدا حەواندوەتەوە. لە ڕاستیدا هەندێك تایبەتمەندی دایکانە بۆ خودی خواش دیاری کراوە — هەر چەند کە ناوشیارانەیە: تاك "کوڕی کلێسا" دەتوانێ بە خۆشەویستی"کلێسای دایك" متمانە بکات، مادام کە هێشتا منداڵی ئەوەوە ودەگەڕێتەوە ئامێزی. ئەم پەیوەندی منداڵییە بە ڕێورەسمە ئاینیەکان دادەمەزرێت وبۆدڵنیابوون لە نەریتە ئاکارییەکان ڕۆڵکی گرنگیان هەیە. بەڵام میکانیزمێکی ئاڵۆز لە ئارادایە بۆ ئەوەی لە

پارێزراوبوونی ئەم نەریتانە دڵنیاببین. دیسان تاکی پابەند دەتوانێ دڵنیا بێت کە بەبێ پشت بەستن بە ئاکار دەکەوێتە بەر میهرەبانی ودلۆڤانی. کاسۆلیزم لە پێوانەیەکی گەورەدا هەستی تاوانباری دەخولقێنێت، بەڵام لە هەمان حاڵدا دەرفەتی رزگار بوون لەم هەستەش دەخولقێنێت. ئەو نرخەی کە بە ئەم پرسە دەدرێت، گرێدراوی سۆزداری بە کلێساو خزمەتگوزارەکانییە.

لە لایەکی ترەوە پرۆتستانیزم لە پالاوتنی مەسیحییەت لە خوارفاتی دایك سالاری کارێکی گرنگ وبنەڕەتی ئەنجامداوە. جێگرەکانی دایك وەك مریەمی پاکیزە وکلێسا و تایبەتمەندییە دایکانەکانی خواوەند لە ناوچووە. لە سەنتەرو ناوەندی زانستی خودا ناسی لوتر [1]، میهرەبانی نواندن بۆ کەسی تاوانبار جێگای گومانە. بۆ ڕاکێشانی میهربانی تەنها یەك رێگا بوونی هەیە: باوەڕ [2].لە کالڤینیزم

---

[1] لە لایەنی دەروونناسییەوە لوتر باوکسالارێکی توندڕەو بوو. ئەو سەبارەت بە باوك تێگەیشتنێکی دوو پێوەری هەبوو ، و ئەم دوو پێوەرە بوونە لەم ڕاستییەدا دەبینرا کە ئەو هەمیشە سەیری دوو سیمای باوکی دەکرد: ئەو سیمایە کە خۆشی دەوێت وئەو سیمایە کە نەفرەتی لێدەکات. لوتر قەت لە ژیاندا چێژوەرگرتنی تاقی نەکردوەتەوە و لە گەڵ ئەو فەرهەنگە کە چێژ دەخولقێنێت بێگانەیە، کە واتە یەکێك لە بێزارە گەورەکانە. لوتر گرێدراوی خەمۆکی دەروونی ناچاری( زۆرەملی)، لە جۆری هاورەگەزبازییە، هەڵبەت لە چەمکە کلینیکییەکەیدا.

[2] واتای تەواوەتی تیۆرییەکە " لێبوردن تەنها لە ڕێگەی باوەڕوە" تەنها بە گوێری میکانیزمی فیکری خەمۆکی دەروونی زۆرملی ودوو دڵیەکانی بەیان دەکرێت. لێرەدا ناتوانین بە تێر وتەسەلی باسی بکەین:

تەنها نموونە یەکی بەرچاوی پێ زیاد دەکەم. تەنها بە بۆنەەی دوو پێوەر بوونی خۆیەوە ( نەك سیمای باوك، نەفرەت لە باوك وبەرێوەبەری کلێسای کاسۆلیك وهەڵس وکەوتی دۆستانە سەبارەت بە شازادە نائاینییەکان لە گەڵ نەفرەت لە جوتیارە یاخی بووەکان) لوتر بە هیوای خۆشەویستی بێ مەرجی دایك بوو . وتەنها لەم حاڵەتەدا دەیتوانی هەست بە خۆشەویستی بکات.

ئایینزاکانی دیکەی پرۆتستانەوە سەلمێندرا کە ڕێگە چارەی باوەڕ بەس نییە. لەم ڕووەوە ئەنجامدانی ئەرکی تایبەتی ( خەڵوە کێشانی ناوەکی "ناخی") وپێویستی سەرکەوتن لە ژیانی ئەم جیهانەشدا، وەك شایەتی ڕەحمەتی خوا، یەکێك لە مەرجەکانی ڕاکێشانی میهرەبانی ڕۆحانی لە قەڵەم دراوە.

دەرکەوتنی پرۆتستانیزم دەرئەنجامی هەمان هۆکاری ئابووری کۆمەڵایەتییە کە بوو بە هۆی دەرکەوتنی " جەوهەری" سەرمایەداریش وەك هەر ئایینێکی دیکە، ئەرکی ئەم ئایینە دروستکردن وبە هێز کردنی پاڵنەرێکە کە پێویستی کۆمەڵگەیە. کۆمەڵی باوك سالاری کە تێدا ڕاپەڕاندی ئەرك وسەرکەوتن هێزە گرنگەکانی ژیانن- لە حاڵێکدا شادی وچێژ ڕۆڵی پلە دوویان هەیە- نیشاندەری گەلێك لە بە هێزترین هێزە سودبەخشەکانە لە ئەو پەڕی هەوڵدانە گەورەکانی ئابووری وکەلتووری سەرمایەدارییە. تا سەردەمی سەرمایەداری خەڵك( کۆیلە )یان بە زۆر وگوشاری جەستەیی ناچار دەکردکە هەر دڵۆپێك لە هێزی خۆیان بۆ کارێکی سودبەخشی ئابووری تەرخان بکەن. لە ڕێگەی کاریگەری کۆمەڵی باوك سالارییەوە، خەڵك بۆ دەستەبەرکردنی " خواستە ئازادەکان "ی خۆیان دەستیان بە هەوڵدان کرد، چوونکە پەشیمانی دەرەکی لە ڕابردوو هێشتا ناوەکی نەکرابووەوە. ناوەکی کردنی پەشیمانی بە شێوەیەکی کاملتر لە نێوان چینی دەسەڵاتداری بورژوا، کە نوێنەری ڕاستە قینەی تایبەتمەندییە ئاکارییەکانی بورژوا بوون پراکتیزە کرا. بە پێچەوانەی هێزە دەرەکییەکان، پرۆسەی ناوەکی کردن دەرئەنجامێکی دیکەی

لێکەوتەوە. جێ بە جێ کردنی فەرمانە ویژدانییەکان رازی بوونێکی لێکەوتوەتەوە کە لە توکمە کردنی بنەمای باوکسالاریدا بەشێکی بەرچاوی هەبوو.

به هەر حاڵ دامرکاندنی خواستەکان زۆر سنوودار بوو، چوونکە ڕاپەڕاندنی ئەرك وسەرکەوتنی ئابووری جێگرگەلێکی لاواز بوون بۆ ئەو تایبەتمەندیانەی کە ناو چووبوون: توانای کەڵك وەرگرتن لە ژیان ، وئاسایشی ناوەکی لە برەوداری وخۆشەویستی بێ مەرج، دیسان بارێکی قورسی دەروونی کە بونیادی باوك سالاری وێران دەکات بوو بە هۆی گۆشەگیری ونەبوونی توانای خۆشەویستی نواندن، هەرچەندە کە بنەڕەتی هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم وێرانگەرییە لە گۆڕانکارییە ئابوورییەکاندا بوو .

بونیادی باوکسالاری کە هێزی دەروونی پاڵنەرلە ئەو پەڕی دەستکەوتەکانی کۆمەڵگەی بورژوا – پرۆتستان بوو، لە هەمان حاڵدا هەل ومەرجێکی خولقاند کە بوو بە هۆی تێکدانی ئەو بونیادە وڕینسانسی دایکسالاری لێکەوتەوە. گەشە کردنی توانای بەرهەمهێنانی مرۆڤ بۆ یەکەمین جار لە مێژودا سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دروست کرد کە لە رابردوودا تەنها لە چیرۆکی فریشتەکان وئەفسانەکاندا باسی لێوە کرابوو، سیستەمێك کە تێدا خەڵك خاوەن ئامراز وکەرەستەی خۆشی وشادومانی راستەقینە بوون، هەوڵدانی زۆر بۆ ئەنجامدانی کار پێویست نییە، هێزە مرۆییەکان بە پلەی یەکەم بۆ کامڵکردنی تواناکارییە مرۆییەکان خەرج دەکرێت نەك بۆ

بەرهەمهێنانی کالآ ئابوورییەکان کە تەنها بۆ بەردەوام بوونی شارستانی پێویستە.

پێشڕەوترین فەیلەسوّفەکانی چەرخی رووناک گەری فەرەنسا گرێی سۆزداری وفیکری بونیادی کۆمەڵایەتی باوک سالاریان بە جێهێشت، بەلآم نوێنەری کامڵ وتەواوی ئەم ئارەزۆ تازە دایکسالارییانە چینێکی تازەی لێدەرچوو کە پاڵنەری دڵسۆزی ئەولە کاردا زیاتر تێبینییە ئابوورییەکان بوو تا نارەحەتی ویژدان کە لە ناخی خۆیدا هەستی پێدەکرد: چینی کرێکار. هەر ئەم بونیادە سۆزدارییە یەکێك لە هەل ومەرجەکانی دزە کردنی سوسیالیزمی مارکسیستی لە نێو چینی کرێکاردا لە بار کرد- کە واتە دزەکردنی سوسیالیزم گرێدراوی چییەتی پاڵنەرەکانی کرێکارەکانە. بنەمای دەروونی بەرنامەی کۆمەڵایەتی مارکسیستی بە شێوەیەکی دیاریکراو کۆمەڵی دایکسالاری بوو. مارکسیزم لەو بڕوایەدایە کە ئەگەر توانای بەرهەمهێنانی ئابووری بە شێوەیەکی لۆژیکی رێك وپێك بکرێت هەر کەسێك بە گوێرەی پێویستی خۆی لە کالآ وئامرازەکان کەڵك وەردەگرێت- بە بێ ئەوەی رۆڵی سەرەکی ئەو کەسەلە پرۆسەی بەرهەمهێناندا لە بەرچاو بگیردرێت- دیسان دەتوانین ئەم ئامانجە بە کارێك کەمتر لە ئەوەی هەنووکە پێویستە پراکتیزە بکەین، لە لایەکی ترەوە هەر کەسێك بە بێ هیچ مەرجێك مافی ئەوەی هەیە ژیانێکی پڕلە ئاسایش وخۆشی هەبێت، وئەم ئاسایش وخۆشییە پێویستی بە کرانەوەی هاوئاهەنگی نهێنی خەڵك هەیە- تێکڕای ئەم تیورییانە بە گوێرەی لۆژیك وشیکردنەوەی زانستی بۆچوونگەلێکە کە لە

هەل‌ومەرجی ئابووری رابردوودا تەنها وەك " فانتازیا "لە قەڵەم دەدرا: " زەوی دایك " تێكڕای پێویستییەكانی منداڵەكانی دابین دەكات بە بێ ئەوەی لێهاتووی وشایستەیی ئەوان لە بەر چاو بگرێت.

هەر ئەم پەیوەندییە لە نێوان خواستەكانی دایكسالاری وبۆچوونی سوسیالیستەكان بوونی هەیە كە ئاشكرایە بۆ چی دیموكراسی ماتریالیستی كۆمەڵگە دایكسالارەكان بووە هۆی ئەوەی بیرمەندەكانی سوسیالیست بۆ لایەنگری لە تیوری دایكسالاری شت بنوسن.

# ٨-شێواز ورۆڵی دەروونناسی کۆمەڵایەتی شیکردنەوەیی[1] چاوخشاندنێك بە دەروونشیکاری وماتریالیزمی مێژوویی

دەروونشیکاری، دەروونناسییەکی ماتریالیستیکە، کە پێویستە وەك بەشێکی زانستە سروشتییەکان لە قەڵەم بدرێت. ئەم زانستە وروژێنەر وپێویستییە غەریزییەکان وەك هێزی پاڵنەر لە پشت هەڵس وکەتەکانی مرۆڤەوە ، لێك دەداتەوە، ئەو پاڵنەرانە کە لە رێگەی غەریزە دەروونییەکانەوە دروست دەبن وراستەو خۆ نابینرێن. دەروونشیکاری نیشانی داوە کە چالاکی دەروونی وشیارانە بەشێکی زۆر کەم لە ژیانی دەروونی مرۆڤ پێك دەهێنێت، بەشی سەرەکی لە پشت هەڵس وکەوتی دەروونی وناشیارانەوەیە. بە تایبەت دەروونشیکاری لەو ئایدۆلۆژیا تاکی وگروپیانەی کە شوێنی دەرکەوتنی پێویستی وخواستگەلێکی دیاریکراون ولە غەریزەکانەوە سەرچاوە دەگرن پەردە هەڵدەماڵێت و نیشانی داوە کە پاڵنەرە

---

[1] ئەم وتارە بۆ یەکەمین جار لە Zeilschrift fiir sozalforechung لاپیزیك لە ١٩٣٢ بەڵاو کراوەتەوە.

( ئاکارییەکان) وئیدەیالیستیکییەکانی ئێمە تا ڕادەیەك پاڵنەری غەریزی ولۆژیکی کراون.

هاوتەریب لە گەڵ ڕیزبەندی گشت پەسەندی غەریزەکان بە دوو غەریزەی برسێتی وخۆشەویستی، فرۆید لەو بڕوایەدا بوو کە دوو گروپی دیکە لە غەریزەکان واتە پاراستنی زات و غەرێزەی جنسی[1] هێزی ڕاستەقینەی پاڵنەرەکانە لە پشت ژیانی دەروونی مرۆڤەوەیە. فرۆید وزەی هەیی وجیانەبووی غەریزەی جنسی بە لیبیدۆ (شەهوەت ) وپرۆسە دەروونییەکانی سەرچاوە گرتوو لەم وزەیەوە " بە شەهوەتی[2]" ناو دەبات. لە بواری غەریزە جنسییەکاندا فرۆید بە کار

---

[1] فرۆید کە لە بن کاریگەری تێکەڵاوییەکی لیبیدۆیی لە غەریزەکانی پاراستنی زات وخواست وێرانگەریدا بوو، دواتر تیۆرییە سەرتاییەکی خۆی ڕاست کردەوە . و لە نێو غەریزەی ژیانداCerotik غەریزەی مەرگیشی دانا . ئەم ڕاست کردنەوە بە گرنگی خۆیەوە ، کەمتر لە تیۆرییە کۆنەکەی لە سەر بنەمای ئەزموون دامەزراوە. لە ڕوانگەی منەوە ئەو تیۆرییە تێکەڵاوێکە لە زانیاری بیولۆژیکی وخواستی دەروونی، تێکەڵاوییەك کە فرۆید بە شێوەیەکی دیکە خۆی لێ دوورگرتووە. ئەم تیۆرییە بە ڕادەیەك دژی ڕوانگەی سەرەتایی فرۆیدە کە، غەریزەی وەك ئەو خواست وئارەزۆیانە لە قەڵەم دەدا کە خزمەتی هەوڵدانی مرۆڤی بۆ ژیان دەکرد. لە ڕوانگەی منەوە یەکێك لە کاریگەرییەکانی هەڵوێستی هەمە لایەنەی فرۆید، ئەمەیە کە چالاکی دەروونی پەرە دەستێنێت تا لە گەڵ پرۆسەی ژیان وپێویستییەکاندا هاوئاهەنگ ببێت، و ئەمە پێچەوانەی ینەچەی مەرگی بیولۆژیکە. وتوویژ سەبارەت بە گریمانەی غەریزەی مەرگ هێشتاش لە دەروونشیکاریدا بەردەوامە.

[2] Libidinous – لە کاتی نوسینی ئەم وتارەدا لە گەڵ تیوری لیبیدۆی فرۆیددا هاوڕا بووم، هەر بەم بۆنەیەوە لە هێزە لیبیدۆییەکان( وزەکان) ویان بونیادی لیبیدۆ( یان بونیادی پاڵنەر) دواوم، بەڵام هەنووکە لە سەر لیبیدۆ جەخت ناکەمەوە، بەڵکو لە هێزەجۆراوجۆرە شەهوەتییەکان دەدوێم، و لە لایەنی خاڵە سەرەکییەکانی ئەم وتارەوە ئەم جیاوازیشە شیاو نییە(١٩٧٠).

هێنانی باو وئاسايی ئەم دەستەواژەيەی پەرە پێدا بە شێوەيەك كە تێكرای وروژێنەرەكانی كە وەك پاڵنەری زاوزێيی لە لايەن فيزيكييەوە شەرتی ( مەرجدار) بوەتەوە لە خۆ دەگرت، هەندێك لە بەشەكانیپاڵنەری هەستە جنسييەكان گرێدراوی يەكدين وبە دوای خۆشەويستی سەرچاوە گرتوو لە گرژی دەگەڕێن.

فرۆيد گريمانە دەكات كە بنەمای سەرەكی چالاكی دەروونی " بنەچەی خۆشييە"[1] ، واتە خواستی بەتاڵ كردنی گرژييە جنسييەكان بە شێوەيەك كە لانی زۆری خۆشی دەستەبەر ببێت. ئەم بنەچەيە بە " بنەچەی راستی" راست دەكرێتەوە( نەرم دەبێت)[2]: هەژماردنی راستی ناچارمان دەكات كە نكۆڵی لە خۆشی بكەين يان بە ريسوای لە قەڵەم بدەين تا نارەحەتی گەورەتر رووبەرومان نەبێتەوە يان لە داهاتوودا خۆشييەكی زياتر بە دەست بهێنين.

لە ڕوانگەی فرۆيدەوە بونيادی تايبەتی غەريزەی تاكی شەرتی كراو لە دوو هۆكارەوە سەرچاوە دەگرێت: بونيادی جەستەيی ژنتيكی وئەزموونەكانی ژيان- بە تايبەت ئەزموونەكانی سەردەمی منداڵی. فرۆيد ديسان ئەڵێ پێكهاتەی ژنتيك وئەزموونی ژيان " زەنجيرەيەكی تەواو كەر" دروست دەكات وئەركی تايبەتی دەروونشيكاری دۆزينەوە وئاشكرا كردنی كاريگەری ئەزموونەكانی ژيان لە سەر بونيادی غەريزەی ژنيتيكە. لەم رووەوە ئەم شێوازەی شيكردنەوە كوت ومت مێژووييە. **ئەم شێوازە بە دوای تێگەيشتن لەبونيادی وروژێنەر**

---

[1]. Pleasure P rinciple

[2]. Reality Principle

**لـە رێگـەی تێگەیشـتن لـە مێـژووی ژیانەوەیـە.** شـێوازی شـی کردنـەوەیی بۆ ژیـانی دەروونـی تـاکی تەندروست ونـەخۆش، دەروون نـەخۆش بـە نرخـە، خـاڵی جیـاوازی کەسـی دەروون نـەخۆش لـە گـەڵ کەسی تەندروست لەمەدایە کە هاوسەنگی پێکهاتەی غەریزی خۆی لە گـەڵ پێداویسـتییە راسـتەقینەکانی ژیـان هـاو ئاهـەنگ کـردوە، بـەڵام بونیـادی غـەریزی کەسـی دەروون نـەخۆش ( خـەمۆکی دەروونـی) رووبەروی هەندێك ئاستەنگ بوەتەوە کـە لـە بـەردەم پێکـەوە گونجان لـە گەڵ راستیدا رێگرە.

بۆ زیـاتر روون کردنـەوەی ئـەوەی کـە دەتـوانین غـەرێزە جنسییەکان هێـور بکەینـەوە و لـە گـەڵ راسـتیدا بیـانگونجێنین، دەبـێ لـەو تایبەتمەندییانـەوە کـە ئـەم غەریزانـە لـە پاراسـتنی زات جیادەکاتـەوە شارەزا بین. بۆ نموونە غەریزە جنسییەکان، بە پێچەوانەی غـەرێزەکانی پاراسـتنی زات، هێـور دەکرێنـەوە، وغـەریزەکانی پاراسـتنی زات زۆر پێویسـتن چـوونکە ئەگـەر بۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن دانـەمرکێن، مـرۆڤ رووبـەروی مـەرگ دەکاتـەوە، بـە کـورتی دواخسـتنی درێژخایـەنی دامرکانـدنیان لـە لایـەن دەروونییـەوە تەحـەمول ناکرێـت. لـەم رووەوە غـەریزەکانی پاراسـتنی زات لـە غـەریزە جنسـییەکان ئەولەویـەتیان زیـاترە– مەبەسـت ئەمە نییـە کـە رۆڵێکـی گرنگتریـان هەیـە، بەڵکوو لە حاڵەتێکدا کە ناکۆکی دەرکەوت ، ئەولەوییەت هی غەریزەی پاراستنی زاتە.

دیسـان دەتـوانین ئـەو پاڵنەرانـەی کـە لـە ئـارەزۆ جنسـییەکانەوە سەرچـاوە دەگـرن بدەینـە دواوە، بـەڵام نـاتوانین خواسـتە سەرچـاوە

گرتووەکـان لەپاراسـتنی زات لــە هەسـتەوە بگوێزینــەوە بــۆ نەسـت. جیاوازییەکی گرنگی دیکەی نێوان ئەم دو گروپە لە غەریزەکان ئەمەیە کـە دەتـوانین غـەریزە جنسییەکان بپـاڵێوین: بـە دەربـڕینێکیتر لـە باتـی دامرکاندنی راستەو خۆ دەتـوانین ئـارەزۆی جنسی بـەرەو ئامانجێکی دیکە کە بە تەواوەتی لە گەڵ ئامانجی راستەوخۆیدا جیاوازە ، ببـەین. بـەڵام غـەریزەکانی پاراسـتنی زات تایبەتمەندییـەکی وەهایـان نییـە. دیسـان دەبێ‌پاڵنــەرەکانی پاراسـتنی زات بــە ئـامرازی راسـتەقینە وهەست پێکراو دابمرکێن، لە حاڵێکدا پاڵنەرە جنسییەکان بە زۆری بە فانتزیـای روت دادەمـرکێن. برسـێتی مـرۆڤ تـەنها بـە نـان خـواردن دادەمرکێـت، بـەڵام ئـارەزۆی خۆشەویسـت بـوون تـەنها بـە فانتزیایـەکی خواوەنـدێکی خۆشەویسـتی نـوێن، وبـە خواسـتە سادیسـتیکەکان بـە دیمەن وفانتزیای سادیستیك دادەمرکێت.

دوایـن جیـاوازی گـرنگ لـە نێـوان ئـەم دوو غەریزەیـەدا ئەمەیـە کـە پاڵنــەرە جنسـییەکان، بــە پێچــەوانەی پاڵنــەرەکانی پاراسـتنی زات، رێگەیەك بۆ خۆ دەرخستن هەیە کە دەتـوانی جـێ گۆڕکێیـان پێبکـەیت. ئەگەر پاڵنەرێکی غەریزی دانەمرکێت، دەکرێت پاڵنەرگەلێکی دیکە چـە لە لایەنی ناوەکی وچە لـە لایـەنی دەرەکییـەوە مومکینـە هەڵبـژێردرێت. جـێ گۆڕکـێ و گواسـتنەوەی پاڵنــەرە جنسـییەکان یـەکێك لـە کلیلـە گرنگـەکانی تێگەیشـتن ودیـاری کردنـی ژیـانی تەندروسـت و خـەمۆکی دەروونییـە ویـەکێك لـە بنـەماکانی دەروونشـیکاری لـە قەڵـەم دەدرێـت. هـەروەها ئـەم پرسـیارە یەکێکلـە راسـتییە گرنگـە کۆمەڵایەتییەکانـە. گواسـتنەوەو جـێ گۆڕکــێ ی پاڵنــەرە جنسـییەکان ئــەو دەرفەتــە

دەرەخسێنێت تا هەمان شێوازی دامرکاندن بخرێتە بەردەمی کۆمەڵانی خەڵکەکە لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە شیاوی بە دەست هێنان بێت ولە روانگەی چینی باڵا دەستی کۆمەڵگەوە قەبووڵ بکرێت[1].

بە کورتی دەتوانین غەریزە جنسییەکان، کەم وکورت بکەینەوە، سەرکوت بکەین، بپاڵێوین، دوای بخەین یان بیانگۆڕین کە نەرمبووتر لە غەریزەکانی زاتن، غەریزە جنسییەکان گرێدراوی غەریزەکانی پاراستنی زاتن‌و شوێن کەوتووی ئەوانن[2]. بەڵام نەرمبوون و شیاوی گواستنەوە بوونی غەریزە جنسییەکان بەم واتایە نییە کە دەتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن بە دانەمرکاوی بمێنێنەوە. جیاوازی نێوان ئەم دوو گروپە لە وروژێنەرەکان، بە هەمان شێوە کە لێرە بینیمان، نیشان دەدات کە غەریزەکان دەتوانن بە باشی خۆیان لە گەڵ دەرفەتە راستەقینەکانی دامرکاندا بگونجێنن، واتە لە گەڵ هەل‌ومەرجی هەست پێکراوی ژیان. دەروونشیکاری بە تایبەت ئاماژە بە راست کردنەوەی وروژێنەرە جنسییەکان دەکات. ئەم زانستە رێگای تێگەیشتن و دەرککردنی بونیادی‌غەریزی بە گوێرەی چۆنایەتی بوونمان پێ فێر دەکات ونیشانی داوە کە غەریزەی جنسی لە بن کاریگەری غەریزەی پاراستنی زات دایە. **پێکەوە گونجانی چالاك وناچالاکی ئورگانی**

---

[1] وروژاندن ودامرکاندی پاڵنەرە سادیستیکەکان رۆڵێکی تایبەت دەگێڕن، ئەم پاڵنەرانە کاتێك گەشە دەکەن وبەڵاو دەبنەوە کە دامرکاندنە غەریزییە پوزوتیڤەکانی دیکە، بە بۆنەی زەمینە ئابووری- کۆمەڵایەتییەکان بە لاوە نرابن. سادیزم مەخزەنی گەورەی غەریزەیە، و کاتێك رووی تێدەکرێت کە سەرچاوەیەکی دیکە بوونی نەبێت کە بخرێتە بەردەمی جەماوەر، دیسان سادیزم بۆ لە ناو بردنی دوژمنیش سودبەخشە.

[2] "سێ وتار سەبارەت بە ئارەزۆ جنسییەکان" لە نوسینی فرۆید.

**بیولۆژیکی و غەریزەکان لە گەڵ راستییە کۆمەڵایەتییەکان ئامانجی سەرەکی دەروونشیکارییە** وهەر دۆزینەوەیەك لە دەروونناسی تاك دوای ئەم ئامانجە دەکەوێت.

فرۆید لە سەرەتادا – تەنانەت دواتریش– بایەخی بە دەروونناسی تاك دەدا. بەڵام کە دەرکەوت غەیزەکان هێزی پاڵنەری هەڵس وکەوتە ڕواڵەتییەکانی مرۆڤن ونەست وەك ئایدۆلۆژیا وخەیاڵی هەڵس وکەوتە، ئیدی ئامەزرێنەرانە دەروونشیکاری زیاتر لە پرسی تاك بە پرسی کۆمەڵگە وزیاتر لە دەروونناسی تاك بایەخیان بە دەروونناسی کۆمەڵایەتی دا. ئەوان دەبوایە لە تەکنیکەکانی دەروونشیکاری بە مەبەستی دۆزینەوەی سەرچاوە شاراوەکانی خاڵە نالۆژیکییەکانی هەڵس وکەوت لە ژیانی کۆمەلایەتیدا کەڵکیان وەرگرتبایە– لە ئایین، لە خووەکان، لە سیاسەت وپەروەردە وبارهێناندا. مەبەست ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ گرفتگەلێك بوو کە بۆ ئەوەی لە هەرێمی دەروونناسی تاکدا بوون دیار نەبوون.

بەڵام ئەم گرفتانە لەم راستییەدا کە توێژینەوە خۆی هۆکاریکی زانستی عاقلانەیە بۆ دەستپێکردنی دەروونشیکاری، گۆڕانکاری دروست ناکەن. ئەگەر ژیانی غەریزی ونەست کلیلی تێگەیشتنی لە هەڵس وکەوتی مرۆڤ بن، دەروونشیکاریش بۆ کەوتنە نێو وت وویژی وروژێنەرەکانی هەڵس وکەوتی کۆمەڵایەتی شیاوە، چوونکە "کۆمەڵگە"ی نەخۆش لە کۆمەڵێك تاك دروست بووە ودەبێ هەمان

یاسایی دەروونناسی بۆ جێ بە جێ بکرێت کە لە دەروونشیکاری تاکدا دۆزراوەتەوە وجێ بەجێ دەکرێت.

لەم رووەوە هەڵەیە ئەگەر کەسێك- بۆ نموونە ویلهلم رایش- دەروونشیکاری بە دەروونناسی سنووردار بکاتەوە وسەبارەت بە جێبەجێ کردنی لە نێو دیاردە کۆمەڵایەتی( سیاسی وزانیاری چینەکان و...)گومانی هەبێت[1].

بە دڵنیاییەوە لێکۆڵینەوە لە سەر دیاردەی کۆمەڵناسی بەم بۆنەیەوە نییە کە ناتوانین ئەو بابەتە لە چوارچێوەی دەروونشیکاری‌دا لە قەڵەم بدەین.( هەروەها کە توێژینەوە لە تایبەتمەندییە فیزیکییە جەستەییەکان لە بەر دەم توێژینەوە لە سەر تایبەتمەندییە کیمیاییەکانیشدا رێگر نابێت). مەبەست ئەمەیە کە لە هەر دیاردەیەکدا هۆکاری دەروونی رۆڵیان هەیە، دەروونشیکاری پێیەوە سەرقاڵ دەبێت. ئەوەی کە دەگوترێت دەروونناسی تەنها خەریکی تاك دەبێت

---

[1] ئامانجی راستەقینەی دەروونشیکاری ژیانی رۆحی مرۆڤی کۆمەڵایەتی بووە، جەماوەر وکۆمەڵانی خەڵك کاتێك بایەخیان پێدەدرێت کە دیاردەگەلێکی گرێدراوی تاکی تێدا هەبێت(بۆ نموونە رێبەر)وهەر وەها کاتێك ئاماژە دەروونییەکانی جەماوەر – دڵەڕاوکێ ، ترس، فەرمانبەری و....– لە ناسینی ئێمە سەبارەت بە تاك جیا بوویەوە، وادیارە کە دیاردەی ئاگاهی چینایەتی بە دژواری بۆ دەروونشیکاری دەستەبەر دەبێت وپرسەکانی کۆمەڵناسی( بزوتنەوە جەماوەرییەکان، سیاسەت و...) ناتوانن لە نێو شێوازەکانی دەروونشیکاریدا جێ بگرن. ( ویلهلم رایش)

بە بۆنەی گرنگی زانستی ئەم پرسە میتۆلۆژیکە، من جەخت لە سەر جیاوازی بۆچوونی خۆم لە گەڵ رایش دەکەمەوە، رایش لە نوسراوەکانیتری‌دابە شێوەیەکی سودبەخش روانگەی خۆی راست کردوەتەوە. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ئاماژە بەو خاڵانە دەکەم کە تێدا لە گەڵ توێژینەوەئەزموونییە بە نرخەکانی لە دەرونناسی کۆمەڵایەتیدا هاوڕام.

وکۆمەڵناسـیش سـەرقاڵی کۆمـەڵگا، هەڵەیـە. چـوونکە دەروونناسـی هەمیشە سەرقاڵی تاکی کۆمەڵایەتی کراو دەبێت، کە واتە کۆمەڵناسـی سـەرقاڵی گروپێـك لـە تاکـەکان دەبێـت کـە پێویسـتە بونیـادی دەروونـی ومیکانیزمەکانیان حەسێب بکرێت. دواتر رۆڵی هۆکارە دەروونیەکان لە دیـاردە کۆمەڵایەتییەکانـدا لێـك دەدەینـەوە وبـە کـاری **دەروونناسـی شیکردنەوەیی کۆمەڵایەتییەوە** سەرقاڵ دەبین.

تیـوری کۆمەڵگـە کـە دەروونشـیکاری هـەم گرێدراویـەتی و هـەم زۆریش دژایەتی دەکات **ماتریالیزمی مێژوویيە.**

دەروونشیکاری و ماتریالیزمی مێژوویی لە گەلێك شوێندا پێکدا دەدەن چـوونکە هـەردوو زانسـتەکە ماتریالیسـتن. خـاڵی دەسـتپێکی ئەوانە ئەندێشە نییە، بەڵکوژیانی دونیاو پێداویستیەکانە. ئەو دوانە لە هەڵسەنگاندی ناخدا لێك نزیکن وهەردوکیان هێزێکی پاڵنـەری لاوازتـر لە هێزە شاراوەکان لە قەڵەم دەدرێن. بەڵام بۆ ئەوەی چییەتی هەندێك هۆکـار دێنـە ئاراوە کـە بـە راسـتی هەسـتی مرۆڤ شـەرتی دەکەنـەوە لـەم روەوە دەبنـە دو جەمسـەری دژ بـە یـەك لـە دو تیـوری دا. ماتریـالیزمی مێژوویی هەست، بە شوێنی دەرکـەوتنی بـوونی کۆمەڵایـەتی دەزانێت. دەروونشیکاری، پاڵنـەرە غەریزییـەکان بـە دیاریکـەری شێوازی بـوونی کۆمەڵایـەتی لـە قەڵـەم دەدات. لێـرەدا خسـتنە رووی چـەند پرسـیارێك پێویستە:

ئایا ئەم دوانە پێکەوە ناکۆکن؟ ئەگەر ناکۆك نین چۆن پێکەوە گری دەدرێـن؟ ئایـا بـە کارهێنـانی شێوازی دەروونشـیکاری دەبێتـە هـۆی

دەوڵەمەند بوون وبەهێز بوونی ماتریالیزمی مێژوویی؟ ئەگەر وایە چۆن دەبێت؟

بەر لە خەریکبوون بەم باسەوە، پێویستە گریمانە کۆنەکان کە دەروونشیکاری بۆ توێژینەوەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان هەیەتی، تاقی بکەینەوە. فرۆید قەت مرۆڤی گۆشەگیرو رزگار لە تێکڕای کۆت وبەندە کۆمەڵایەتییەکانی نەکردە بابەتی دەروون شیکاری.

بە دڵنیاییەوە دەروونناسی تاك گرێدراوی تاکەکانی مرۆڤایەتیە، و ئەو رێگایە دەخاتە بەرباس کە مرۆڤ بۆ دامرکاندنی پاڵنەرەکانی دەیگرێتە بەر. تەنها لە هەندێك نموونەی نائاساییدا ئەم زانستە لە پەیوەندی تاك لە گەڵ کەسانی دیکە دور دەکەوێتەوە. لە ژیانی دەروونی تاکدا بە زۆری پێویستە کەسانی دیکە وەك، نموونە، ئامانج، یارمەتی دەر یان دژبەر لە قەڵەم بدرێن. کە واتە دەروونناسی تاك لە هەمان سەرتاوە دەروونناسی کۆمەڵگەشە.

لە لایەکی ترەوە فرۆید تیوری دەروونناسی کۆمەڵایەتی کە بابەتەکەی گروپی وەك" کۆمەڵگە" یان بابەتی کۆمەڵایەتی یان"رۆحی کۆمەڵانی خەڵك" یان "رۆحی کۆمەڵایەتی "، بێت رەد کردەوە. ئەو هەمیشە پشتی بەم راستییە دەبەست کەگروپ تەنها لە تاکەکان دروست بووە وتەنها ئەم تاکانە بابەتی باسی دەروونین. فرۆید هەر وەها تیوری غەریزەی کۆمەڵایەتی قەبووڵ نەبوو. ئەو لەم بڕوایەدا بوو کە ئەوەی بە ناوی " غەریزەی کۆمەڵایەتی" ناوی دەبەن " غەریزەییەکی سەرەتایی وسەرەکی" نییە، بەڵکوو لە تەوەری بچوکتری وەك بنەماڵەوە سەری هەڵداوە. بۆچوونەکانی ئەو ئەم دەرئەنجامەی

لێدەکەوێتەوە کە سەرچاوەی زیاد بوون وکەم بوونەوەی تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە چۆنایەتی کاریگەری هەل‌ومەرجەکانی ژیان وپەیوەندی ژینگە لە گەڵ غەریزە دایە.

لە روانگەی فرۆیدەوە بۆ ئەوەی مرۆڤی کۆمەڵایەتی بوو هەمیشە بابەتی دەروونناسییە، لەم رووەوە ژینگە وهەل‌ومەرجی ژیانی مرۆڤ بە هۆکارێك دەزانێت کە رۆڵێکی جیدی لە کاملبوونی دەروونی مرۆڤ وتێگەیشتنی تیوریکی ئێمە لە ئەستۆ دەگرێت. فرۆید دان بە کاریگەری بیولۆژیکی وفیزیۆلۆژیکی غەریزەکاندا دەنێت. بەڵام لە سەر ئاستی راستکردنەوەی ئەم غەریزانە جەخت دەکاتەوە، وژینگە وراستییە کۆمەڵایەتییەکان بە هۆکاری راست کردنەوە دەزانێت.

لەم رووەوە وادیارە دەروونشیکاری ئەو گریمانەیەش لە خۆ دەگرێت کە شێوازەکانی بۆ توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان سودمەند دەکات وهەر جۆرە ناکۆکی ودژایەتییەك لە گەڵ دەروونناسی دا رەد دەکاتەوە. دەروونشیکاری بە دوای تێگەیشتن لە نیشانە دەروونییە هاوبەشەکان لە ئەندامانی گروپێکدا دەگەرێت و شرۆڤە کردنی ئەم نیشانانە بە گوێرەی ئەزموونە هاوبەشەکانی ژیانە بەڵام ئەو ئەزموونانەی ژیان لە هەرێمی تاك یاخود سروشتدا نین، بەڵکوو هاوسەنگ ویەکسانە لە گەڵ رەوشی کۆمەڵایەتی –ئابووری گروپەکە.

**لەم رووەوە دەروونناسی کۆمەڵایەتی شیکردنەوەیی لە گروپێکدا بە دوای دۆزینەوەی ئورگانی غەریزی وهەڵس‌و**

**کەوتی لیبیدۆیی وناوشیارانە دەگەڕێت کە بە گوێرەی بونیادی کۆمەڵایەتی- ئابووری ئەوە.**

لێرەدا شیاوە ئەم نارەزایەتییە دەربڕدرێت: دەروونشیکاری، کامڵبوونی غەریزی بە گوێرەی ئەزموونەکانی ژیانی سەردەمانی سەرەتای منداڵی بەیان دەکات، واتە سەردەمێك کە مرۆڤ تا ڕادەیەك کاری بە کۆمەڵگەوە نییە. بەڵکوو بە تایبەت لە نێو بنەماڵەی خۆیدا دەژی. کە واتە چۆن بە گوێرەی تیوری دەروونشیکاری پەیوەندی کۆمەڵایەتی وئابووری دەتوانێ گرنگایەتییەکی بەم شێوەیە بە دەست بهێنێت؟

لەو بارەیەوە بە هیچ شێوەیەك گرفت لە ئارادا نییە. هەڵبەت کاریگەری قەیرانی سەرەتایی لە سەر منداڵی لە حاڵی گەشە لە لایەن بنەماڵەوەیە. بەڵام بنەماڵە، تێکڕای پەیوەندییە ناوخۆیی وسۆزداری وپەروەردەییەکانی ئەوی، بە گوێرەی پێشینەی کۆمەڵایەتی وچینایەتی کۆمەڵگە خۆی شەرتی کردوەتەوە. بە کورتی تێکڕای ئەوانە لە ڕێگەی بونیادی کۆمەڵایەتییەوە کە ریشەی بنەماڵەشی تێدایە شەرتی کراوەتەوە.( بۆ نموونە: پەیوەندی سۆزداری نێوان باوك وکوڕ لە بنەماڵەی بورژوازی باوکسالاری‌دا لە گەڵ پەیوندی هەمان بنەماڵە لە ژینگەیەکی دایکسالاری‌دا بە تەواوەتی لێك جیاوازە). بنەماڵە ئامرازێکە کە لە ڕێگەی ئەوەوە کۆمەڵگە یان چینی کۆمەڵایەتی کاریگەری خۆی لە سەر منداڵ – وبە ناچاری کەسانی پێگەیشتوو – دادەنێت. **بنەماڵە ئاژانسی دەروونی کۆمەڵگەیە.**

تا ئیستا زۆربەی ئەو دەروونشیکارانەی، کە هەوڵیان داوە دەروونشیکاریش لە پرسە کۆمەڵایەتییەکاندا بە کار بهێنن، نەیانتوانیوە پێویستییە گرێداوەکانی دەروونناسی کۆمەڵایەتی شی کردنەوەیی دابین بکەن. سەرنەکەوتنی ئەوان لە هەڵسەنگاندنی خۆیاندا لە ئەرك وكاری بنەماڵەوە دەست پێدەکات. ئەوان بە روونی بۆیان دەرکەوتووە تەنها دەتوانن تاك بە بوونەوەرێکی شەرتی کراو لە قەڵەم بدەن. هەروەها ئەم بابەتەشیان بۆ روون بوویەوە کە تەنها پەیوەندی منداڵ لە گەڵ ئەندامانی بنەماڵە کاریگەرییەکی جیدی لە سەر کامڵبوونی ئەو هەیە، بەڵام ئەو دەروونشیکارانە بە تەواوەتی ئەم راستییەیان لە بەرچاو نەگرت کە بنەماڵە لە لایەنی دەروونی وبونیادی کۆمەڵایەتییەوە، لە گەڵ تێکڕای ئامانجە پەروەردەیی وشێوازە سۆزدارییەکاندا، خۆی دەستکەوتێکی بونیادی کۆمەڵایەتی چینایەتی دیاریکراوە و لە راستیدا تەنها ئاژانسی دەروونی کۆمەڵگە یان چینێك تێیدا جێ دەگرێت. ئەوان خاڵێکی دەستپێکردنی دروستیان بۆ بەیانکردنی کاریگەری دەروونی کۆمەڵگە لە سەر منداڵ دۆزیوەتەوە، بەڵام پێیان نەزانیوە.

چە دەرفەتگەلێك بوونی هەیە؟ توێژینەرەوانی دەروونشیکاری بە جۆرە پێش داوەرییەك هەڵخەڵەتێنران کە لە گەڵ تێکڕای توێژینەرە بورژوا و تەنانەت پێشکەوتن خوازەکانیش تێیدا بەشدار بوون. ئەوان کۆمەڵگەی بورژوا– سەرمایەداری بۆ دیکتاتۆری گەڕاندبووەوە وکەم تا زۆر وشیارانە لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو کۆمەڵگە" ئاسایی"

وهاوسەنگ بووە وهەلومەرج وهۆكارە دەروونییەكانی بە گشتی نموونەیەكی راستەقینەیە بۆ "كۆمەڵگە".

هۆكارێكی دیكە بۆ هەڵەی ئەم توێژنەرانە بوونی هەیە. ئامانجی توێژینەوەكانی ئەوان بەر لە هەر شتێك توێژینەوە لە سەر ئەندامانی نەخۆش وتەندروستی كۆمەڵگەی ئیدەئاڵ بە تایبەت چینی ناوەراست بوو، بە كورتی تاكەكانی چینی بورژوا پێشینەیەكی لێكچوویان هەیە. لەم رووەوە ئەوەی بنەمای جیاوازی ژیانی تایبەتی ئەوان دروست دەكات كەسایەتی تاك ولە روانگەی كۆمەڵایەتییەوە ئەزموونە لە ناكاوەكانە كە بنەماگەلێكی هاوبەشیان هەیە. تێكڕای ئەو كەسانەی كە لێكۆڵینەوەیان لە سەر كراوە خاوەن هەمان تایبەتمەندی جیاكەرەوە بوون وئەم تایبەتمەندییانە بەرهەمی كۆمەڵگەیەكی دەسەڵاتخواز بوو كە لە سەر بنەمای بونیادی چینایەتی ولانی زۆری ( قازانج ) رێكخرابوو.[1] جیاوازی ئەوان لە لایەن تایبەتمەندییەكانەوە تا ئاستێك بوو كە بۆ نموونە كەسێك باوكێكی هەبێت كە لە منداڵیدا ترساندبێتی،

---

[1] لە لایەنی دەروونناسییەوە، دەبێت ئاماژەگەلێك لە تاكدا كە نموونەی تێكڕای كۆمەڵگەیەلە گەڵ ئەو ئاماژانە كە تایبەتمەندی ئەم چینەیە لێك جیا بكەینەوە. بەلام بۆ ئەوەی بونیادی دەروونی گشتی كۆمەلچگەلە لایەن هەندێك نیشانەی تایبەت لە سەر چینەكان دانراوە، لەم رووەوە تایبەتمەندییە جیاكەرەوەكانی تایبەت بە چینێك، سەرەڕای گرنگییەكەی ، لە هەمبەر تێكڕای كۆمەڵگە لە پلەی دووهەمی گرنگیدایە. لە راستیدا یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی كۆمەڵگەی چینایەتی ، لە بن ناوی ئایدۆلۆژیادا شاردراوەتەوە، ناكۆكی نێوان یەكسانی رێژەیی بونیادی دەروونی چینە جۆراوجۆرەكان وقازانجی مادی ناكۆكی ئەوانە. هەرچەندە كۆمەڵگە لە لایەنی ئابووری، كۆمەڵایەتی ودەروونییەوە لاواز ببێت، هێزە دەسەڵاتدارەكانی كۆمەڵگە یان چینی دەسەڵات دار زیاتر ون دەبن وجیاوازی دەروونی لە نێوان چینە جۆراوجۆرەكاندا زیاد دەبێت.

ئەوی دیکە خۆشکێکی گەورەی هەبوو کە سەنتەری خۆشەویستی ئەو بوو، سێهەمینیان، بە شێوەیەك شەیدای دایکی بوو کە نەیدەتوانی پەیوەندییە لیبیدۆییەکانی لە گەل ئەودا بپچڕێنێت.

بە دڵنیاییەوە ئەو ئەزموونە تایبەتیانە گرنگترین هۆکاری کامڵبوونی هەرکامەیان بوو. بە چارە سەر کردنی پرسە دەروونییەکان کە لە ئەزموونە باسکراوەکانەوە سەرچاوەیان گرتبوو دەروونشیکاری ئەرکی تەواوەتی خۆی ئەنجامدا، ونەخۆش توانی خۆی لە گەڵ دیسپلینی کۆمەڵگەدا هاوئاهەنگ بکات. ئامانجی چارە سەری لەم قۆناغە زیاتر پێش نەکەوت. بە داخەوە تێگەیشتنی تیوریکی ئێمەش لە تێکڕای پێگەکە زیاتر پێش نەکەوت. بەڵام ئەم بابەتە لە دەروونناسیدا هەستپێکراو نییە. بەڵام بۆ ئەوەی سەرەی توێژینەوە لە دەروونناسی کۆمەڵایەتی هات ئەوەی هەڵەیەکی نادیار وشاراوە بوو، بوو بە سەرچاوەی هەڵەیەك کە لە سەر تێکڕای کۆششەکان کاریگەری دانا[1].

سرنجی سەرەکی دەروونشیکارە لە سەر بونیادی کۆمەڵگەی بورژوا وبنەماڵەی باوکسالاری، نیشاندەری ئەم بڕوایەیە کە کۆمەڵگەو بنەماڵە باردۆخێکی ئاسایی و ناوەندیکراویان هەیە. دوای دەروونناسی تاك، دەروونشیکاریش جیاوازییەکانی تاکی بە گوێرەی

---

[1] من ئیدی لەم بڕوایەدا نیم کە تەنها هەڵەی شاراوە دەبێتە هۆی تێگەیشتن لە تایبەتمەندییە جیاکەرەوە شەرتی بووەکان لە لایەن کۆمەڵگەی نەخۆشەوە،بە پێچەوانەوە بە بێ تێگەیشتن لەم بابەتە هۆکارە سەرەکییەکان لە بونیادی کاراکتەری نەخۆشدا شاراوە دەمێنێتەوە.

ئـازارە دەروونییـەكان كـە تـاك رووبـەڕوی دەبێتـەوە، دۆزییـەوە. لـە سـەرتادا دەروونشـیكاركان دیـاردە دەروونـی و كۆمەلایەتییـەكانیان بـە شێوەیەكی لێكچوو بەیان كرد: ئەوان ئەم دیاردانەیان بە گوێرەی ئازارە دەروونییـەكانی سەرچاوەگرتوو لـە روداوە كۆمەلایەتییـەكان لـە قەڵـەم دەدا. ئـەم بۆچوونـە لـە شێوازی شـیكردنەوەیی بـرەودار دا ئاسـتەنگی دروسـت كـرد. چـوونكە سـرنجیان نەدایـە جۆراوجـۆری ئەزموونـەكانی ژیـان- وجۆرەكـانی دیكـەی بونیـادی ئابووری، كۆمەلایـەتی كۆمەڵگـە- لــەم رووەوە بونیــادی دەروونییــان بــە گــوێرەی ئــەوەی بونیــادی كۆمەلایـەتی دیاریدەكـات لـە بەرچـاو نـەگرت، ولـە بـاتی شـیكردنەوە، شـێوازی بـەراورد كـردن وشـوبهاندنیان گرتـە بـەر. دەروونشـیكارەكان، مرۆڤ وكۆمەڵگەیان بە تاك لـە قەڵـەم داومیكـانیزمی تایبـەتی هـەیی لـە كەسـانی هاوچـەرخیان بـۆ هـەر جـۆرە كۆمەڵگەیـەك بـە راسـت دەزانـی ودیسـان بونیـادی دەروونــی ئـەم كۆمەڵگەیـەیان بـە بـەراورد لـە گـەڵ هەندێك لـە دیاردەكـان( بـە زۆری لـە جـۆری خـەمۆكی دەروونـی) كـە لـە تاكەكانی كۆمەڵگەی خۆیاندا باو بوو پێناسە كرد.

بەم شێوەیە ئـەوان ئـەو روانگەیـەیان كـە تەنانـەت بـۆ دەروونناسـی تاكیش لە لایەن دەروونشیكارییەوە لە قەڵەم دەدرا، لە بەرچاو نـەگرت. وئـەم راستییەیان لـە بیر كـرد كەخـەمۆكی دەروونـی- لـە نەخۆشـییەوە بگــرە تــا كاراكتــەر- لــە هاوئاهــەنگی نــەگونجاوی وروژێنــەرە غەریزییـەكانی تـاكی نائاسایی[1] (ناهاوسـەنگ) لـە گـەڵ راسـتییەكانی ژینگـەی خـۆی سەرچـاوە دەگرێـت، بـە دەربڕینێكـی دیكـە كەسـانی"

---

[1] Abnormal

تەندروست" توانای ئەم هاوئاهەنگییەیان هەیە. کە واتە دیاردەی سەرچاوەگرتوو لە توێژینەوەی دەروونناسی کۆمەڵایەتی( یان جەماوەری)ناتوانێت لە گەڵ دیاردەی خەمۆکی دەروونیدا بەراورد بکرێت. بەڵکوو دەبێ وەك هاوئاهەنگی ئورگانی غەریزی لە گەڵ راستینەی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم بدرێت.

نموونەی بەرچاو وسەرسوڕهێنەری ئەم شێوازەی رەها کردن، گرێی ئودیپە کە بوەتەمیکانیزمی گشتی مرۆڤ، سەرەڕای ئەوەی کە توێژینەوە کۆمەڵایەتی وئاکارییەکان نیشانی داوە کە ئەم پەیوەندییە سۆزدارییە رەنگە تەنها تایبەت بە بنەماڵە باوکسالارییەکان بێت. رەها کردنی گرێی ئودیپ فرۆیدی ناچار کرد تا تێکڕای کامڵبوونی مرۆوایەتی لە سەر میکانیزمی نەفرەت لە باوك و پەرچەکردارە سەرچاوەگرتووەکانیدا دابمەرزێنێت.[1] بە بێ ئەوەی سرنجێك بداتە هەلومەرجی ژیانی دایکسالاری ئەو گروپەی کە توێژینەوەی لە سەر دەکرێت.

بەڵام بلیمەتێکی وەك فرۆید، هەرچەندە لە روانگەی درۆینەی دەروونناسییەوە دەستی بە کارەکەی کردوتوانی هەندێك دۆزینەوەی بەنرخ ودیار ئەنجام بدات،[2] بەڵام لە کاری دەروونشیکارەکانی دیکەدا

---

[1] . Totem and Taboo

[2] فرۆید لە کتێبی " داهاتووی بیرکردنەوەییەك" دا ئەو تیۆرییەی کە راستی گۆڕانکارییەکانی لە بەرچاو نەدەگرت راست کردەوە. بە دانان بە گرنگی هەلومەرجی ئابووری ئەو لە روانگەی دەروونناسی تاکەوەو ئەوەی کە چۆن ئایین لە لایەنی دەرونی تاکەوە پاساو دەدرێت(دوپات بوونەوەی هەڵس‌وکەوتی منداڵسەبارەت بە باوك) هەروەها بە پرسی دەروونناسی کۆمەڵایەتی کە بۆچی ئایین لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە گونجاو

**ئـەم خاڵـە درۆینـەی دەسـتپێکردنە هەنـدێك ئـەنجامی لێکەوتـەوە کـە دەروونشـیکاری لــە روانگــەی کۆمەڵناسـی وتیـوری کۆمەڵایەتییــەوە دەتوانێت لە گەڵ مارکسیستی دا سازش بکات.**

**بەهــەر حــاڵ، رەخنــە گــرتن لــە دەروونشـیکاری لێـرەدا کۆتـایی پێنایەت. لە راستیدا شێوازی کلاسیکی دەروونناسی شی کردنـەوەیی تاك دەبێ لە گـەڵ شێوازی لـۆژیکی لە دەروونناسـی کۆمەڵگـەدا بە کار ببرێت، تا دەر ئەنجامێك بە دەست بخات کە ناڕەزایـەتی لێنەکەوێتـەوە.**

---

وپێویستە، سەرقاڵ دەبێت. وڵامی فرۆیـد ئەمەیـە کە تا کاتێك مرۆڤ پێویستی بـە فیکری ئایینی هەبوو، ئایین بۆ گرنگ نیشان دانی ئەوانە لە هەمبـەر سروشت پێویست بوو. بە گەشە کردنی تـەکنۆلۆژی وپێگەیشتنی مرۆڤ ئایین زیادە وزیانبـەخش لە قەڵەم درا. لـەم کتێبەدا فرۆید سرنجی داوەتەئەرکە کۆمەڵایەتییـەکانی ئایین. بە تایبـەت پەیوەندی نێوان ئایینـە جۆراوجۆرەکـان وبونیـادی کۆمەڵگـەی لـە بـەر چـاو نـەگرتووە. بـەڵام لـە شـێواز وناوەڕۆکدا ئەم کتێبە زۆر لە دەروونناسی کۆمەڵایەتی ماتریالیستیك نیزیکە. رەستەیەك لـە نـاوەڕۆکی ئـەم کتێبـە دەهێنمـەوە:" پێویسـتی بـە ووتـن نییـە کـە ئـەو کـەلتوورەی کـە ژمارەیەکی زۆر لـە ئەندامەکانی نارازی هێشتوەتەوە، بۆ مانـەوە ، داهاتوویـەکی رووناکی نییە، وسەبارەت بە دامرکاندنی ئەندامەکانی خۆیشی کارێکی ئەوتۆ ئەنجام نادات."

کتێبەکـەی فرۆیـد کـە لـە گـەڵ بۆچـوونەکانی سـەردەمی گـەنجێتی مارکسـدا کۆکەکـە وەك دروشـم دەیـووت:"هەڵپێچـاندی ئـایین کـە ئـامرازی هەڵـەی بەختــەوەری پرۆلەتەریایـە، بەختـەوەری راستەقینەی ئەم چینەی لێکەوتوەتـەوە. بۆ لـە ناو بردنـی وەهمـەکانی چینی پرۆلـە تـەر، سـەبارەت بـە بارودۆخـی خـۆ، دەبێـت ئـەو هەڵومەرجانـەی کـە ئـەم وەهمانـەی دروسـت کـردوە لــە نــاو ببرێـت. لــە راسـتیدا رەخنــە گــرتن لــە ئــایین، رەخنــە لــەو شوێنەفرمێسکانەیە کە دین وەك هەورێك بە دەوریدا تەنراوە ."

فرۆیـــد لـــە نوســـینەکانی دیکـــەی خۆیـــدا، ســـەبارەت بـــە پرســـەکانی دەروونناســـی کۆمەڵایـەتی(شارستانی وناخۆشییەکانی) ئیدی بە دوای فیکرە کۆنەکـەدا چە لـە لایـەنی شێوازەوە وچە لە لایەنی ناوەڕۆکەوە ناڕوات، بەڵکوو دەتوانین ئەم کتێبـەوەك ئانتی تێزێك ە هەمبەر داهاتووی بیرکردنەوەیەك لە قەڵەم بدەین.

کـەم وکوڕییەکـە لێرەدایەکـە دامەزرێنـەرانی دەروونشـیکاری لـە گواستنەوەی ئەم شێوازە لە تاکەوە بۆ گروپ ودیاردەکان بە باشی کاریان نەکردوە.

لێرەدا شیکردنەوەیەکی دیکە پێویستە . ئێمە لە سەر توانای راست کردنەوەی ( نەرمبوون) ئورگانی غەریزی لە رێگەی دزەکردنی هۆکارە دەرەکییەکانەوە( وکۆمەلایەتی) جەختمان کردەوە. بەلام نابێ ئەم راستییەمان لە بیر بچێت کە ئورگانی غەریزی، لە لایەن چەندایەتی وچۆنایەتییەوە، بۆنەرمکردن وراست کردنەوەی بیولۆژیکی وفیزیۆلۆژیکی سنوورێکی هەیە، وهۆکارە کۆمەلایەتییەکان تەنها لە چوارچێوەی ئەم سنوورەدا دەتوانن کاریگەری لە سەر دابنێن. بە بۆنەی هێزی سەرچاوەگرتوو لەو راست کردنەوە، وبە سرنجدان بەوەی کە ئورگانی غەریزی خۆی هێزێکی چالاکی توندە، لەم رووەوە خواستی گۆڕانکاری هەلومەرجی ژیان لە زاتی ئەو ئورگانەدا وئورگانی خزمەتگوزاری دابین کردنی ئامانجە غەریزییەکاندایە.

لە رووبەروو بوونەوەی بونیادی غەریزییەکان و هەلومەرجی ئابووری، بونیادە غەریزییەکان بە سەرهەلومەرجی ئابووریدا ئەولەویەتیان هەیە. نە بەم واتایە کە ئەوان وروژێنگەلێکی بە "هێز"ترن، بەلکوو بەم بۆنەیەوە کە دامرکاندنی پاراستنی زات گرێدراوی بەرهەمهێنانی مادی، واتە هەمان هەلومەرجی ئابوورییە، ودەفەتی راستکردنەوەی راستی ئابووری سنووردارتر لە توانای راست کردنەوەی ئورگانی غەریزەیە- بە تایبەت غەریزەی جنسی.

لــە بــەکار هێنــانی دەروونناســـی شـــیکردنەوەیی لـــە دیـــاردە کۆمەڵایەتییەکانـدا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە **دیـاردە دەروونناسـییە کۆمەڵایەتییـەکان دەبێـت پرۆسـەگەلێك لـە قەڵـەم بـدرێن کـە هاوئاهەنگییە چالاك وفەرمانبەرەکانی ئورگـانی غـەریزی لـە گـەڵ هەلومـەرجی کۆمەڵایـەتی وئابووریيـە. رۆڵـی هۆکـارە سـەرەتاییە چاککرەکان گرێـدراوی هەلومـەرجی ئابووریيـە. بنەماڵـە ئـامرازێکی سـەرەکییە کـە بـارودۆخی ئـابووری لـە ڕێگـەی ئەوەوەکاریگـەری چاککەری خـۆی لـە هەلومـەرجی رۆحـــی تاکـدا بـــە دەســـت دەهێنێــت. ئــەرکی دەروونناســـی کۆمەڵایەتی شیکردنەوەی شێوازە هاوبەش وئایدۆلۆژیکەکانە – بە تایبەت ریشە ناوشیارەکانیان – بـە گـوێرەی دزەکردنـی هەلومەرجی ئابووری لە سەر هەوڵدانە لیبیدۆییەکان.**

کـە واتـە، تـا ئێـرە وادیـار کـە شێوازی شیکردنەوەیی دەروونناسی کۆمەڵایـەتی کەگـەڵ شـێوازی دەروونناسـی تـاکی فرۆیـد ولـە گـەڵ پێویســتییەکانی ماتریــالیزمی مێژوویــدا هــاو ئاهەنگــە. بــەڵام بــە شـرۆڤەیەکی هەڵـە کـە لـە تیـوری مـارکس کـراوە هەنـدێك گرفتـی تـازە سـەریان هەڵـداوە: ئـەم بڕوایـە کـە ماتریـالیزمی مێـژوویی، تیۆرییـەکی دەروونناسی، یان باشتر بڵێن دەروونناسییەکی ئابوورییە.

ئەگەر بەهەمان شێوە کە"برترندراسل[1]"ئەڵێ: ئەمە راستە کەمارکس" پارە" وفرۆید" خۆشەویستی" بە وروژێنەری سەرەکی هەڵس وکەوتی مرۆڤ دەزانن لەم رووەوە بە گوێرەی بڕواکەی راسل نەدەبوایە ئەم دوانە ئاشتیان کردبایە. نموونەی مێش لە تیۆرییەکەی راسل لە بەرچاو بگرن. گریمان ئەم گیانلەبەرە بتوانێ بیر بکاتەوە، بڕوا ناکەم هەمان ئەو شتە بڵێ کە راسل گوتوویەتی، بەڵکوو ئەو مێشە ئەڵێت کە راسل هەم دەروونشیکاری وهەم مارکسیزمیشی خراپ راڤە کردوە. چوونکە دەروونشیکاری بە خۆ گونجاندنی هۆکارە بیولۆژیکییەکان(غەریزەکان ) لە گەڵ راستییە کۆمەڵایەتییەکان سەرقاڵ دەبێت، مارکسیزم لە بنەڕەتدا تیوری دەروونناسی نییە.

---

[1] راسل لە پێشەکی کتێبەکەی خویدا بە ناوی " بۆ چی هەمووان بایەخ بە دەروونشیکاری دەدەن؟" کە لە ساڵی ١٩٢٧دا بەڵاو کراوەتەوە دەنوسێت: هەڵبەت دەروونشیکاری لە گەڵ مارکسیزمدا ناکۆکە، چوونکە مارکس پشت بە خواستی ئابووری دەبەستێت ، ئەگەر گەشبین بین، پەیوەندی تەواوی لە گەل پاراستنی زات هەیە، بەڵام دەروونشیکاری لە سەر خواستی بیولۆژیکی و پاراستن زات لە رێگەی زاوزێوە جەخت دەکاتەوە. ئاشکرایە کە هەر دوو روانگەکە یەك لایەنەن ورۆلێکیان هەیە. دەتوانین بەم نموونەیە تیورییەکەی راسل روونتر بکەینەوە: مێش لە قۆناغی "لارۆ" دا تەنها ئەندامی خواردنی هەیەولە قۆناغی پێگەیشتن تەنها ئەندامی جووتگیری. ئەم گیانلەبەرە ئەگەر بیتوانیبا بیر بکاتەوە چی دەلێت؟ راسل ئەلی"ئەم مێشە لە قۆناغی لارۆ دا مارکسیستە ولە قۆناغی پێگەیشتندا فرۆیدیست". راسل دواتر دەلێ" کرمی کتێبی مۆزەی بەریتانیا " نوێنەری فەلسەفەی لارۆیە. ئەو خۆی بە فرۆید نزیکتر دەزانێ، چوونکە فرۆید لە هەمبەر خۆشەویستی نواندن بێ هەست نییە وپرسەکان بە دەستەواژە وبە گوێرەی " پارە پەیدا کردن" بەیان ناکات، واتە بە گوێرەی ئابووری ئەرزەدۆکس دارێژراوە لە لایەن پیرە پیاوانەوە سیساوە!!!

راسل تەنها کەس نییە کە ئەو دوو تیورییە بە هەڵە لێك دەداتەوە، گەلێك لە تیوریسێنەکان لە تیورییەکەی ئەودا هاوبەشن.

ئەم بڕوایە کە ماتریالیزمی مێژوویی، دەروونناسی ئابوورییە، لە لایەن "هندریك دومەن"ەوە پشتیوانی لێکراوە:

"هە روەها کە دەزانن، مارکس خۆی قەت تیوری وروژاندنی مرۆڤی دانەرێژا. لە راستیدا ئەو قەت نەیگوت کە واتای چین چییە؟ وکاتێك ئەم بابەتە سرنجی ڕاکێشا کە مەرگ مەجالی پێنەدا. بەلاّم گریمانە سەرەکییەکان کە خاڵی دەستپێکردنی ئەون، گومانیان تێدا نییە. تەنانەت گریمانە ناڕاستەوخۆکانی مارکس لە چالاکییە سیاسی وزانستییەکانی ئەودا بەر چاو دەکەوێت. هەر تیورییەکی ئابووری وهەر بۆچوونێکی سیاسی مارکس پشت بەم گریمانە دەبەستێت خواستە ویستیارییەکان کە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییان بە دوادا دێت، لە لایەنی بەرژەوەندی ئابوورییەوە سەپێنراوە. دەروونناسی کۆمەڵایەتی هەنووکەیی هەمان ئەندێشە بە گوێرەی کاریگەری‌پاڵنەری وەرگیراو لە هەڵس‌وکەوتی کۆمەڵایەتی بەیان دەکات. ئەگەر مارکس خۆی ئەم فورمۆل بەندیانەی بە زیادە لە قەڵەم دەدا، بەم بۆنەیەوە بوو کە بە ئامانجی ئابووری سیاسی سەردەمی خۆی لە قەڵەم دەدا."

هەنووکە ئەم " گریمانە ناڕاستەوخۆ" یانە دەتوانێ مەبەستی تێکڕای ئابووری ناسەکانی هاوچەرخی(بورژوا ) لە خۆ بگرێت، بەلاّم بە دڵنیاییەوە خودی مارکس ناگرێتەوە چوونکە ئەو لە زۆربەی خاڵەکاندا لە گەڵ تیوریسێنەکانی سەردەمی خۆیدا هاوڕا نەبوو.

برنشتاین لە بەرگری کردن لە گرنگی ماتریالیزمی مێژوویی بە بێ پەردەییەکی کەمترەوە لەم لێکدانەوە دەروونشیکاریانەی ئەو لایەنگری دەکات:

" لێکدانەوەی ئابووری مێژوو بە ناچاری بەم واتایە نییە کە تەنها دەبێ هێز ووروژێنەرە ئابوورییەکان سرنجیان پێبدرێت، بەڵکوو دەبێ بزانین کە ئابووری هەمیشە هۆکارێکی دیاریکەرە وبەردی بناغەی بزوتنەوە گەورەکانی مێژوو بووە.".

لە پشت ئەم تیۆرییەوە ئەم بۆچوونەش بوونی هەیە کە مارکسیزم دەروونناسییەکی ئابوورییە کە لە لایەن برنشتاینەوە پالاوتە کراوە وکاملبووە.[1]

ئەم تیۆرییە کە"پاڵنەری موڵکداریەتی" ورووژێنەری سەرەکی یان بێ وێنەی مرۆڤە، بەرهەمی خەیاڵەکانی بورژوا– لیبرالیزمە، کە وەك باسێکی دەروونناسی سەبارەت بە دەرفەتی دەستەبەر بوونی سوسیالیزم بە کار دێت.[2] شرۆڤەکەرانی وردە بورژوازی مارکس تیۆرییەکەی ئەویان بە دەروونناسی ئابووری لێکداوەتەوە. لە راستیدا ماتریالیزمی مێژوویی لە تیوری دەروونناسی بوون دورە، گریمانە

---

[1] Kautsky لە سەرتای نوسینەکەی خۆی بە ناوی" ماتریالیزمی مێژوویی" لێکدانەوەی دەروونناسی بە توندی رەت دەکاتەوە، بەڵام دواتر ماتریالیزمی مێژوویی لە گەڵ دەروونناسییەکی ئیدەیالیزم، بەو گریمانەی کە پاڵنەری کۆمەلایەتی سەرەتاییی بوونی هەیە، کامڵ دەبێت.

[2] لە راستیدا لە دژی بەکار هێنانی ماتریالیزمی مێژوویی لە بورژوازیدا کە لە لایەن دژبەرانەوە هاتوەتە نێو تیورییەکەوە گەلێك ناڕەزایەتی بەرز بوەتەوە.

دەروناسییەکانی کەمەو هەمووی لەم چەند رەستەیەدا کورت دەبێتەوە: **مرۆڤەکان خۆیان مێژووی خۆیان دروست دەکەن، پێداویستییەکانی** کار وهەستەکانی مرۆڤ" برسێتی وخۆشەویستی" دەوروژێنن، [1] ئەم پێداویستیانە بە درێژایی کامڵبوونی مێژوویی، زیاد دەبن ودەرئەنجام دەبێتە هۆی توندبوونەوە وزیاد بوونی چالاکی ئابووری. [2]

هۆکاری ئابووری لە پەیوەندی لە گەڵ دەروونناسیدا تەنها تا ئاستی پێداویستییەکانی مرۆڤ رۆڵی ماتریالیزمی مێژوویی دەگێرێت- بە پلەی یەکەم پێداویستی پاراستنی زات- بە شێوەیەك کە ئەم پێداویستیانە لە رێگەی بەرهەمهێنانی کالاوە تا ئاستێکی بەرز دابین دەبن، بە دربڕینێکیتر پێداویستییەکان ئامرازی وروژێنەری بەرهەمهێنانن. هەڵبەت مارکس وئەنگلس جەختیان کردوەتەوە کە پاڵنەری پاراستنی زات لە پێشی پێداویستییەکانی دیکەوەیە، بەلام وردەکاری پاڵنەرەکان وپێداویستییە جۆراوجۆرەکانیان شرۆڤە

---

[1] ئاشکرایە کە مەبەستی من لەخۆشەویستی فورمۆل بەندی سەرەتای فرۆیدە. خۆشەویستی لە واتای گشت پەسەندیدا هاوواتای ئارەزۆ جنسییەکانی وەك بەر لە سەردەمی زاوزێیە: ئەگەر "پاراستنی زات وئارەزۆ جنسییەکان" م دەنوسی روونتر دەبوەوە ١٩٧٠.

[2] بە هەمان شێوە کە ئاژەڵ دەبێ لە سروشت کە پێداویستییەکانی دابین دەکات، رازی بێت وژیان وپرۆسەی منداڵبوون وزاوزێ ی خۆی بپارێزێت، مرۆڤی پێشکەوتووش دەبێ لە تێکرای شێوەکانی کۆمەڵگە ولە گەڵ تێکرای ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دا هەمان شێوازی هەبێت. هەرچەندە مرۆڤ زیاتر کامڵ بێت وگەشە بکات، گۆرەپانی پێداویستییە سروشتییەکانی فراوانتر دەبێت، وبە ناچاری توانای بەرهەمهێنانیش کە ئەم پێداویستیانە دابین دەکات فراوان دەبێت(کتێبی کاپیتاڵ لە نوسینی مارکس)

نەکرد.[1] ئەوان قەت لافی ئەوەیان لیّ نەدا کە " پاڵنەری موڵکداریەتی" یان شەهوەتی بە دەست هێنان( کۆکردنەوە) وەك ئامانج، تەنها پێداویستی سەرەکییە. گشت گیر کردنی ئەم پاڵنەرە بە واتای رەها کردنی گەمژانەی تایبەتمەندییەکی دەروونییە کەهێزێکی نەناسراوە لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا.

مارکس وئەنگلس داوین کەسانێکن کە دەتوانین فیکری گۆڕینی روخساری بورژوازی وتایبەتمەندییە جیاکەرە سەرمایەدارییەکان بەتایبەتمەندییە رەهاکان، بەئەوان پەیوند بدەین. ئەو دوانە بە باشی شارەزای ئەو پێگەیە بوون کە دەروونناسی لە کۆمەڵناسیدا هەیبوو، بەلاّم دەروونناس نەبوون ونەیاندەویست ببنە دەروونناس. دیسان جگە لەم بەڵگانە لە ئەدەبیاتی چەرخی رووناکگەری فەرەنسا" بە تایبەت هلڤتیوس"[2] کە نابێ کەمبایەخ لە قەڵەم بدرێن، ئەوان لە دەروونناسی ماتریالیست شتێکیان لە بەردەستدا نەبوو. دەروونشیکاری یەکەمین سەرچاوە بوو کە دەیتوانی ئەم دەروونناسییە دابین بکات. دەروونشیکاری نیشانی دا کە "پاڵنەری موڵکداریەتی" هەرچەند گرنگە ، بەلاّم لە بەراورد لە گەڵ پێداویستییەکانی دیکەدا( زاوزێیی، سادیستیك وخۆپەرەستی) رۆڵێکی بەرچاوی لە چۆنایەتییە دەروونییەکانی مرۆڤدا نییە. لە پێوەرێکی فراواندا

---

[1] لە وتاری " بەشداری مارکس لە ناسینی مرۆڤ" دا ئەم تیورییەم راست کردوەتەوە ونیشانم داوە کە مارکس، زۆر لەوە زیاتر کە لە نوسینەکانیدا دیارە لە دەروونناسیدا پسپۆڕ بووە.

[2] Claud Helvetius (١٧١٥-١٧٧١).فەیلەسوفی فرەنسی

"پاڵنەری موڵکداریەتی" هۆکارێکی گرنگی دامرکاندنی پێداویستی بە دەستهێنان یان خاوەنداریەتی شتەکان نییە، بەڵکوو نیشان دەری خۆپەرەستییە تا تاك خۆی بە کەسانی دیکە بناسێنێت. کۆمەڵگەیەك کە رێز لە دەوڵەمەندەکان دەگرێت وپێیاندا هەڵدەڵێت، پێداویستی خۆپەرەستی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە بەرەو خاوەنداریەتییەکی زیاتر وبێوێنە رادەکێشێت. لە لایەکی ترەوەلە کۆمەڵگەیەکدا کەخزمەتگوزارییەکان تایبەت بە چینێکی تایبەتە نەك هەمووان، وئەم تایبەتمەندییە خۆی بناغەی رێزی کۆمەلایەتییە، هەمان خواستی خۆپەرەستی لە بن پەردەی "پاڵنەر"دا ئاشکرا دەبێت. بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی خۆپەرەستی کە لە سەرەتاییترین وبە هێزترین هەوڵدانە دەروونییەکانە، لەم روەوە ئامانج(و ناوەرۆکی هەست پێکراوی ئەوان) گرێدراوی بونیادی تایبەتی کۆمەڵگەیە. کە واتە رۆڵی سەپێنراوی" پاڵنەریخاوەنداریەتی" بە پێوانەیەکی زۆر خاوەن برەوی دارایی وسامانە لە کۆمەڵگەی بورژوازیدا.

کاتێك لە روانگەی دایکسالاری مێژووییەوە لە هۆکارە ئابوورییە کان دەدوێن-جگە لەو واتایە کە لە سەرەوە باسمان کرد- مەبەستی ئابووری لە چالاکی مرۆڤ ، وروژێنەرێکی دەروونی وزەینی نییە. تێکڕای چالاکییەکانی مرۆڤ ودامرکاندنی تێکڕای پێداویستییەکان، گرێدراوی چییەتی تایبەتی هەلومەرجی سروشتی وئابووری ژینگەیە، وهەر ئەم هەلومەرجەیە کە شێوازی ژیانی مرۆڤ دیاری دەکات. لە روانگەی مارکسەوە ئاگاهی مرۆڤ بە گوێرەی چۆنایەتی

کۆمەڵگە، بە گوێرەی ژیانی راستەقینەی دونیایی کە بە پلەیەکی لە توانای سود بەخشی دیاراکراوە شەرتی کراوە، هەڵدەسەنگێندرێت[١].

"بەرهەم هێنانی ئەندێشەکان، بیرکردنەوە وئاگاهییەکان، راستە وخۆ لە گەڵ چالاکییە مادییەکانی مرۆڤ گرێدراو وتێکەڵاوە، وچالاکی مادی نیشاندەری ژیانی راستەقینەی مرۆڤە. بیرکردنەوە وئەندێشەی عاقڵانەی مرۆڤ سەرریژی راستەوخۆی چالاکی مادییە. ئەم رەوتە لە سیاسەت، یاسا، ئاکار، ئایین، میتافیزیك و....یشدا راستە. مرۆڤەکان بیرکردنەوە وبیروبڕواکانی خۆیان بەرهەمدەهێنن، بەڵام ئێمە لەسەر مرۆڤە راستەقینە ونائەبستراکتەکان دەدوێن، کە بە شێوازێکی تایبەت شەرتی کراون بە شێوەیەك کە توانا بەرهەمهێنانیان ودەرئەنجام گرێدراوەکانیان گەشە دەکەن وکامڵ دەبن. ئاگاهی جگە لە ژیانی وشیارانە هیچێکیتر نییە و بوونی مرۆڤ ژیانی راستەقینە وهەست پێکراوی ئەوە"[٢]

ماتریالیزمی مێژوویی، مێژوو بە پرۆسەی پێکەوە گونجانی چالاك وفەرمانبەری مرۆڤ لە گەڵ هەل ومەرجی سروشتی ژینگەی خۆی

---

(١) " نوسراوە وئابوورییە"کان لە کاتی نوسینی ئەم وتارەدا هێشتا چاپ وبەڵاو نەکرابووەوە، مارکس بە باشی ئەم خاڵە روون دەکاتەوە. ئەو دەنوسێت".... تەنها ئەو تایانەی کە ئابووری سیاسی دەیانجوڵێنێت، رق و چاو چنۆکییە.... تەنانەت R. Tucker کە بیرمەندێکی گەشبین بوو و لە بن کاریگەری ئەم بۆچوونەدا بوو کە مارکس رق و چاوچنۆکی وەك وروژێنەری سەرەتایی لە قەڵەم دەدات، ئەو لەم قسەی مارکسە کە بە زمانی ئەڵمانییە پێچەوانە تێگەیشتوە واتە:" تەنها ئەو تایانەی کە ئابووری سیاسی دەجوڵێنێت رق وچاوچنۆکییە."

(٢) Part Of Deutschen لە نوسینی مارکس وئەنگلس

دەزانێت." کار بە پلەی یەکەم پرۆسەیەکە لە نێوان مرۆڤ وسروشتدا، پرۆسەیەکە کە تێدا مرۆڤ کاری بەرانبەری خۆی لە گەڵ سروشت لە ڕێگەی کارەکانی خۆیەوە ڕێك وپێك وکونترۆڵ دەکات. بەم شێوەیە مرۆڤ لە هەمبەر توخمەکانی سروشت هێزێکی سروشتی لە قەڵەم دەدرێت."[1]

مرۆڤ وسروشت دوو جەمسەرن کە بە شێوەیەکی بەرانبەر کاردەکەن، یەکدی شەرتی و نەرم دەکەن ویاخود یەکدی دەگۆڕن. پرۆسەی مێژوویی هەمیشە لە گەڵ سروشتی مرۆڤ وهەل‌ومەرجی سروشتی ژینگەی دەرەوەدا پەیوەندی هەیە. هەرچەند مارکس جەختی لە سەر ئەم ڕاستییە کردوەتەوە کە مرۆڤ بە درێژایی مێژوو خۆی وسروشتی گۆڕیوە، بەڵام هەمیشەش دووپاتی دەکاتەوە کە ئەو گۆڕانکاریانە گرێدراوی هەل‌ومەرجی سروشتی بووە. ئەمە کوت ومت هەمان خاڵە کە ڕوانگەی ئەو لە هەندێك ئیدەیالیست کە بڕوایان بە هێزی بێ سنووری ویستی مرۆڤ هەیە، جیا دەکاتەوە. بە شێوەیەك کە مارکس وئەنگلس گوتویانە:

" ئەو پێش وەهمانەی کە خاڵی دەستپێکی ئێمەن دوگمی ڕەها نین. بەڵکوو ڕاستی گەلێکن کە تەنها لە دونیای خەیاڵدا دەتوانی چاوپۆشیان لێ بکەیت. ئەوان کەسانی ڕاستەقینە وزیندو، کارەکانیان وهەڵومەرجی ژیانی مادی کە دەتوانن، یان دەبێت، پێکی بهێنن، لە خۆدەگرن. لەم ڕوەوە پێش وەهمە باسکراوەکان لە ڕێگەی ئەزمونەوە دەتوانین توێژینەوەیان لە سەر بکەین."

---

[1] کاپیتاڵ لە نوسینی مارکس

"یەکەمین بڕگەی مێژووی مرۆڤ ، بوونی مرۆڤی زیندوە . کە واتە یەکەمین راستیەك کە دەبێ سرنجی پێبدرێت ئورگانی جەستەی ئەم کەسانە ودەرئەنجامە سەرچاوە گرتوەکانە لە پەیوەندی ئەوان لە گەڵ سروشت. لێرەدا ناتوانین لە سەر سروشتی جەستەیی مرۆڤ ویان هەل‌ومەرجی لە حاڵی گۆڕانی (ژیولۆژێکی، هەرێمی وهتد) ژینگەی سروشتی ژیانی مرۆڤ بیر بکەینەوە. هەرشرۆڤەیەکی مێژوویی دەبێ بەم ئاستەنگە سروشتیانە، وگۆڕانکارییەکانیان لە سەردەمی مێژووی چالاکی مرۆڤەوە دەست پێبکات[1]"

دوای چارە سەر کردنی توند ترین لێك تێنەگەیشتنی لە پەیوەندی دەروونشیکاری و ماتریالیزمی مێژوویی چە شتێکی دیکە رودەدات؟

دەروونشیکاری دەتوانێت لە نمونەیەکی تایبەتدا چەمکی ماتریالیزمی مێژووی دەوڵەمەند بکات. **دەتوانێ زانیارییەکی تێروتەسەل سەبارەت بە یەکێك لەو هۆکارانەی کە لە پرۆسەی کۆمەڵایەتیدا چالاکن بەدەستەوە بدات: سروشتی مرۆڤ** .دەروون شیکاری ئورگانی غەریزەی مرۆڤ لە نێوان هۆکارە سروشتیەکان کە پرۆسەی کۆمەڵایەتی نەرم دەکەن ودەیانگۆڕن جێگیر دەکات. هەرچەند کە ئەم نەرم کردن وگۆرانکاریەش سنورێکی هەیە. ئورگانی غەریزەی مرۆڤ یەکێك لە هەل‌ومەرجە "سروشتیەکانە" کە بەشێك لە ژێرخانی پرۆسەی کۆمەڵایەتییە. بەڵام ئێمە سەبارەت بە ئورگانی غەریزە ی "گشتی" یان شێوەی دەستکاری نەکراوای قسە ناکەین، چوونکە ئەم

---

[1] مارکس وئینگلس هەمان کتێب

ئورگانە تەنها لە شێوەیەکی "تایبەت" دا ئاشکرا دەبێت کە لە رێگەی کۆمەلآیەتییەوە شەرتی کراوە. دەروونی مرۆڤ _ یان هێزە لیبیدۆییەکان وەك ریشەکانی _ بەشێك لەم ژێرخانەن، بەلآم بە پێچەوانەوە ئەوانەی کە لە هەندێك لێك دانەوەی دەروون ناسیدا گوتراوە تێکڕای ژێرخان نین. دەروونی مرۆڤ هەمیشە وەك دەروونێك دەمێنێتەوە کە لە رێگەی پرۆسەی کۆمەلآیەتییەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ماتریالیزمی مێژوویی پێویستی بە دەروون ناسی (زانستی بونیادی دەروونی مرۆڤ ) هەیە. ودەروون شیکاری یەکەمین سیستەمەکە دەتوانێ دەروونناسی پێویست بۆ ماتریالیزمی مێژوویی دابین بکات.

بەم هۆکارانەی خوارەوە بەشداری دەروون شیکاری لە ماتریالیزمی مێژوویدا گرنگییەکی زۆری هەیە: مارکس وئەنگلس گرێدانی تێکڕای پرۆسە ئایدۆلۆژیکەکانیان بە بونیادی ئابوورییەوە بە پێویست دەزانی. ئەوان داهێنانە دەروونی وزەنییەکانیان بە" بناغەی مادی عەکس کراو لە مێشکی مرۆڤ " دا لە قەلەم دەدا. بە دلنیاییەوە لە گەلێك نمونەدا ماتریالیزمی مێژوویی دەتوانێ بە بێ پێویستی بە گریمانە دەروونناسییەکان، خۆی ولآمدەرەوەبێت، بەلآم تەنها لە نمونە گەلێکدا کە ئایدۆلۆژیاکان دواین دەربڕی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان بن، ویان لە شوێنێکدا کە هەول دەدرێت پەیوەندی بەرانبەرلە نێوان ژێرخانی ئابووری سەرخانی ئایدولوژی گرێ بدرێت. بە بۆنەی نەبوونی دەروونناسییەکی تێروتەسەل ورازی کەر، مارکس وئەنگلس نەیانتوانی

ئەوە شرۆڤە بکەن کە چۆن بنەمای مادی لە مێشك ودڵی مرۆڤدا ڕەنگدەداتەوە.

دەروونشیکاری نیشان دەدات کە ئایدۆلوژییەکانی مرۆڤ بەرهەمی هەندێك لە خواست،پاڵنەری غەریزی، بەرژەوەندی وپێویستییەکانە. هەروەها دەروونشیکاری نیشان دەدات لە حاڵێکدا کە پاڵنەرە غەریزییەکان کە لە سەر بنەمای ئەو غەریزانەی کە بەشێوەی بیولۆژیکی دروست دەبن، کامڵ دەبن، بەڵام چەندایەتی وناوەڕۆکەکەیان بە توندی لە بن کاریگەری پێگە یان چینی کۆمەڵایەتی تاکدایە. مارکس دەڵێ کە مرۆڤەکان خۆیان ئایدۆلۆژیای خۆیان دەخولقێنن، دەروونناسی شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی دەتوانێ بە شێوەی ئەزموونی پرۆسەی دروست کردنی ئایدولۆژیاکان وپەیوەندی بەرانبەری هۆکارە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان بسەلمێنێت. لەم ڕووەوە دەروونشیکاری نیشان دەدات کە چۆن بارودۆخی ئابووری لە ڕێگەی پاڵنەرەکانی مرۆڤەوە دەبێتە ئایدۆلۆژیا.

خاڵێکی گرنگ کە دەبێ سرنجی پێ بدرێت ئەمەیە کە کاری بەرانبەری نێوان غەریزەکان وژینگە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە ناخی خودی مرۆڤدا، بەهەمان شێوە کە کاریگەری ژینگەی دەرەکی، مرۆڤ توشی گۆڕان دەکات. بە شێوەیەك کە فرۆید بە جاران جەختی کردوەتەوە کە ئەم خاڵە ڕێکخراوی "خۆ"ی مرۆڤ و گەشەی توانایی وبلندگەرایی مرۆڤە. لەم ڕووەوە دەروونشیکاری ڕێگەمان پێدەدات کە دروست بوونی ئایدۆلوژی وەك جۆرە (پرۆسەیەکی بەرهەمهێنان" چاو لێبکەین، بە هەمان شێوە کە متابولیزم( کاری سوتاندن وهەزمکردنی

خواردن لە نێوجەستەدا.-و-) لە جەستەدا پرۆسەیەکی دیکەیە لە نێو مرۆڤ وسروشتدا . بابەتی روون وبەرچاو ئەمەیە کە" سروشت لە ناخی مرۆڤدایە نەك لە دەوروبەری ئەودا".

دیسان دەروونشیکاری شێوازەکانی دروست بوونی کۆمەڵگە لە رێگەی ئەندێشە وئایدۆلۆژیاکانەوە بە ئێمە نیشان دەدات. ئەم زانستە دەتوانێت نیشان بدات کە چۆنایەتی رووبەروو بوونەوە لە گەڵ ئەندێشەیەك لە بنەڕەتدا گرێدراوی ناوەڕۆکی ناوشیاری ئەوە، کە گرێدراوی هەندێك پاڵنەرە ، بەم واتایە کە گۆیا چۆنایەتی توندی بونیادی لیبیدۆی کۆمەڵگەیە کە کارێگەری کۆمەڵایەتی ئایدۆلۆژیەك دیاری دەکات.

ئاشکرایە کە دەروونناسی شیکردنەوەیی کۆمەڵایەتی پلەیەکی بە نرخی لە ماتریالیزمی مێژووییدا هەیە، بەم شێوەیە دەتوانم بە بێ پەردە لافی ئەوە لێبدەم کە چارەسەر کەری خێرای ئەو گرفتانەیە کە رووبەرووی ماتریالیزمی مێژوویی دەبێتەوە.

هەنووکە ماتریالیزمی مێژوویی بۆ هەندێك لە ناڕەزایەتییەکان وەڵامێکی باشتری پێیە. بۆ نموونە هەندێك لە دژبەران ئاماژە بەو رۆڵە دەکەن کە ئامانجەکان-خۆشەویستی بۆ هاوچەشن وئارەزۆی ئازادی- هەیانە. هەڵبەت ماتریالیزمی مێژوویی دەتوانێ ئەم جۆرە پرسانە وەك ئەوەی لە هەرێمی دەروونناسیدان رەد بکاتەوە وخۆی بە شیکردنەوەی هەل‌ومەرجی بابەتی ئابووری کە لە سەر رووداوە مێژووییەکان کاریگەری هەیە سنووردار بکاتەوە. بەلام لە هەل‌ومەرجێکدا نەبوو کە بە روونی چییەتی وسەرچاوەی ئەم هێزە راستەقینەو کاریگەرانەی

مرۆڤ شرۆڤە بكات یان بتوانێت ئەو رۆڵەی كە ئەم هێزانە لە پرۆسەی كۆمەڵایەتیدا دەیگێڕن وەسف بكات. دەروونشیكاری دەتوانێ نیشان بدات كە وروژێنەرە بە رواڵەت ئامانجییەكان، ئاشكراكەری پێداویستییە لیبیدۆییە لۆژیكی كراوەكانە وناوەڕۆك وسنووری پێداویستییە زاڵەكان لە سەردەمی دیاریكراودا بە گوێرەی كاریگەری بار ودۆخی كۆمەڵایەتی – ئابووری لە سەر بونیادی غەریزی گروپی كە خولقێنەری ئایدۆلۆژیایە وەسف بكات. كە واتە دەروونشیكاری دەتوانێت بالآترین خواست ووروژێنەری ئیدەیالیستی تا ئاستی لیبیدۆیی نزم بكاتەوە بە بێ ئەوەی پێداویستییە ئابوورییەكان بە تەنها پێداویستی گرنگ لە قەڵەم بدات.[1]

---

[1] نەبوونی دەروونناسی بە گوێرەی پێویست هەندێك لە لایەنگرانی ماتریالیزمی مێژوویی ناچار كرد دەروونناسییەكی تایبەتی و ئیدەیالیستیكی روتلە شوێنی بەتاڵی ئەودا دابنێن . نموونەیەك" كاتسكییە Kautsky" كە هەڵبەت نە بە بێ پەردەیی وشەفافی برنشتاین وكەسانی دیكە، گریمانە دەكات كە مرۆڤ" غەریزەییەكی كۆمەڵایەتی" هەیە، وپەیوەندی نێوان غەریزەی كۆمەڵایەتی وپەیوەندی كۆمەڵایەتی بەم شێوەیە وەسف دەكات:" مرۆڤ بە گوێرەی توندی ولاوازی غەریزەی كۆمەڵایەتی خۆی بەرو لای "چاكە وخراپە" دەڕوات، بەڵام گرنگی هەل ومەرجی كۆمەڵایەتی ژیان كەمتر لە هەل ومەرجە باسكراوەكان لە هەڵبژاردنی یەكێك لەو دوو خواستەیە." ئاشكرایە كە غەریزەی كۆمەڵایەتی كاتسكی جگە لە بنەچەی ئاكاری زاتی هیچێكی تر نییە. بۆچوونی ئەو لەو شێوازەی بەیانی دەكات لە گەڵ ئاكاری ئیدەیالیستیدا جیاوازە.

" بوخارین" لە " تیوری ماتریالیزمی مێژوویی"دا بڕگەیەكی تەواوەی بۆ پرسی دەروونناسی تەرخان كردوە. ئەو دوپاتی دەكاتەوە كە دەروونناسی چینێك لە گەڵ بەرژەوەندییەكانی یەكێكە- ومەبەستی ئەو لە "بەرژەوەندییەكان" بەرژەوەندی گەلێكی راستەقینەی ئابوورییە. بەڵام دەروونناسی توێژێك دەبێت بە گوێرەی رۆڵی كۆمەڵایەتی

به کورتی:

١- پاڵنەرەکانی مرۆڤ هێزێکی سروشتین ووەك هێزە سروشتیەکانی دیکە(بە پیت بوونی خاك ، ئاوەدانی و....) یەکێك لە بەشە حاشاهەڵنەگرەکانی پرۆسەی کۆمەڵایەتییە. کە واتە شارەزا بوون لەم هێزە پێویستە تا تێگەیشتنێکی تەواوەتی لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی مومکین ببێت.

٢- ئەو شێوازە کە ئایدۆلۆژیاکان لە رێگەیەوە دروست بوون وکار دەکەن تەنها کاتێك بە باشی دەناسرێن کە لە چۆنییەتی شێوازی کارکردنی سیستەمی پاڵنەرەکان شارەزا بین.٣- کاتێك کە هۆکارە شەرتی کراوە ئابوورییەکان لە گەڵ هەرێمی پاڵنەرەکاندا تێکەڵ ببێت هەندێك گۆڕانکاری روودەدات، پرۆسەی کۆمەڵایەتی بە پشت بەستن بە کاریگەری پاڵنەرەکان بە رەوتێکی خێراتر یان هێدی تر لەوەی

---

ئابووری هەمان تویژ بێت. ئەو بۆ نموونە چۆنییەتی نائومێدی گروپ یان کۆمەڵانێك دوای بن کەوتن لە خەباتی چینایەتیدا شرۆڤە دەکات:" شەڕ وململانێ لە لایەن ورووژێنەری شاراوەی لایەنەکانی ململانێوە بەرێوە دچێت، وهەنووکە خەباتکارەکان بن کەوتوون.ئەم بار ودۆخە سەرلێشێوان ونائومێدی لێکەوتووەتەوە وخەڵك چاوەڕوانی موعجیزەیەك( پەرجوو) دەکەن." بوخارین بەردەوام دەبێت:" بە سەیرکردنی دەروونناسی چینایەتی، دڵنیاین کە ئێمەرووبەرووی دیاردەیەکی زۆر ئاڵۆز بووینەتەوە کە ناتوانین لە سەر بنەمای بەرژەوەندی روت وەسفی بکەین، بەڵکوو دەبێ بە گوێرەی بارودۆخی هەستپێکراو وکەڵەکە بووی چینەکە وەسف بکرێت".

بوخارین دیسان ئەڵێ :" پرۆسەکانی ئایدۆلۆژی جۆرێکی تایبەتە لە کاری کۆمەڵایەتی. بەڵام بۆ ئەوەی دەروونناسییە کی گونجاومان لە بەر دەستدا نییە ناتوانین چییەتی پرۆسەی کارە شرۆڤەبکەین .

چاوەڕوان دەکرێ کار دەکات، ئەگەر تێبینییە تیوریکییەکان سەبارەت بەهۆکارە دەروونییەکان راست نەبێت.

لەم رووەوە بە کار هێنانی دەروونشیکاری لە ماتریالیزمی مێژوویی بوەتە هۆی ئەوەی کە زانیارییەکی فراوانتر لەو هێزانەی کە لە پرۆسە کۆمەڵایەتییەکاندا کار دەکەن ، بە دەست بێت، ودڵنیاییەکی زیاتر لە تێگەیشتنی سوڕی مێژوویی وپێشبینی داهاتووەکەی بە دەست دێت. بە تایبەت ئەم کارە زانیارییەکی تەواوی لە چۆنیەتی دروست بوونی ئایدۆلۆژیاکان بە دەستەوە داوە.

هەڵبەت، سودمەندبوونی دەروونناسی شیکردنەوەیی کۆمەڵایەتی گرێدراوی گرنگی لیبیدۆییە لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی‌دا. بۆ ئەوەی لەم بڕگەیەدا ناتوانین بە تێروتەسەلی باسی ئەم بوارە بکەین لەم رووەوە تەنها ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکەم.

گریمان ئەم پرسیارەمان لێدەکرێت: چە هێزێك کۆمەڵگە دەپارێزێت وچە هێزێك دەبێتە هۆی هەژان وویرانی؟ دەزانین کە گەشەی ئابووری دەبێتە هۆی سەقامگیری وناکۆکی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی لێکترازانی کۆمەڵگە. بەلام هۆکارێکی وەها کە، لە سەر بنەمای ئەو دوو مەرجە، گرنگترین توخمی بونیادی کۆمەڵایەتی، خواستە لیبیدۆییەکانە کە لە مرۆڤدا بوونی هەیە. سەرەتا کۆمەڵگەیەکی تا رادەیەك سەقامگیر لە بەر چاو بگرن. هۆکاری یەکبوون وپەیوەندی خەڵك لە گەڵ یەکدی چییە؟ چە شتێك دەرفەتی ئەوەیان پێدەدا کە هەست بە یەکبوون بکەن وخۆیان لە گەڵ رۆڵی دەسەلاتدار وبێ دەسەلاتدا هاوئاهەنگ بکەن؟ بە دڵنیاییەوە ئورگانی دەسەلاتی دەرەکی( پۆلیس، یاسا، دادگە، سوپاو....) رێگە نادات کۆمەڵگایەك

لێکبترازێت. و بە دڵنیاییەوە بەرژەوەندی لۆژیکی و خودگەرایی لە سەقامگیری بونیادیدا خاوەن رۆڵە. بەڵام ئەگەر کۆششە لیبیدۆییەکانی خەڵك بوونی نەبوو، نە هێزە دەرەکییەکان و نە بەرژەوەندی لۆژیکی نەیاندەتوانی کاری کۆمەڵگە گەرەنتی بکەن. ئەم هەوڵدانە وەك چیمەنتۆیە کە بە بێ ئەوە کۆمەڵگە ناتوانێت یەکبوونی خۆی بپارێزێت. دیسان ئەو هەوڵدانە لە دروست بوونی ئایدۆلۆژیای کۆمەلایەتی گرنگ لە هەر کەلتوورێکدا بەشداری هەیە.

هەنووکە ئەم بنەمایە سەبارەت بە تایبەتمەندییەکی کۆمەڵگە بە کار ببەین: پەیوەندی چینایەتی. هەر وەها کە دەزانین لە مێژوودا کەمینەیەك بە سەر زۆرینەی کۆمەڵگەدا حوکمیان کردوە. ئەم حکومەتە چینایەتییە، دەرئەنجامی فێڵ وزیرەکی نەبووە، بەڵکوو دەرئەنجامی پێویستی بارودۆخی گشتی ئابووری کۆمەڵگە وهێزە بەرهەمهێنەرەکانی بووە. بە شێوەیەك کە " نیکر"[1] نوسیویەتی :"بە گوێرەی یاسای موڵکداریەتی، چینی پرۆلە تەرمەحکومە لانی کەمی بەرهەمی کارەکەی خۆی وەربگرێت ". یان بە گوتەی لینگە "[2] تا ئاستێك وەك پلانگێڕییەك لە دژی مرۆوایەتی بوون بەلام نەیانتوانی هیچ بە هیچ بکەن."

بیرمەندانی" سەردەمی رووناك گەری"[3] ئەم پەیوەندییە گرێداراوەیان شرۆڤە کردوە ورەخنەیان لێگرتووە، بەڵام نەیانزانی کە ئەو گرێدراوییە بەرهەمی ئابوورییە. لە راستیدا دەسەلاتی کەمینە

[1] .Neker

[2] .Linguet

[3] Enlghtenmant

راستییەکی مێژووییە. بەڵام چە هۆکارێك بوەتە هۆی سەقامگیری ئەم پەیوەندیە گرێدراوییە؟

هەڵبەت، لە سەرەتادا کەڵك وەرگرتن لە هێزی جەستە ودەرفەتی بە کار هێنانی لە لایەن هەندێك لە گروپەکانەوە هۆکارێکی ئەو گرێدراوییە بوو، بەڵام هۆکارێکی گرنگی دیکەش بوونی هەبوو: گرێدانە لیبیدۆییەکان- دڵەراوکێ، خۆشەویستی، - متمانە- کە رۆحی زۆرینەی لە پەیوەندی لە گەڵ چینی دەسەڵاتدا پڕکردبوو. هەنووکە هەڵسوکەوتی دەروونی بەرهەمی ئارەزۆیان رووداو نییە، بەڵکوو نیشان دەری پێکەوە گونجانی لیبیدۆی خەڵك لە گەڵ هەلومەرجی داسەپاوی ژیان لە لایەن پێویستی ئابوورییە . تا کاتێك کە ئەم هەلومەرجە حکومەتی کەمینە بە سەر زۆرینەدا مسۆگەر دەکات، لیبیدۆ لە گەڵ بونیادی ئابووری هاو ئاهەنگ بووە و یەکێك لە هۆکارە کانی سەقامگیری پەیوەندی چینایەتییە.

زیاتر لە قەبووڵ کردنی **هەلومەرجی ئابووری،** بونیادی لیبیدۆیی، دەروونناسی کۆمەڵایەتی نابێ لە توێژینەوە سەبارەت بە بنەڕەتی دەروونی ئەم بونیادە کەمتەرخەم بێت. ونەتەنها هۆکاری پێویستی هەبوونی لیبیدۆیە بدۆزیتەوە، بەڵکوو دەبێ روونی بکاتەوە کە لە لایەنی دەروونناسی لیبیدۆ چە دەرفەتێك بوونی هەیە ولە رێگەی چە میکانیزمگەلێکەوە کار دەکات. هاوکات لە گەڵ گەڕان بە دوای ریشەی پەیوەندییە لیبیدۆییەکانی زۆرینە لە گەڵ کەمینەی دەسەلات، دەبێت دەروونناسی کۆمەڵایەتی پەی بەوە ببات کە بۆ چی

ئــەم پەیوەندییــە تیكــرار یــان بــەردەوامی شــێوازی دەروونــی منــداڵ سـەبارەت بـە دایـك وبـاوكی خـۆی، بـە تایبـەت بـە بـاوك، لـە بنەماڵـەی بورژوایـە[1]؟ ئێمـە لـە توانـایی و عـەقڵی باوكـدا تێكەڵاوییـەك لـە پێـدا هەڵدان، تـرس، بـاوەڕ، ومتمانـە دەبینین. بە كـورتی رەنگدانەوەیـەك لـە چۆنایەتییە ئاكارییە عەقڵییەكانی ئەوە كە بە شێوەی چالاك شەرتی كراوە. وهەر ئەم تایبەتمەندییە كە لە كەسانی پێگەیشتوی كۆمەڵگەی باوكسالاری لە هەمبەر ئەندامانی چینی دەسەڵاتدار بەرچاو دەكەون. لە پەیوەندی لە گەڵ ئەم چۆنایەتییانە، چەند بنەمایـەكی ئاكاری بوونی هەیـە كـە هـەژارەكان رازی دەكـات تـا ئـازار ورەنـج لـە كـاری خـراپ بـە چاكتر بزانن، وئەم بڕوایەیان تێدا پەروەردە دەكەن كە ئامانجی ژیانیـان فەرمانبەری لە دەسـەڵاتداران وڕاپەڕانـدنی ئەركەكانیانـە. تەنانـەت بڕوا ئاكارییـەش، كـە بـۆ سـەقامگیری كۆمـەڵگا پێویسـتە، بەرهـەمی هەنـدێك پەیوەنـدی سـۆزداری یـان كەسـانێكە كـە ئـەم نەریتانـە دروسـت دەكـەن ودەیانخەنە روو.

بە دڵنیاییەوە دروست بوونی ئەم نەریتانـە كـوت وپـڕ ولـە ناكـاو نـین. یـەكێك لـە بەشـە سـەرەكییەكانی ئورگـانی كـەلتووری لـە خزمـەتی دروسـتكردنی هەڵس وكـەوتی پێویسـتی كۆمەڵایـەتی بـە شـێوازێكی سیستەماتیك وموتۆدیكدایە. یەكێك لە ئەركە گرنگەكانی دەروونناسی

---

[1] دەبێ بە بیری بهێنمەوەكە پەیوەندی باوك ومنداڵ خۆی لە لایەن كۆمەڵگەوە شەرتی كراوە.

شـــرۆڤە کردنـــی کارەکـــانی تێکـــڕای سیســـتەمە پـــەروەردە وسیستەمەکانی( وەك سزادان)لەم پرۆسە دایە.[1]

ئێمـە سـرنجی خۆمانمـان لـە سـەر پەیوەنـدی لیبیـدۆیی نێـوان کەمینەی دەسـەڵاتدار وزۆرینەی بێ دەسەڵات چڕ کردوەتوە، چوونکە ئـەم هۆکـارە ناوەنــد وســەنتەری کۆمەڵایــەتی ودەروونــی هــەر کۆمەڵگەیــەکی چـینایەتییە. بــەڵام هەنـدێك پەیوەنـدی کۆمەڵایــەتی دیکـەشمان هەیـە کـە رەنگـی لیبیـدۆیان پێوەیـە. پەیوەنـدی نێـوان ئەندامانی چینێك خاوەن رەنگێکی دەروونـی جیاوازە لـە گـەڵ چینی ناوەڕاسـتی خوارەوەدا کە لـە چینی کرێکاردا بەر چاو ناکەوێت. یان پەیوەنـدی رێبـەری سیاسـی کـە رێگـەی چینەکەی خۆی یەوە دیـاری دەبێت ولە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی دایە، تەنانەت کاتێك دەسـەڵاتی چینەکەشـی بـە دەسـتەوەیە، لـە پەیوەندییەکەیـدا کـە ئـەو لـە پۆسـتی کەسـێکی بـە هێـزدا رووبـەرووی چـینی خـۆی دەبێتـەوەو وەك بـاوە گەورەیەك کە بە دەسەلاتی رەها حوکمیان بە سەردا دەکات، جیاوازە.[2]

---

[1] ئورگانی کەلتووری نەتەنها هێزە لیبیدۆییەکان( بە تایبەت پاڵنەرەکانی خۆشەویستی وپێش زاوزێیی) بۆ ئاراستەی کۆمەڵایەتی مەبەستی خۆیدا رێنوێنی دەکات، بەڵکوو دەبێتە هۆی لاواز بوونی هێزەکانی لیبیدۆ تا رادەیەك کە بۆ سەقامگیری کۆمەڵایەتی هەڕەشە لە قەڵەم نەدرێت. ئەم هەڵگەڕانەوەی هێزە لیبیدۆییەکان بۆ بەر لە زاوزێیی یەکێك لە خواستەکانی رەوشتی جنسی لە کۆمەڵگەدایە.

[2] فرۆید لە دەروونناسی جەماوەر وشرۆڤەی "خۆ" لە پەیوەندی لە گەڵ سەرۆکدا پشت بە هۆکاری لیبیدۆ دەبەستێت. بەڵام "رێبەر" و"جەماوەر" لە واتای ئینتیزاعی بە کار دەبات، و بارو دۆخـی هەسـتی ژینگـە لـە سـەر ئـەوان لـە بەرچـاو ناگرێـت. دەرئـەنجام بۆ پرۆسـە دەروونییـەکان لایـەنی گشـتی لـە بەرچـاو دەگرێـت کـە لـە گـەڵ راسـتیدا نایەتـەوە. بـە دەربڕینێکی دیکە ئەو پەیوەندییەکی تایبەت لە گەڵ سەرۆك دەگەڕێنێتەوە بۆ پەیوەندی گشتی. یـەکێکی دیکـە لـە پرسـەکانی دەروونناسـی کۆمەڵایـەتی، ئەمەیـە کـە پەیوەنـدی چینایەتی، شوێنی خۆی داوەتە پرسێکی دیکە:پەیوەندی دەسەڵاتدار وکۆمەڵانی خەڵك.

جـۆراو جـۆری پەیوەنـدی لیبیـدۆیی لـە گـەڵ جۆراوجـۆری فراوانـی پەیوەنـدی لـە نێـو کۆمەڵگـەدا هاوسـەنگە. لێـرەدا تەنانـەت نـاتوانین ئاماژەیەکی کورتیشی پێبکەین، چوونکە خۆی پێویستی بە وتارێکی جیاواز سەبارەت بە دەروونناسی شیکردنەوەیی کۆمەلایەتی هەیە. بە بیرتـانی دەهێنمـەوە کـە هـەر کۆمەڵگەیـەك خـاوەن بونیـادی لیبیـدۆی خۆیـەتی، تەنانـەت ئەگـەر بونیـادی کـەلتووری، سیاسـی، کۆمەلایـەتی وئـابووری تایبەتیشـی هـەبێت. ئـەم بونیـادە لیبیدۆییـە بەرهـەمی کاریگەری هەل‌ومەرجی کۆمەلایەتی– ئابووری لـە سـەر ورووژێنـەرەکانی مرۆڤە، هەروەها ئەم بونیادە هۆکاری گرنگی شەرتی کردنـی کامڵبوونی سـۆزداری لـە ئاسـتە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگـە ونـاوەڕۆکی سـەرخانی ئایدۆلۆژیکییـە. بونیادی کۆمەڵگەیـەك هۆکارێکە کە لـە رێگـەی ئەوەوە ئابووری کاریگەری خۆی لە سەر ئەزموونـە عـەقڵی وزەینییـەکانی مـرۆڤ دادەنێت.[1]

بەهـەمان شـێوە کـە بونیـادی ئـابووری وکۆمەلایـەتی جێگیر نییـە بونیادی لیبیدۆی کۆمەڵگاش، نەگۆڕو هـەتایی نامێنێتـەوە. بەلام مـادام کـە بونیـادی کۆمەلایـەتی لـە ئاسـتی هاوسـەنگ دا بێـت، بونیـادی لیبیـدۆیش تارادەیـەك جـێگیرە – بـە دەربڕینێکـی دیکـە بـە درێـژایی قۆنـاغی سەقامگیری لە کامڵ بوونی کۆمـەڵگا. بە گەشـە کردنـی نـاکۆکی ودەسـتدرێژییە بابەتییـەکانی نێـو کۆمەڵگـە، بـەخێرا بـوونی پرۆسـەی هەوڵـدان، لـە بونیـادی لیبیـدۆی کۆمەڵگەشـدا هەنـدێك گۆڕانکـاری دێتـە

---

بـەلام جێگـای سـرنجە کـە فرۆیـد لـەم نوسـراوەی خـۆدا، خواسـتی گشـتی دەروونناسـی بورژوازی کە دەیەوێت جەماوەر بێ کەڵك ومتمانە نیشان بدات، لە ەر چاو دەگرێت.

[1] ئـەوەی مـن لێـرەدا بـە" بونیـادی لیبیـدۆیی" کۆمەڵگـە نـاوزەدم کـردوە ،دەسـتەواژەی فرۆیدە. لە نوسینەکانی دیکەدا من دەستەواژەی، کاراکتـەری کۆمەلایەتیم بە کـار هێنـاوە، سەرەڕای گۆڕانکاری لە تیوری لیبیدۆ چەمکەکان نەگۆڕ دەگێنێنەوە. ١٩٧٠.

ئاراوە. روو لە كز بوونی پەیوەندییە نەرییتەكان كە پارێزگاری سەقامگیری كۆمەڵگایە دەبینین، لە شێوازە سۆزدارییە نەریتەكاندا گۆڕانكاری پێك دێت. هێزە لیبیدۆییەكان ئازاد دەبن تاكارێكی تازە دەست پێ بكەن ودەرئەنجام كاری خۆیان بگۆڕن. ئیدی لە خزمەتی پاراستنی كۆمەڵگەدا نین، بەڵكو لە دروست بوونی كۆمەڵگای تازەدا بە شداری دەكەن. ئیدە وەك "چیمەنتۆ" نین بەڵكو تایبەتمەندی "دینامیتیان" هەیە.

هەنووكە دەگەڕێینەوە بۆ ئەوپرسە كە سەرەتا باسمان لێوە كرد: واتە بەهەل‌ومەرجە بابەتییەكانی ژیان. بینیمان كە دەروونناسی شیكردنەوەی تاك كامڵ بوونی غەریزی بە دەرئەنجامی پێكەوە گونجانی چالاك وفەرمانبەری ئورگانی غەریزی لە گەڵ هەل‌ومەرجی راستە قینەی ژیان لە قەڵەم دەدات. لە لایەنی بنەماییەوە هەمان پەیوەندی نێوان بونیادی لیبیدۆیی كۆمەڵگا و هەل‌ومەرجی ئابووریش راستە. مرۆڤ كە لە بن گوشاری پاڵنەرە لیبیدۆییەكانی خۆیان دان، هەل‌ومەرجە ئابوورییەكان سەراوبن دەكەن . هەل‌ومەرجی ئابووری سەراوبن بوو دەبێتە هۆی دروست بوونی ئامانجگەلێكی تازەی لیبیدۆی كە دەبێ دابمركێن. خاڵی جیدی ئەمەیە كە تێكڕای ئەم گۆڕانكارییانە لە كۆتایی دا لە هەل‌ومەرجی ئابوورییەوە سەرچاوە دەگرن، پاڵنەر و پێداویستیەكان گۆڕانكارییان بە سەردا هاتووە وخۆیان لە گەڵ هەل‌ومەرجی ئابووری دەگونجێنن.

هەڵبەت دەروونناسی شیكردنەوەیی لە چوارچێوەی ماتریالیزمی مێژووییدا خاوەن پێگەیە وچاودێری پەیوەندییەكی نێوان

کۆمەڵگاوسروشت دەکات. هەرێمی پاڵنەرەکانی مرۆڤ، ورۆڵی چالاك وناچالاك کە ئەم پاڵنەرانە لە چوار چێوەی پرۆسەی کۆمەلایەتیدا لە ئەستۆی دەگرن. لەم روەوە دەروونناسی شیکردنەوەیی چاودێری هۆکارێك دەکات کە رۆڵی نابژیوانێکی جێدی لە نێوان بنەمای ئابووری ورێزبەندی ئایدولۆژیاکان دەگێرێت. کەواتە دەروون ناسی شیکردنەوەیی کۆمەلایەتی ئەو دەرفەتەمان بۆ دەرەخسێنێت کە بە باشی لە سەرخانی ئایدۆلۆژی بە گوێرەی ئەو پرۆسەیەی کە لە نێوان کۆمەڵگا وسروشتی مرۆڤدا بوونی هەیە تێبگەین.

هەنووکە دەتوانین بە ئاسانی زانیارییە بە دەست هاتوەکان لە توێژینەوەکەمان سەبارەت بە شێواز و کاری دەروونناسی شیکردنەوەی کۆمەلایەتی کورت بکەینەوە. شێوازەکە هەمان دەروونشیکاری کلاسیکی فرۆیدە کە لە دیاردە کۆمەلایەتییەکاندا بە کارهاتووە. ئەم شێوازە خواستە دەروونییە هاوبەش وگونجاوە کۆمەلایەتییەکان بە گوێرەی پرۆسەی پێکەوە گونجانی چالاك وناچالاکی وروژێنەرەکان لە گەڵ هەل‌ومەرجی ئابووری و کۆمەلایەتی ژیانی کۆمەڵگایە.

ئەرکی دەروون ناسی شیکردنەوەیی کۆمەلایەتی بە پلەی یەکەم شیکردنەوەی هەوڵدانە لیبیدوییەکانی کۆمەڵگایە، واتە وەسف کردنی بونیادی لیبیدۆی کۆمەڵگا، شوێنی دەرکەوتنی ئەم بونیادە و کارکەی لە پرۆسەی کۆمەلایەتی. کەواتە یەکێك لە توخمە گرنگەکانی ئەم کارە تیورییەکە نیشان دەدات چۆن ئایدۆلۆژیاکان لە دەرئەنجامی کاری بەرانبەری ئورگانی دەروونی و هەل‌ومەرجی ئابووری _ کۆمەلایەتی سەرهەڵدەدەن.

# ٩- دەروونشیکاری لە خزمەتی کاراکتەر ناسی وپەیوەندی لە گەڵ دەروونناسی کۆمەڵایەتی[١]

خاڵی دەستپێکی دەروونشیکاری لایەنە چارەسەرییەکەی بوو. پەشێوییە دەروونییەکان بە گوێرەی کونترۆڵ کردنی وزەی جینسی و گۆڕینی لە روانگەی خەسار ناسییەوە لە هەندێك لە نیشانەکانی نەخۆشیدا وەسف کرا، یان بەرگرییەك لە هەمبەر بیرکردنەوە لێوانلێو لە لیبیدۆکان لە قەڵەم دەدرا کە نەیدەتوانی بکەوێتە نێو هەستی وشیاری تاکەوە. بەردەوامبوونی لیبیدۆ بەرگری لە رێگەی سەرکوت کردنەوە دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشی، باڵی " ئاریادنی"[٢] لە

[١] ئەم وتارە یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٣٢ لە بەڵاکراوەی Zeitschrift fur sozial for schung Hischfeld لە چاپ دراوە

[٢] Ariadne ناوی کچێکە لە میتۆلۆژی یۆنان کە پەتێکی دا بە خۆشەویستەکەی Therseus کە یەکێك لە پاڵەوانەکانی یۆنان بو تا بەو پەتە بتوانێت لە تۆنێلە پێچ وپلۆچەکانی کریت هەڵبێت.و.

توێژینـــەوەیی شـــیکردنەوەیی ســـەرەتایی بـــوو. بـــارودۆخی کەســـانی نـــەخۆش- وزۆربـــەیان بـــە نیشـــانەکانی نەخۆشـــی جەســـتەیی- کـــە توێژینـــەوەی شـــیکردنەوەییان لـــە ســـەر دەکراپەیوەنـــدییان هەیـــە بـــەو بەردەوامییە کە لە سەرەوە باسمان کرد.

بـۆ ئـەوەی دەروونشـیکاری پـەڕەی سـەند وکـامڵ بـوو پرسـیارێکی دیکە بۆ لێکۆڵینەوە خرایـە روو: شـوێنی دەر کـەوتن وچـەمکی هەنـدێك لە تایبەتمەندییە دەروونییەکان کە لـە خـەڵکی تەندروسـت ونەخۆشـدا بەرچـاو دەکـــەوێت کوێیـــە وچـــییە؟ وەك توێژینـــەوە ســـەرەتاییەکان، لێکۆڵینــەوە لــە ســەر ئــەم پرسـیارەش دەیەویسـت لـە ریشـەی غـەریزە لیبیدۆییەکان پەردە هەڵماڵێت. بەلام هەنووکە بەردەوامییەکەی سەرەوە لە سەرکوت کردنەوە بۆ نیشـانەی نەخۆشـی بەردەوام نابێت، بەڵکوولـە بالابوونـــەوە[1] " یـــان ریزبەنـــدی پەرچـــەکرداری[2]" بـــۆ تایبەتمەنـــدی رەوشت[3] بەردەوام دەبێت. ئەم توێژینەوانە سودمەندبوونی خۆیانیان لە تێگەیشتنی ئێمە لە کەسانی نـەخۆش و تەندروسـت سـەلماندوە، لـەم رووەوە پرســـی توێژینـــەوە کـــراو لـــە دەروونناســـی کۆمەلایەتیـــدا گرنگییەکی زۆری پەیدا کردوە.

بناغـەی گشـتی کاراکتـەر ناسـی لـە رێگـای دەروونشـیکارییەوە ســـرنجدانە بـــە هەنـــدێك تایبەتمەنـــدی وەك بـــالابوون وریزبەنـــدی پەرچەکرداری و هەندێك پاڵنەری سێکسی لە واتایەکدا بە کار هاتووە کـە فرۆیـد پێـی داوە. ئـەم کۆپیکردنـە ژنتیکـە دیـاردەی دەروونـی لـە

---

[1] .Sublimation
[2] .Reaction formation
[3] . Character Trait

سەرچاوە لیبیدۆیی وئەزموونەکانی سەرەتای سەردەمی منداڵی بنەچەیەکی تایبەتی شیکردنەوەیە کە کاراکتەر ناسی لە ڕێگەی دەروونشیکارییەوە تێدا لە گەڵ تیوری خەمۆکی دەروونیدا هاوبەشە. بەڵام لە حاڵێکدا تایبەتمەندییەکانی خەمۆکی دەروونی( یان کاراکتەری دەروون خەمۆك ) دەرئەنجامی پێکەوە گونجانی نیوە وناچڵی غەریزەکان لە گەڵ ڕاستی کۆمەڵایەتییە، ئەگەر پاڵنەرە لیبیدۆییەکان لە گەڵ چۆنایەتی گونجاوی کۆمەڵایەتی وتارادەیەك بەردەوام حاڵەتەکەیان گۆڕانی بەسەر دا بێت دەتوانین لە کارەکتەرێك بدوێن کە تووشی خەمۆکی دەروونی نەبووە. لە هەر حاڵەتێکدا دیاری کردنی جیاوازی نێوان کەسی هاوسەنگ ودەروون خەمۆك( ناهاوسەنگ) بە تەواوەتی لە گۆڕاندایە، و بە پلەی یەکەم گرێدراوی ڕادەی کەم وکوڕی پێکەوە گونجانی کۆمەڵایەتییە.

پێویستە بە بیری بهێنینەوە کە فرۆید پرسی باڵابوونی بە پاڵنەرە جنسییەکانی" بەر لە زاوزێ [1]" گرێداوە. ئارەزۆ جنسییە دەمی، پاشی وسادیزمییەکان[2]. جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ڕیزبەندی پەرچەکرداری وباڵابوون ئەمەیە کە یەکەمینیان هەمیشە خۆڕاگری دەکات ولە بەر دەم پاڵنەری سەرکوتکراوکە هێزی لێوەر دەگیرێت

---

[1] .Pre- genital

[2] (Orel, Anal, Sadism ) لەم ڕووە وە دەتوانین ڕوانگەی فرۆید لە هەمبەر زانینی باڵابوون خراپ وهەڵە لێك بدەینەوە، بە هەمان شێوە لە Schler لە کێبەکەی خۆیدا ئاماژەی پێکردوە.

ڕێگره، بەڵام دوهەمینیان نوێنەری گۆڕانکارییەکی ڕاستە وخۆیە - " کانالیزە کردنی" پاڵنەرە غەریزییەکان.

یەکەم جار فرۆید لە کتێبی " سی وتار سەبارەت بە تیوری سێکسی " ئاماژەی بە ئارەزۆ پێش زاوزێییەکان کردوە. تیوری لەم بڕوایەوە دەست پێدەکات کە بەر لەوەی ئەندامی زاوزێ لە منداڵدا ڕۆڵی خۆی بە دەستەوە بگرێت، ناوچەکانی دەم وپاش-وەك ناوچەی وروژێنەری ئارەزۆ جنسییەکان-[1] سەنتەری هەندێك هەستی چێژبەخشن کە لە گەڵ ناوچەی ئەندامی زاوزێدا شیاوی بەراورد کردنە. لە سوڕی گەشە وکامڵبوونی منداڵدا، ئەم ناوچانەی وروژێنەری ئارەزۆ جنسییەکان بەشێك لە هێزی خۆیان دەدەنە ئەندامی زاوزێ ، بەڵام بەشێکی کەم لە شێوەی ڕەسەنی خۆی یان بە شێوەی بڵندکراو( بالابوو) وریزبەندی پەرچەکرداری لە ناخی "خۆ"دا دەهێڵێتەوە.

بە گوێرەی ئەم لێکۆڵینانە سەبارەت بە ئارەزۆ جنسییە بەر لە زاوزێ کان، فرۆید لە ساڵی ١٩٠٨وتارێکی کورتی بە ناوی "کاراکتەر وئارەزۆی سێکسی پاشی" بەڵاو کردەوە کە بوو بە بناغەی " کاراکتەرناسی لە ڕێگەی دەروونشیکارییەوە" . فرۆید لەم لێکۆڵینەوەوە دەست پێدەکات کە لە دەروونشیکاریدا بە بەر دەوامی ڕووبەڕوی کەسێك دەبێنەوە کە "خاوەن تێکەڵاوییەکی تایبەت لە کاراکتەرەکانە، هەندێك کاری جەستەیی وئەندامەکانی ئەم هۆکارە، شەیدای سەردەمی منداڵین".

---

[1].Erogenous Zones

لە کەسانێکدا کە هەستی چێژ وەرگرتن لە بەتاڵ کردنی ریخۆڵە لە سەردەمی منداڵی ئەواندا رۆڵێکی سەرکی هەبووە، فرۆید سێ تایبەتمەندی کاراکتەر دەبینێت: گوێڕایەڵی، رەزیلی وخۆپەرەستی. ئەو زۆر لە سەر هاوسەنگی پارە وپیسایی کە لە کەسانی دەروون خەمۆك، ئەفسانەکان، خورافات، خەیاڵ و چیرۆکی فریشتەکاندا دەبینرێت، جەخت دەکاتەوە. لە سەر بنەمای توێژینەوەی بنەڕەتی فرۆید هەندێك لە دامەزرێنەرانی دەروونشیکاری لە کاراکتەر ناسی لە رێگەی دەروونشیکارییەوە بەشداریان کردوە[1].

بەلام لە زۆربەی نوسینەکانی خۆیاندا خاڵێکیان روون نەکردوەتەوە، ئەم خاڵە بۆ تێگەیشتنی گەلێك پرس یارمەتیمان دەدات. مەبەستم جیاوازی نێوان ئامانجی جنسی وبابەتی جنسییە. یان جیاوازی نێوان" چێژی ئەندامی وپەیوەندی بابەتی[2]".

لە روانگەی فرۆیدەوە لە نێوان هەڵچوونە جنسییەکان وناوچەکانی پاڵنەری ئارەزۆ جنسییەکان پیوەندییەکی نزیك بوونی هەیە،[3] ئەو لەم

---

[1] نوسینە بەنرخەکەی Otto Fenichel بخوێنەوە

[2]. Orgon Pleasure And object relatoniship

[3] بە ئاسانی دەتوانین تێبگەین کە بۆچی فرۆید بۆ ناوچەی وروژێنەرەکانی ئارەزۆی جنسی رۆڵێکی ئەوەندە گرنگ دادەنێت. ئەم کارە نەتەنها دەرئەنجامی ئەزموونەکانی ئەوە، بەڵکوو لە گریمانە تیورییەکانی ئەو، کە روانگەیەکی میکانیکی ودەروونناسانەیان هەیە، سەرچاوە دەگرێت. ئەو گریمانانە کاریگەرییەکی جیدیان لە دروستبوونی دەروونشیکاریدا هەبوو. هەر باسێکی سودمەند سەبارەت بە تێزەکانی دەروونشیکاری بە رەخنەیەك لە رۆڵی سەرەکی پێدراو بە ناوچە وروژێنەرە جنسییەکانەوە دەست پێدەکات ئێمە لێرەدا رەخنە ناگرین، چوونکە ئامانجی ئێمە خستنەرووی دەستکەوتەکانی دەروونشیکارییە. بەلام بە هەر حاڵ ئەمە پرسێکی گرنگە.

بڕوایەدایە کە هەڵچوونە جنسییەکان بە وروژاندنی ئەم ناوچانە دەکەونە جوڵە. لە قۆناغی یەکەمی ژیان ناوچەی دەم وکارەکانی- مژین وقەپ گرتن- ناوەندی ئارەزۆی جنسییە. بەڵام دوای قۆناغی شیرخواردن ئەم ئارەزۆیە دەگوێزرێتەوە بۆ پاش وکارەکانی- بەتاڵ کردنی پیسایی یان راگرتنی پیسایی، ولە تەمەنی ٣-٥ساڵی بە دواوە ئەندامی زاوزێ گرنگی خۆی بە دەست دەهێنێت. فرۆید ئەم یەکەمین بزیسکەی ئارەزۆی جنسی زاوزێیە بە "قۆناغی فالیك [١]" ناو دەبات چوونکە لە روانگەی ئەوەوە لە لایەن هەردوو رەگەزەوە تەنها ئەندامی زاوزێ( یان بەشی دەرەوەی ئەندامی زاوزێی ژنانە[٢]) کە لەم قۆناغەدا خاوەن گرنگییە، وهاوتەریب لە گەڵ ئەوە دا خواستی هەڵچوون وویرانگەری. دوای سەردەمێکی "خۆشاردنەوە" کە بە زۆری تا سەردەمی پێگەیشتن درێژەی دەبێت، ئارەزۆی جنسی زاوزێیی، لە گەڵ پێگەیشتنی جەستەییدا کامڵ دەبێت وراکێشانە جنسییە بەر لە زاوزێکان شوێنی خۆی بۆ ئارەزۆی جنسی زاوزێیی چۆڵ دەکات.[٣]

دەبێ لە نێوان ئەم شەهوەتە جنسییە وپەیوەندی تاك لە گەڵ بابەتی مەبەستی ئەو جیاوازی دابنێن. دووهەمینیان خواستی تاك بەرەو خۆیان وکەسانی دیکەیە، بە دەربڕینێکی تر، هەست وسۆزەکان

---

[١].Phallic phase

[٢]. Clitoris

[٣] ئەم وتارەش وەك دوو وتارەکەی دیکە هی ساڵەکانی١٩٣٢و١٩٣٦ە ، کە لەم کتێبەدا هاتووە، لە روانگەی قەبووڵکردنی تیوری لیبیدۆیی فرۆیدەوە نوسراوە. لەم رووەوە لە گەڵ بۆچوونەکانی ئێستای من نایەتەوە. بەم حاڵەشەوە لە پارەگرافەکانی سەرەوەدا هەندێك رەخنە هاتووە کە بنەڕەتی پێداچوونەوەکانی منە لە تیوری کلاسیکدا.١٩٧٠.

وخواستەکان بەرەو جیهانی دەرەوە ئاراستە کراوان. ئەم پەیوەندییە بابەتییە، سوڕێکی کامڵ بوونی رێك وپێکیشی هەیە. لە روانگەی فرۆیدەوە منداڵی شیرە خۆرە شەیدای خۆیە( خۆپەرەستە) و تەنها لە دامرکاندنی پێداویستی وخواستەکانی خۆی دەگەرێت. لە سەرەتای سەردەمی شیرەخۆرییەوە قۆناغێکی دوهەم سەرهەڵدەدات کە تێدا خواستی سادیستیك و دوژمنکارانە لە هەمبەر شت وەك زیاد دەکات، هەر وەها ئەم خواستانە رۆڵێکی گرنگیان لە قۆناغی فالیکدا هەیە. تەنها بە فراوان بوونی ئارەزۆی جنسی زاوزێیی لە قۆناغی پێگەیشتندا خواستە ئەوینداری ودۆستانەکان دەکەونە پێش شت وئامانجەکانەوە.

ئەم پەیوەندییە بابەتییانە پەیوەندییەکی زۆر نزیکیان لە گەڵ ناوچەکانی وروژێنەری ئارەزۆی جنسی هەیە. کاتێك پەی بەم پەیوەندییە دەبرێت کە سرنج بدەینە ئەم راستییە کە پەیوەندییە بابەتییەکان سەرەتا لە پەیوەندی لە گەڵ ناوچەکانی وروژێنەری ئارەزۆ جنسیدا فراوان دەبن و کوت وپڕ ولە ناکاو نین. نامەوێت ئەم پرسیارە بخەمە روو کە ئایا نزیکی ئەم پەیوەندییە باس کراوە بە راستی بە هەمان رادەیە کە لە نوسراوە دەروونشیکارییەکاندا دەبینرێت، یان نا؟ هەر وەها نامەوێت لە سەر رادەی فراوان بوون وکامڵبوونی پەیوەندییە بابەتییەکان بدوێم. تەنها دەبێ لە سەر گرنگی نێوان چێژی ئەندامی وپەیوەندی بابەتی جەخت بکەمەوە.

لە قۆناغی سەرەتایی ژیاندا پاڵنەرە سەرەکی جنسی، وروژاندنی دەمییە. منداڵ لە مژین چێژێکی زۆر دەبینێت، دواتر ئەم چێژە لە قەپ

گرتن ،جووتن، وبە دەمدا بردنی شتو ئارەزۆی قووتدانیش بە دەست دیتن لێکۆڵینەوەی تازەتر نیشانی داوە کە ئەم کارانە قەت نیشانەی برسێتی نین، بەڵکوو چالاکییەکانی مژین، قەپ گرتن، وقووتدان خۆیان چێژبەخشن. دەتوانین لەم نیشانانە بە مژینی پەنجەی گەورەی دەست، جووتنی نینۆك، ماچ کردن وجگەرەکێشان ئاماژە بکەین.

بۆ ئەوەی وروژاندنی دەمی لە شێوە رەسەنەکەی خۆیدا نامێنێتەوە ویا خود هەندێك پاڵنەری دیکەی جنسی شوێنەکەی دەگرنەوە، لەم رووەوە ئەم وروژاندنە بە شێوەی بڵند بوون یان ریزبەندی پەرچەکرداری دەردەکەوێت. لێرەدا نموونەیەکی بەرچاوی ئەم بڵند بوونە دەهێنمەوە: گواستنەوەی چێژی مژین بۆ هەرێمی عەقڵ. زانست شوێنی شیری دایك دەگرێتەوە،( لە زمانی ئینگلیزیدا ) ئەم پەندەمان هەیە:" مژین لە مەمکی عەقڵ". ئەم هاوسەنگییە سەمبۆلیکەی خواردنەوە و وەرگرتن لە رێگەی عەقڵەوە لە زمان وچیرۆکی فریشتەکانی نێو کولتووری جۆراوجۆرەکان وخەون ، لە گەڕانەوەی نەخۆشەکانی دەروونشیکاریدا بەر چاو دەکەوێت. **ریزبەندی پەرچەکرداری** دەتوانێ بڵند نەبوو بمێنێتەوە( واتە بڵند نەبێت) وەك خۆدور گرتن لە خواردن، رێگرتن لە فێر بوون، کار کردن یان وردبینی.

پەیوەندییە بابەتییەکان کە لە قۆناغی سەرەتای ژیانی منداڵیدا دەردەکەون زۆر ئاڵۆزن. لە سەرەتادا منداڵ لە رادەبەدەر خۆپەرەستە.- ئەم توندییە لە ٣ مانگی سەرەتای ژیاندا زیاترە، وردە وردە میهرەبانیو خواستی دۆستانە سەبارەت بە شتەکان هاوتەریب لەگەڵ

خۆپەرستیدا پەرەدەسێنێت[1]. شێوازی منداڵ سەبارەت بەدایك (یان جێگری دایك) دۆستانەو دلۆڤانانە، منداڵ چاوەڕوانی خۆشەویستی وپشتیوانییە. دایك ژیانی ئەو گەرەنتی دەکاتو خۆشەویستی ئەو (دایك) هەستی بە ئاسایش دەخولقێنێت. بەدڵنیاییەوە دایك لەپێوانەیەکی فراواندا ئامرازی دامرکانی پێداویستییەکانی منداڵەو میهرەبانی منداڵ تێکەڵاوێکە لەداخوازیو وەرگرتن نەك پێدان. سەرەڕای ئەمەش ئامارژەکانی میهرەبانی منداڵو بایەخدانی بەشتەکانی دیکە لەقۆناغی سەرەتای ژیاندا گرنگن[2].

پەیوەندییە بابەتییەکانی منداڵ وردەوردە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. داخوازییەکانی هاوتەریب لەگەڵ گەشەی جەستەیی زیاد دەبێت. هەر بەم بۆنەیەوە بە بۆنەی هەندێك هۆکاری دیکەی ژینگەی، ئەو ڕۆژ بەرۆژ زیاتر لە نێو جیهانی دەوربەری خۆیدا ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە. منداڵ لەبەرامبەر ئەم شکستانە بەتوڕەییەوە پەرچەکردار نیشاندەدات و گەشەی جەستەیی ئەو هەل ومەرجێك دەخولقێنێت تا ئەم پەرچەکردانە ئاسان بکات. هاوتەریب و لەباتی هەڵوێستی دۆستانە سەبارەت بە شتەکانی دیکە، هەستی دوژمنکارانەی ڕوو لەزیادبوون دێتە ئاراوە. منداڵ کە خۆی بە هێزتر دەبینێت لەبەرامبەر شکستەکان

---

[1] لەنوسراوە دەروون شیکارییەکاندا پشت بە خواستی خۆپەرستی منداڵ بەستراوە، بەڵام بە شێوازی دۆستانەی ئەو بایەخ نەدراوە، لێرەدا ناکەومە نێو ئەم پرسە گرنگەوە تەنها بە هەبوونی ئەم نیشانەی هاوڕێیەتی لەگەڵ خواستی نەفرەتو سادیستك ئاماژە دەکەم.

[2] ئاشکرایە کە لەپرۆسەی کامڵبوونی مرۆڤدا دەتوانین لەزیادبوونو کەمبوونەوەی خواستە جۆراوجۆرەکان بدوێین، نەك گۆڕانکاری ڕێكوپێکی بونیادە جۆراوجۆرەکان.

تورە دەبێت و ئیدی بڕوا بە دامرکاندنی میهرەبانەی خواستەکانی خۆی ناکات، ئەو داخوازیانەی کە هێشتا چۆنایەتی زارەکییان (دەمی) هەیە. ئیدی چاوەڕوانی دامرکاندنێکی وەها ناکات، بەڵکو هەوڵدەدات ئەوەی لێی بێ بەشکراوە بە زۆر بەدەستی بهێنێتەوە. دەم و ددان دەبنە چەکی ئە وو خواستێکی توندوتیژئامێز پەیدا دەکاتو بە چاوی دوژمنایەتی سەیری شتەکان دەکات، دەیەوێت هێرش بکاتە سەریان و تێك وپێکیان بدات. ناکۆکیوپاڵنەرە سادیستکەکانی دەستدرێژی، شوێنی هاوئاهەنگی ڕێژەیی کە نیشاندەری پەیوەندی منداڵ لەگەڵ ژینگە بوو، دەگرێتەوە.

کەواتە کۆی ئەوەی لەسەرەوە باسکرا ئاماژەکانی هەڵسوکەوتی دەمی کەسانی پێگەیشتووە. لەلایەکەوە خواستی، متمانەو دۆستی لەگەڵ کەسانی دیکە، ئارەزووی میهرەبانی، خۆشەویستیو نازپەروەردەییو، لەلایەکی ترەوە هەڵچوونو توندوتیژی.

((ئابراهام)) هەڵوێستی جیاوازی لەکاراکتەر ناسی منداڵ بەدەستهێناوە. لە یەکەمین هەڵوێستدا دامرکاندنی دەمی منداڵ دابینکراوە و هیچ گیروگرفتێکی تێدا نەبووە. لەهەڵوێستی دووهەمدا ئەم دامرکاندنە تووشی گیروگرفت و شکست بووە. واتە لە شیر وەرگرتنی کتوپڕ، یان بەگوێرەی پەیوەندییە بابەتییەکان، تەنها میهرەبانی لەلایەن دایك یان جێگرەکەی. ئەوانەی کە بە هەڵوێستی یەکەمی منداڵی گرێدراون، بەزۆری لەو بڕوایەدان کە دەبێ هەمیشە هەلومەرج بەدڵیان بێت. هەمیشە بەگەشبینییەکی سەقامگیرەوە رووبەرووی ژیان دەبنەوە، ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی بگەنە ئامانجە

کردارییەکانی خۆیان. بەڵام بۆ ئەوانیش ئەگەری شکست بوونی هەیە. زۆربەی خەڵکی ئەم چینە دەیانەوێت رووبەرووی خەڵکی باش‌و میهرەبان ببنەوە، بەدەربڕینێکی دیکە جێگیرێك بۆ دایك، تا تێکڕای پێداویستییەکانی ژیان لەئەوەوە بەدەستبهێنین, ئەم گەشبینیی‌و ئومێدە دەبێتە هۆی ئەوەی کە چالاك نەبن. لەم چینەدا خەڵکێکی نازپەوەردە لەمنداڵیدا دەبینرێن، کە هەڵس‌وکەوتەکانیان نیشاندەدات دەیانەوێت هەمیشە لەسینگی دایك شت بخۆن‌و هەرگیز خۆیان هەوڵنادەن‌و، لەگەڵێك نموونەدا هەوڵدانی تایبەتی بەعەیب دەزانن.

لەخەڵکی چینی گرێدراوی هەڵوێستی یەکەم بەزۆری نیشانەی جوامێری‌و گەورەیی بەدیدەکرێت. ئامانج‌و ئیدەئاڵی ئەوان دایکە کە فیداکاریی دەکات‌و هەمیشە بەم ئامانجەوە دەژین.

ئەو کەسانەی کە گرێدراوی هەڵوێستی دووهەمن بە قووڵی گیرۆدەی پەشێوی زەینی دەبن. لەقۆناغەکانی دواتری ژیاندا نیشانەی دزی یان دادۆشینی خەڵکی دیکەیان تێدا دەبینرێت. ئەم گروپە خەڵکە هەمیشە ((دەمیان)) ئامادەیە تا هەرچییەکیان بینی هەڵیلووشن. ئەگەر کاراکتەری ئەوان سادیزمیشی تێدا بێت دەبنە ئاژەڵێك کە دەیەوێت نێچرەکەی پارچە پارچە بکات.

ئەوان هەمیشە لەهەڵس‌وکەوتی کۆمەڵایەتیدا داخوازی شت دەکەن، یان بەداواکاری یان بە زۆرەملی. شێوازی داواکردنیان حاڵەتی دۆشینی هەیە. راستی‌و نارەزایەتییەکان پەشیمانیان ناکاتەوە. بەپێچەوانەوە پێداگری خۆیان بەردەوام دەکەن. وەك گەنە بەکەسانی دیکەوە دەنوسێن. حەز لەتەنیایی ناکەن‌و بەرامبەری پەرچەکردار

نیشاندەدەن، هەرچەند تانیاییەکەیان بۆماوەیەکی کورتیش بێت. ناشوکریو بێ سەبری لەم گروپەدا ئاشکرایە. لەهەندێکیاندا ئەم تایبەتمەندیانە توندترە. هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵ خەڵك وەك هەڵس‌وکەوتی رۆح پیسەکانە[1](ارواح خبیثة).

ئەو خەڵکانەی کە لەگروپی یەکەمدا جیدەگرن، خەڵکی شەریف، شەرمن، قسە خۆش ، کۆمەلایەتیوخۆشحاڵن. هەڵس‌وکەوتی گروپی دووهەم دوژمنکارانەیە و تانە وتەشەری تێدایە. ئەگەر داخوازییەکانیان دابین نەبێت تورە دەبن و بەئەوانەی کە بارودۆخیان باشترە ئێرەیی دەبەن. راستییەکی دیکە کە لەلایەن ئابراهامەوە، بایەخی پێدراوە لەروانگەی کۆمەڵناسانەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە: ئەو کەسانەی کە خاوەن کاراکتەری دەمین، بۆ قبووڵکردنی بابەتی تازە ئامادەن، بەلام ئەوانەی کە کاراکتەری پاشییان هەیە محافیزەکارن و دژایەتی هەموو جۆرە داهێنانێك دەکەن.

**رۆڵیو وروژاندنی پاشی(کۆم)** دوای سەردەمی وروژاندنی دەمی دەستپێدەکات. لەهەمان سەرەتاوە بەتاڵکردنی ئازادانەی پیسایی جەستەی منداڵ لەگەڵ وروژندانی کۆمدایە. هەروەها پیسایی بەتاڵبوو- دەرکەوتنیان، بۆنەکەیان، بەرکەوتنی لەگەڵ سیفۆنی W.C و بەدەستەوەگرتنی. سەرچاوەی بەهێزی هەستپێکردنی چێژە. منداڵ شانازی بە پیسایی خۆی دەکات، ئەوە یەکەمین خاوەنداریێتیو یەکەمین نیشانەی بەرهەمهێنەربوونی ئەوە.

---

[1] لەنوسینی ئابرهام.

بەفێرکردنی چۆنیەتی بەکارهێنانی W.C کە پێویستی بە کاملبوون و کۆنترۆلی کاری میزلدانو، ماسولکە خڕەکانی شوێنی دانیشتن هەیە، گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەمنداڵدا پێکدێت. کە منداڵ خۆی لەگەڵ ناچارییە تازەکانی پەروەردە بگونجێنێت، و فێر بوو کە چۆن پیسایی خۆی رابگرێت و لەکاتی پێویستدا بەتاڵی بکات، راگرتنی پیسایی و پرۆسە فیزیۆلۆژیکییەکانی دەبنە سەرچاوەی تازەی چێژ. خۆشەویستی سەرەتایی منداڵ بۆ پیسایی شوێنی خۆی دەداتە نەفرەت، بەڵام هەست بە لەخۆبایی بوونی سەرەتایی بۆ پیسایی زیادیکردوەو دەبێتە شانازی سەبارەت بە بەتاڵکردن لەکاتی گونجاودا.

بەشێك پاڵنەرە پاشیەکانیش ( کۆمییەکان)، وەك پاڵنەرە دەمییەکان، تا سەردەمی پێگەیشتن دەمێنێتەوە. دەتوانین ئەم راستییە بەو پەرچەکردارە توندانەی کە زۆربەی خەڵك بەبێ حورمەتی یان گاڵتە سەبارەت بە (کۆم) نیشانی دەدەن، ببینین. کاریگەری ورووژێنەرە پاشییەکانی سەرەتا لە کەسانێك کە حەز لەپیسایی خۆیان دەکەنو لەکاتی هەر جۆرە پاساودانێکدا دەردەکەوێت دەبینرێن. بەڵام بەشێوەی ئاسایی بەشێکی سەرەکی لەئارەزووی جنسی پاشی لە گەڵ بڵندبوونو ریزبەندی پەرچەکرداری تێکەڵ دەبێت.

کاملبوونی جنسی ئارەزووی پاش منداڵ لەدوولایەندا بەرهەمدێت:

١. لەبەردەوامی کارە سەرەتاییەکان کە هەست بەخۆشی یان نەبوونی توانای راگرتن، کۆکردنەوە یان بەرهەمهێنانی لێدەکەوێتەوەو، یان گرنگتر لەوە جێبەجێکردنی دیسپیلین، کات ناسی ورەزیلی لێدەکەوێتەوە.

٢. لەبەردەوامی خۆشەویستی سەرەتایی بۆ پیسایی کە دەرکەوتنی خۆشەویستی موڵکداریێتییە. بەتایبەتی هەست بە ئەرك‌و بەرپرسیاریێتی لەم قۆناغەدا فراوان دەبێت.

پەیوەندی بابەتی گرێدراوی قۆناغی پاشی، لە ناکۆکی روو لە زیادبوون لە گەڵ جیهانی دەرەوەدا دیاری دەبێت. هەنووکە بۆ یەکەمین جار منداڵ لەرێگەی پێویستییەکانەوە رووبەرووی ژینگە دەبێتەوە، ئەو پێویستییانەی کە بەدەستخۆشی لێکردن یان سزادان ناچاردەبێت ئەنجامی بدات. کاتیك دایك داوای ئەنجامدانی کارێك لەمنداڵ دەکات، ئیدی ئەو بوونەوەرە باش‌و فیداکارە نییە کە خۆشی‌و متمانەی پێ دەبەخشێت. بەڵکو کەسێکە کە رێگردەبێت‌و سزا دەدات. منداڵ بەگوێرەی خواستی دایکی پەرچەکردار نیشان دەدات، بەڵام لەخۆپەرستبوونی خۆیدا پێداگری دەکات: کەمتەرخەمی. لەهەمان حاڵدا زیادبوونێکی ئاشکرا لەخۆپەرستی‌و سادیستکی دوژمنکارانە لەبەرامبەر کەسانی دیکە بەرچاو دەکەوێت. دیسان تورەیی منداڵ بەنیشانەی بەرگری لەدەستدرێژی بۆ هەرێمی ژیانی ئەو یەکێکی دیکەیە لەئاماژەکانی خۆپەرستی.

بالابوون‌و ریزبەندییە پەرچەکردارییەکانی وروژانە پاشییەکان‌و، بەردەوامبوونی پەیوەندییە بابەتییەکان کە لەم قۆناغەدا تێکەڵ بەیەکدەبن تا تایبەتمەندی کاراکتەرێك کە لە نوسراوە دەروونشیکارییەکاندا نیشانەی تەندروستبوون یان نەخۆش ئاسا وەسفکراوە، دروست بکەن. لێرەدا ئاماژە بە چەند نیشانەیەك دەکەم کە لەدەروونناسیدا گرنگن.

پێشتر یەکەمین دۆزینەوەکانی کاراکتەرناسی فرۆیدم باسکرد: خۆشویستنی دیسپلین کە جێبەجێکردنی یاسا تیورییەکانی لێدەکەوێتەوە، خەرجنەکردن کە لەرژدو تەماع نزیک دەبێتەوەو خۆپەرستی کە تا ئاستی بێ شەرمی پێشدەکەوێت. هەندێك لە دامەزرێنەرانی دەروونشیکاری، بەتایبەت جونز و ئابراهام، گەلێك تایبەتمەندی دیکەیان بەم نیشانانە زیاد کردووە. ئابراهام بە چەندین شێوازی قەرەبووکردنەوە و نەرمکردن و سەرپێچی سەرەتای ئاماژە دەکات:

((بەو قەرەبوو کردنانە پاراستنی یاخیگەرانەی خۆپەرستی دەشاردرێتەوە، بەلام هەندێك جار ئەم پەردەیە ل ادەچێت, بیر لە هەندێك لە منداڵان و کەسانی پێگەیشتوو دەکەمەوە کە چاکە، راستگۆیی، گوێڕایەڵییەکی تایبەت لەخۆیان نیشاندەدەن، بەڵام لەوپەڕی ئەم چۆنایەتییە باش‌و گونجاوانە، خرۆشان و یاخی بوون شاراوەیە، کە لە سەرەتای ژیاندا سەرکوتکرابوو))[1].

ئەم گروپە لە خەڵك شەیدای ئەوەن شانازی بە خۆ بکەن ووەك دیکتاتۆر هەڵس‌وکەوت بکەن و بەگوتەی ((سادجر)) لەوبڕوایەدان کە ((جگە لەمن کەس بەکەڵك نایەت))ماوەیەك لەو خاوەندارێتییە چێژ وەردەگرن کە کەسانی دیکە لەو شتانەیان نەبێت کە ئەوان هەیانە. ئەوان هەموو شتێکی ژیان بە چاوی موڵك و دارایی خۆیان سەیر دەکەن و هەموو شتێك لە دەستدرێژی دەرەکی کە پارێزراو و ((تایبەتییە))

---

[1] لەکتێبی ئابراهام.

دەپارێزن. ئەم شێوازە تەنها سەبارەت بە پارە و دارایی راست نییە، بەڵکو تاك، هەستەکان، بیرەوەری و ئەزموونەکانیش لەخۆدەگرێت. هێزی خواستی لیبیدۆیی شاراوە کە گرێدراوی خولقێنەری دارایی یان چوارچێوەیە دەتوانین بەرادەی ئەو تورەییە کە لە ئەنجامی دەستدرێژی بۆ ژیانی تایبەتی ئەوان (ئازادی) دەردەکەوێت. هەڵبسەنگێنین.

لەم بارەیەشەوە نیشانەیەك هەیە کە ئابراهام ئاماژەی پێکردووە:

هەستیاریی کەسی خاوەن کاراکتەری پاشی لەبەرامبەر هەر دەستدرێژییەکی دەرەکی: نابێ کەس ((دەست وەربداتە کارەکانیان)).

لەم پەیوەندییەدا، ئاماژەیەکی دیکە بوونی هەیە کە سەرنجی جۆنزی راکێشاوە: جێبەجێکردنی بەرنامەی خواردنی دەستکرد و سەپاندنی بەسەر کەسەکانی دیکەدا[1]. ئەم گروپە لەخەڵك لەبەرامبەر دارشتنی بەرنامەی راقی یان کاتی خۆشحاڵی نیشاندەدەن. گرنگترین بابەت (کە ئابراهام جەختی لەسەر دەکاتەوە) ئەمەیە کە خاوەن کاراکتەری پاشی بەشێوەیەکی ناوشیار کاری پاش وەك چالاکییەکی بەرهەمهێنەری گرنگ و باڵاتر لەکاری ئۆرگانیی زاوزێی لە قەڵەم دەدات.

---

[1] دایکێك بەزمانێکی وردو رێكوپێك بۆ کچەکەی دەنوسێت: بۆ نموونە بەرنامەی بەیانی بەم شێوەیەیە:

أ- هەستان لەجێگەی نوستن.

ب- رۆیشتن بۆ W.C.

ج- شوشتنی دەمو چاو..... هەندێك جار دێتەر بەر دەرگای ژووری کچەکەو پێی دەڵێ ((لەکوێی بەرنامەکەدایت، وا چاوەروان دەکات کچە بچوکەکە بڵێ ((بەشی نۆهەم یان پانزەهەم جێبەجێدەکەم)) بەم شێوەیە دایك زۆر بەتوندی جێبەجێکردنی بەرنامەی رۆژانەی کچەکەی کۆنترۆڵ دەکات)).

پارە پەیداکردن، سامان پێکەوەنان، کۆکردنەوەی زانیاری پارچەپارچە (هەر چەپکێك لەیالێك —وەرگێڕ—) بەبێ ئەوەی بۆ باشترکردنی بەرهەمهێنەر کاری پێبکرێت —تێکڕای ئەمانە نیشاندەری ئەو شێوازەیە—[1].

ئابراهام سەبارەت بە سامان پێکەوەنانی ئەم گروپە لەخەڵك دەڵێ:

(( لەهەندێك نموونەی ریزبەندی کاراکتەری پاشی بەزۆری تێکڕای پەیوەندییەکانی ژیان وەك دەست پێوەگرتن و بەخشین لەقەڵەم دەدرێت، واتە بەگوێرەی سامان. قسەی نەستەقی ئەوان ئەمەیە: ((کەسێك کە شتێکم دەداتێ دۆستی منەو ئەوەی شتێکم لێدەخوازێت دوژمنی منە)). پەیوەندی خۆشەویستی ئەوان لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەدا جیاوازییەکی ئەو تۆی نییە. لە کەسانی خاوەن کاراکتەری کۆمیدا پێداویستی و دامرکاندنی ئارەزووی سێکسی یان لە ئاستێکی بەرزدایە یاخود لە ئاستێکی نزم. رێژەکەی گرێدراوی بیانووی ئاکاری یان دڵەڕاوکێکانە. خۆشەویستی لەم جۆرە کەسانەدا شێوەیەکی تایبەتی هەیە. ژن خۆشەویست نییە بەڵکو ((داراییە)). هەستی سۆزدارییان

---

[1] ئەم گروپە لەخەڵك پارە بەخشین و هەدیە دانانیان پێخۆشە. گەلێك لەوانە رۆڵی خێرخواز دەگێڕن، بەڵام لیبیدۆی ئەوان کەم تا زۆرلە ئامانجەکانیان دوورە، لەم رووەوە کارەکەیان بەرهەمهێنەر نییە. بەدڵنیاییەوە ئەمانە بێ سەبرو توانانین — کە نیشانەی هاوبەشی کەسانی خاوەن کاراکتەری پاشییە— بەڵام لەکارە نا بەرهەمهێنەرەکاندا بەکاریدێنن. بۆ نموونە رەنگە بەپێداگری رێکخراوی نابەرهەمهێن دروست بکەن. ئەگەر لەئەنجامی رووداوێکی ناخۆشدا تێکڕای قازانجەکەیان لەناو بچێت بەو دیسپلینە دڵ خۆشدەبن کە لەنێو رێکخراوەکەدا دروستیان کردووە.

سەبارەت بە خۆشەویست وەك ئەو هەستەیە كە سەبارەت بە داراییەكانی دیكەی خۆیان هەیانە، واتە دەیانەوێت زیاتر خاوەنی كەسی خۆشەویستی خۆیان بن.

خواستی یەكەم (موڵكدارێتی تا ئەو پەڕی توانا) لەكەسێكدا بەرچاو دەكەوێت كە خاوەن توانای خۆشویستنی تەواوە (كامڵە). بەڵام خۆشەویستییەكەی جۆرێكی دیكە لەشەهوەت ورووژاندنە، یەكێك لەنەخۆشەكانی من ئەم خواستەی تێدا بوو. جانتایەكی هەبوو كە تێكڕای بیرەوەرییەكانی چاوپێكەوتنەكانی ژیانی تێدا دەپاراست. ژمارەشیان زۆر بوو: بەرنامەكانی شانۆ، بلیتی بەكارهاتوو، نامەو....هتد. خواستی دووهەم ((خاوەندارێتی لەئەوپەڕی ئاستی توانا)) لەكەسێكدا دەبینرێت كە زۆر (غیرەتییە)و چاوەڕوانی وەفادارییە.

لە گەڵ ئەم خواستەدا، ئەو كەسانەی كە خاوەن كاراكتەری پاشین زۆر حەسوودن، هێزی خۆیان بۆ چالاكی بەرهەمهێن بەكارناهێنن، بەڵكو بۆ حەسوودی بە كەسانی دیكە بەكاری دێنن و لەسەرووی هەموویانەوە حەسوودی بە دارایی خەڵك دەبەن. ئەم كاراكتەرە ئیمە بۆ یەكێكی دیكە لەتایبەتبەنمەندییەكانی دیكەی پاشی ڕێنوێنی دەكات كە لە ڕوانگەی كلینكیو كۆمەڵایەتییەوە زۆر گرنگە: پەیوەندی تایبەتی ئەوان لەگەڵ پارە، زیاتر لەوانە ڕەزیلی چاوچنۆكی. ئەم

**تایبەتمەندییە تایبەتە بە ئەزموونە دەروون شیکارییەکان کە سەلمێندراوەو لەکتێب و نوسراوەکای گرێدراوی ئەم بابەتەدا هاتووە[1].**

---

[1] لێرەدا هەندێك لەگوتەکانی ئابراهام دەهێنمەوە: لەهەندێك نموونەدا پەیوەندی نێوان ڕاگرتنی پیسایی و ڕەزیلی سیستەماتیك زۆر بەرچاوە. بانکدارییەکی دەوڵەمەند دەناسم کە هەمیشە منداڵەکانی ناچاردەکات تا دەتوانن پیسایی خۆیان ڕابگرن تا لەو خواردنەی کە خواردوویانە زیاتر بچێتە نێو جەستەیانەوە.

هەروەها ئەم خاڵە جێگای سەرنجە کە گەلێك لەو کەسانەی گیرۆدەی خەمۆکی دەروونین ڕەزیلی خۆیان بەجۆرێکی تایبەت لەخەرجکردن سنووردار دەکەنەوەو، لەنموونەکانی دیکەدا دەستکراوەن. بۆ نموونە هەندێك نەخۆش هەن کە پارە بۆ کاڵای نابەردەوام خەرج ناکەن. سەیری کۆنسێرت یان سەفرە پێویستی بەخەرجکردنی پارە هەیە بەڵام لەبەرانبەردا نابینە خاوەن شتێك. کەسێك دەناسم کە هەر بەم بۆنەیەوە نەدەچووە ئۆپرا بەڵام لەکڕینی شریتی مۆزیك درێخی نەدەکرد، چونکە شریت کاڵایەکی هەمیشەییە. هەندێك لەوانەی دەروون خەمۆکن لەخەرجکردنی پارە بۆ خۆراك خۆ دووردەگرن چونکە خواردن کاڵایەك نییە بمێنێتەوە. هەندێکی دیکە بە پێچەوانەوە بە ئاسانی بۆ خۆراك پارە خەرجدەکەن. ئەم کەسانە گرنگی بە پاراستنی جەستەو کێشی خۆیان دەدەن‌و حەزدەکەن بزانن لەوەی کە دەیخۆن چەندە وەك دارایی بۆیان دەمێنێتەوە. ئاشکرایە کە ئەمانە ناوەڕۆکی جەستە لەگەڵ پارەدا بەهاوسەنگ دەزانن.

لەهەندێك نموونەدا ڕەزیلی ئەم گروپە لەخەڵك تێکڕای شێوازەکانی ژیان لەخۆدەگرێت، بەشێوەیەك کە سەبارەت بە کەمترین ڕووبەڕوو بوونەوەی مادی نارەحەت‌و تورە دەبن. کەسێك دەناسم کە لەماڵدا دوگمەکانی پانتۆڵەکەی نەدەبەست تا شوێنی دوگمەکان کەمتر خراپ ببێت. دەتوانین بڵێین کە هەندێك پاڵنەری دیکەش بوونیان هەیە کە لەبن پەڕەی کاراکتەری پاشیدا شاردراونەتەوە.

لەگەڵێك نەخۆشیدا جۆرێکی تایبەت لە ڕەزیل بوونی هەیە: لەW.C دا زۆر دەسماڵ (کلینیکس) بەکارناهێنن. لەم نموونەیەدا هۆکاری سەرەکی خۆ دوورگرتنە لەپیسکردنی شتێکی پاك.

(٢)

ڕەزیلی و ڕەق تەنها بە پارە یان بەها پارەییەکان سنوردار نابێتەوە. کات و وزەش دەکەوێتە نێو ئەم شێوازەوە، ئەم کەسانە نایانەوێت بەفیڕۆی بدەن[1]. لەجێگای خۆیدایە ئەگەر بەبیرتان بهێنمەوە کە خواستە پاشییەکان بیانووهێنانەوەی زۆر لەخۆدەگرێت و هەڵبەت تێبینییە ئابوورییەکان لەپلەی یەکەمی گرنگیدایە.هەروەها هاوتەریب لەگەڵ حەزی زۆر بۆ پاکوخاوێنی، ڕەزیلی، دیسپلین و کاتناسی، بەجاران روبەروی دەرکەوتنی کتوپڕی تایبەتمەندی دژیش دەبینەوە کە بەڕیزبەندی پەرچەکرداری شاردراوەتەوە. بە بۆنەی گرێدراوی ئەم بابەتە لەگەڵ دەروونناسی کۆمەڵایەتی دەبێ بە پێداویستی تایبەتی کاراکتەری پاش بەنزیکی و (هاوسەنگی گونجاو) کە ئابراهم ئاماژەی پێکردووە، بایەخبدەین.

ئارەزووی **سێکسی زاوزێیی** لەبنەڕەتدا تایبەتمەندییەکی جیاوازی لەلایەن ریزبەندی کاراکتەر لەگەڵ ئارەزووە جنیسیە دەمی و پاشییەکان هەیە. لەحاڵێکدا لەئارەزووەکانی دوایی تەنها ڕێژەیەکی کەم لەشێوەی ڕەسەن و ڕاستەوخۆ دوای سەردەمی منداڵی دەمێنێتەوەو بەشی زۆری لەبڵندبوون و ریزبەندی پەرچەکرداری لەقۆناغەکانی دیکەی ژیاندا بەکاردێت. ئارەزووی جنسی زاوزێیی بەپلەی یەکەم لەرێگەی بەتاڵکردنی ڕاستەوخۆی جەستەییەوە کاردەکات. بەهەمان

[1] زۆربەی کەسانی دەروون خەمۆك بەتوندی نیگەرانیی بەفیڕۆچوونی کاتن. لەروانگەی ئەوانەوە تەنها کاتێك کە بۆ کارتەرخانکراوە بەنرخە. هەر وەستانێك لەکاردا پەرێشانیان دەکات. لەناچالاکبوون و سەیران بێزارن. فرنجی بەناوی ((دەروون خەمۆکەکانی یەك شەممە)) ناویان دەبات. ئەم نەخۆشانە لەکارە بچووکەکاندا کات بەفیڕۆ نادەن و لەکارە گرنگەکاندا بەفیڕۆی دەدەن.

ئەندازە کە وەسفکردنی ئامانجی جنسی ئارەزووی زاوزێی ئاسانە، پێناسەکردنی ئاماژەکانی کاراکتەری زاوزێیی دژوارە. بەدڵنیاییەوە ئەمە راستە کە پەیوەندی بابەتی گرێدراوی ئارەزووی جنسی زاوزێیی، هاوڕێیەتیو رزگاری رێژەییە لەدوو پێوەرە بوون. بەڵام نابێت لەبیرمان بچێت کە پەیوەندی جنسی ئاسایی لەلایەنی دەروونییەوە بەناچاری خواستی دەروونی خۆشەویستی بەیان ناکات. لەروانگەی دەروونناسییەوە ئەو پەیوەندییە رەنگە لەشێوەی خۆپەرستی یان سادیستێکدا تاقیبکرێتەوە.

لەلایەنی کاراکتەناسییەوە، لەریزبەندی بڵندبوونەکانی ئارەزووی جنسی زاوزێ، دروستبوونی ویستی یەکەمین ریزبەندی پەرچەکرداری گرنگە. سەبارەت بە بڵندبوونەکان لەو بڕوایەدام کە دەبێ لە نێوان ئارەزووە جنسییەکانی ژنو پیاودا جیاوازی دابنێین (بەڵام نابێ لە بیرمان بچێت کە هەموو کەسێك خاوەن هەردوو پاڵنەری نێرو مێیە)[1].

زانیاری ئێمە سەبارەت بە بڵندبوونی ئارەزووە جنسییەکانی ژنو پیاو زۆر کەمە. رەنگە پێشبینی بکەین کە ئاەزووی جنسی نێر زیاتر بەرەو هەوڵدانی فیکری دەڕواتو سەنتێرو ئارەزووەی جنسی مێ بەرەو وەك یەکی، پشتیوانی، بەرهەمهێنان، خۆشەویستی بێ مەرجی دایکانە ئاڕاستە دەبێت.

ئێمە بەکورتی بیلانچۆیەکمان لەتیۆری دەروون شیکاری سەبارەت بە فراوانبوونو کامڵبوونی ئارەزووی جنسیو پەیوەندییە بابەتییەکان

[1] (٣ وتار سەبارەت بە ئارەزووە جنسییەکان) لەنوسینی فرۆید بخوێنەوە.

نیشاندا. بەڵام ئەوەی خرایە روو کەموکورتو لەزۆر لایەنەوە گریمانەییە. توێژنەوەی شیکردنەوەیی زیاتر دەبیّ هەندێك خاڵی گرنگ چاك بکاتەوەو زانیاری زیاتریشی پیّ زیاد بکات. بەهەر حاڵ بیلانچۆی نیشاندراو خاڵێکی دەستپێکە وئەو دەرفەتەمان بۆ دەرەخسێنێت کە بنەڕەتی غەریزی تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری بناسینو لەچۆنیەتی **کامڵبوونی** کاراکتەر تێبگەین.

ئەم کامڵبوونە بە دوو هۆکار، مەرجی (شەرتی)کراوە کە هەر کامەیان لە ئاراستەیەکی جیاوازدا کاردەکەن. هۆکاری یەکەم پێگەیشتنی جنسی تاکە کە مەبەست لێی گەشەی ئارەزووی جنسی زاوزێییو کەمبوونەوەی رۆڵی فیزیۆلۆژیکی ئارەزووە دەمیو پاشییەکانە، هەروەها ئەم هۆکارە بەواتای پێگەیشتنی تێکڕای کەسایەتیو کەمبوونەوەی گرێدراویو دابینکردنی دەرفەتی کامڵبوونو فراوانبوونی هاوڕێیەتیو خۆشەویستیو میهرەبانی لەهەمبەر کەسانی دیکەیە. هۆکاری دووهەم کە لەپرۆسەی کامڵبووندا بەشدارە، هۆکاری دەرەکییە، کە تێکەڵاوێکە لەیاسا کۆمەڵایەتییەکان کە لەرێگەی پرۆسەی پەروەردەوە، کە پێویستی بە چەپاندنی ئارەزووی جنسی بەر لە زاوزێیی لەپێوانەیەکی بەربڵاودا هەیەو دەرئەنجام رێگای بەرەوپێشچوونی ئارەزووی جنسی زاوزێیی دەکاتەوەو کار دەکات.

بەڵام هەندێکجار بەرەوپێشچوونی ئارەزووی جنسی زاوزیّ کامڵ نییە، دەرئەنجام ئارەزووی جنسی بەر لەزاووزیّ بەهەمان شێوەی خۆیان بڵند بووو زۆر بەهێز دەمێنێتەوە. دوو هۆکار بۆ بەهێزبوونی

ئارەزووی جنسی بەر لەزاووزێ بوونی هەیە:١. جێگیربوون[١]:– بە بۆنەی دامرکاندن یان دوورخستنەوەی توند لەسەردەمی منداڵیدا، ئارەزووی بەر لەزاوزێ بەرامبەر پرۆسەی پێگەیشتن خۆڕاگری دەکات و هێزی خۆی دەپارێزێت. ٢. گەڕانەوە بۆ رابردوو[٢]:– دوای ئەوەی پرۆسەی ئاسایی کامڵبوون کۆتایی هات، هۆکارێکی بێ کاریگەرکەری ناوەکی یان دەرەکی تایبەت تاك لە خۆشەویستیو ئامادەیی زاوزێ بۆ قۆناغی بەر لە زاوزێ دەگەڕێنێتەوە. لەراستیدا جێگیربوون و گەڕانەوە بۆ رابردوو هاوکات و پێکەوەن. جێگیربوون نیشاندەری خواستێکە کە لەپێگە گونجاوەکاندا بەئاسانی دەبێتە هۆی گەڕانەوە.

بەسەرنجدان بەبنەڕەیی لیبیدۆیی تایبەتمەندییەکانی کاراکتەر، کاراکتەرناسی لە رێگای دەروون شیکارییەوە دەتوانێت ئێمە بۆ پەیبردن بەکاری دینامێکی ئەو تایبەتمەندیانە وەك هێزی بەرهەمهێنەری کۆمەڵگا یارمەتی بدات. لە لایەکی ترەوە ئەوان دەتوانن خاڵی دەستپێکی دەروونناسییەکی کۆمەڵایەتی بن کە نیشاندەدات چۆن تایبەتمەندییەکانی کاراکتەر کە لە زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگادا هاوبەشە، بە تایبەتمەندی کۆمەڵگا شەرتی (مەرجی) کراوە.

کاریگەری کۆمەڵگا کە دروستبوونی کاراکتەر بە پلەی یەکەم و لەرێگەی بنەماڵەوە جێبەجێ دەبێت. بنەماڵە ناوبژیوانی سەرەکی ئاڕاستە وەرگرتنی دەروونی منداڵ بەرەو کۆمەڵگایە. رێژە و چۆنایەتی

---

(١). Fixation

(٢). Regression

سەرکوتکردن یان توندبونەوەی راکێشانی بەر لەزاوزێی منداڵ و شێوازی وروژاندنی بڵندگەرایی یان ریزبەندی پەرچەکرداری لەبنەڕەتدا گرێدراوی پڕۆسەی پەروەردەیە. کە نیشاندەری بونیادی گشتی دەروونی کۆمەڵگایە.

دیسان کاریگەریی کۆمەڵگا لەدروستبوونی کاراکتەر بۆ ئەو پەڕی سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە. هەندێك: لەتایبەتمەندییەکانی کاراکتەر لەچوارچێوەی بونیادی چینایەتی یان کۆمەڵایەتی و ئابووری زۆر سوود بەخشن و لەپێشکەوتنی تاکدا رۆڵێکی گرنگیان هەیە. ئەم تایبەتمەندییانە خاوەن شتێکن کە ئێمە بەناوی ((پاداشتی کۆمەڵایەتی))[1] ناوی دەبەین. کاری ئەم پاداشتە پێکەوە گونجانی کاراکتەر لەگەڵ ئەوەی کە لەبونیادی کۆمەڵگادا بە ((ئاسایی و تەندروست))[2] ناوی دەبەین دابین دەکات. لەم رووەوە کامڵبوونی کاراکتەر پێکەوە گونجانی بونیادی لبییدۆیی لە گەڵ کۆمەڵگا لەخۆ دەگرێت. سەرەتا لەرێگەی بنەماڵەوەو دواتر لەرێگای رووبەڕوو بوونەوەی راستەوخۆ لە گەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی.

لێرەدا ئاکاری جنسی کۆمەڵگا رۆڵێکی زۆر بەرچاوی هەیە. بەهەمان شێوە کە گوتمان بەشی سەرەکی راکێشانە بەر لەزاوزێیەکانی

---

[1]. Social reward

[2] جیاوازی نێوان تایبەتمەندییە کاراکتەرییەکانی (تەندروست) (ئاسایی)و خەمۆکی دەروونی لەپێوانەیەکی بەربڵاودا لەرێگەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانەوە شەرتی دەبنەوە، دەبێت لەکۆمەڵگایەکی دیاریکراودا توێژینەوەیان لەسەر بکرێت: هەر بونیادی کاراکتەرێك کە لەگەڵ کۆمەڵگای خۆی نەگونجێت ((نەخۆشە)). کاراکتەری بازرگانەکانی سەرمایەداری سەدەی ١٩ لەروانگەی کۆمەڵگایەکی فیوداڵەوە نەخۆش بوو و بەپێچەوانەوە.

تاك شوێنی خۆی بۆ ئارەزووی جنسی زاوزێیی چۆڵدەکات. تا ئاستێك کە ڕەوشتی جنسی کۆمەڵگا دامرکاندنی جنسی سنوردار دەکاتەوە، دەبێ بۆ پاڵنەرە بەر لە زاوزێییەکان یان تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری ئەوانیش سنورێك بوونی هەبێت. ئەگەر لەسەر بەرگرتن لەدامرکاندنی زاوزێیی پێداگری بکرێت، لیبیدۆ بۆ دواوەو بۆ ناوچەی بەر لەزاوزێ دەگەڕێتەوە و لەژیانی کۆمەڵگا کاریگەری کاراکتەرە دەمی و پاشییەکان دەردەکەوێت.

بۆ ئەوەی تایبەتمەندییەکانی کاراکتەر گرێدراوی بونیادی لیبیدۆییە، لەم ڕووەوە بەشێوەیەکی ڕێژەیی سەقامگیر و جێگیر دەمێنێتەوە. ئەم تایبەتمەندییانە خۆیان لەگەڵ بونیادی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەگونجێنن بەڵام هاوتەریب لە گەڵ گۆڕانکارییەکان ون نابن. بونیادی لیبیدۆیی کە تایبەتمەندییە کاراکتەرییەکان لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، چەندین پێوەری هەیە، گۆڕانکاری لە بونیادی لیبیدۆیی و تایبەتمەندییە کاراکتەرییەکانی گرێدراوی، پێویستی بە پێکەوە گونجانێکی درێژخایەن لەگەڵ هەل و مەرجی ئابووری تازە هەیە. هەر بەم بۆنەیەوە سەرخانی ئایدۆلۆژیکی کە لەسەر تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری کۆمەڵگا دامەزراوە هێدیتر لەسەر خانی ئابووری گۆڕانکاری بەسەردا دێت.

لێرەدا هەوڵدەدەم دۆزینەوەکانی کاراکتەرناسی لەرێگای دەروون شیکارییەوە لەپرسێکی کۆمەڵایەتی بابەتیدا بەکاربهێنم. بابەتەکانی من تەنها بە مەبەستی نیشاندانی رێگایەکی هەڵەیە کە گیراوەتە بەر، نەك وەڵامێکی جدی و مسۆگەر بۆ پرسێك کە بۆ یەکەمین جار دەخرێتە ڕوو.

پرسی رۆح[1] –یان بنەمای دەروونی– سەرمایەداری بە دوو هۆکار نموونەیەکی گەنجاوە. هۆکاری یەکەم ئەوەیە کە کاراکتەرناسی لەرێگای دەروونشکارییەوە بۆ پەیبردن بە رۆحی بۆرژوازی – تیوری کاراکتەری پاشی– کامڵترین شێوازە. دووهەم، گەلێك نوسراوی کۆمەڵناسی کە نیشاندەری روانگەیەکی تازەن لەبەردەستدایە.

مەبەستی من لەرۆحی سەرمایەداری (یان کۆمەڵگای بۆرژوازی) چییە؟ مەبەستم کۆمەڵێك تایبەتمەندی کاراکتەرێکە کە تایبەت بە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایەیە– جەختکردنەوە لەسەر کاری دینامیکی کاراکتەر. من لێرەدا وشەی ((کاراکتەر)) لەواتایەکی بەربڵاودا بەکاردەهێنم و، لەسیستەمی ئابووری بۆ پێناسە ((سومبارت)) لە((رۆح)) کەڵك وەردەگرم. ئەو بەم شێوەیە رۆح پێناسە دەکات: ((کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی دەروونییە کە چالاکی ئابووریشی تێدایە. تێکڕای نیشانەکانی ژیانی فیکریو تێکڕای تایبەتمەندییەکانی کاراکتەرێك کە هەڵسوکەوتی ئەو خەڵکەی کە لەچالاکی ئابووریدا بەشدارن، لەخۆدەگرێت و ئەو چالاکییانە رێكوپێك دەکات)).

بەڵام ئەو مەبەستەی کە من لەرۆحی کۆمەڵگا یان چین هەمە پێناسەکەی بۆ سەرەوەی پێناسەی رۆحی چالاکی ئابووری فراوان دەبێتو تایبەتمەندییە دەروونییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا لەخۆدەگرێت. دیسان بەپێچەوانەی سومبارت من سەرەتا بایەخ بە "بنەما"و "حوکمە بەهاییەکان" نادەم، بەڵکو ئەو کاراکتەرە پلەی یەکەمی گرنگی لای من هەیە کە سەرچاوەی ئەم دوانەیە.

---

[1]. Spirit

ئێمە بەپرسی پەیوەندی نێوان رۆحی بۆرژوازی و پرۆتستانیزمەو ئایینزای پرۆتستان سەرقاڵ نابین. ئەم پرسە ئەوەندە ئاڵۆزە كە تەنانەت چاوپێداخشاندێكی خێرا لە بابەتەكە دوورمان دەخاتەوە. هەر بەم بۆنەیەوە بەدوای دۆزینەوەی ریشە (ئابوورییەكانی) كۆمەڵگای سەرمایەداریدا ناگەڕێم. ئەم بڕیارەی ئێمە لە روانگەی میتۆدیكەوە رێگەی پێدراوە، چونكە لێرەدا تەنها دەمانەوێت كاراكتەری تایبەتی كۆمەڵگا شیبكەینەوە و ئەم پرسە لێكدەدەینەوە كە چۆن ئەم كاراكتەرە نیشانەی بونیادی لیبیدۆیی تایبەتی- هێزێكی بەرهەمهێنەرە كە لەكامڵبوونی كۆمەڵگادا بەشدارە. توێژینەوەیەكی تەواوی كۆمەڵناسی- دەروونناسی دەبێ بەكەڵك وەرگرتن لە راستییە ئابوورییەكانەوە دەستپێبكات و نیشانی بدات كە چۆن بونیادی لیبیدۆیی خۆی لەگەڵ ئەم راستییانەدا دەگونجێنێت.

دیسان لەپرسێكی ئاڵۆزی دیكە كە بابەتی چییەتی مێژووییە چاو پۆشی دەكەم: واتە لە چ شوێنێك لەمێژووەوە دەتوانین سەبارەت بە رۆحی سەرمایەداریو بۆرژوا- سەرمایەداری قسە بكەین. ئێمە بەم گریمانەیە دەست پێدەكەین كە رۆحێكی وەها بوونی هەیە و تایبەتمەندیەكی جێگیر و یەك چەشنی هەیە- ئەگەرچی لەسەدەی (١٥) لە فلۆرانس بێت (بەگوێرەی گوتەی سومبارت) یان لەسەدەی (١٧) لەبەریتانیا بەگوێرەی قسەی دفۆ، بنیامین فرانكلین یان ئەندریۆ كاریینج و یان بازرگانەكانی سەدەی (١٩).

دەتوانین چییەتی تایبەتی رۆحی بۆرژوا- سەرمایەداری، بەئاسانی لەهەل‌ومەرجی نێگەتیڤ‌و دژ، بەسەرنجدان بە رۆحی سەردەمی بەر

لەسەرمایەداری (بۆ نموونە چاخەکانی ناوەڕاست) کە هەنووکە ناوچووە، وەسف بکەین. بەهرەمەندی لەشادیو چێژ لەژیان ئیدی ئامانجێکی مسۆگەری بۆرژوازی نییەو، ئیدی مەبەستێك بوونی نییە کە چالاکییەکانی دژ، بە تایبەت ئابووری، خزمەتی پێبکات. ئەم نموونەیە لەگفتوگۆ سەبارەت بە خۆشگوزەرانیو رابواردنەکانی چینی فیودالْ، ئەو بەختەوەریو خێروبێرەی کە کڵێسا بەشوێنکەوتوانی بەڵێنی داوە، یان چێژێك کە لەفیستیڤاڵە پڕ خەرجەکان، شێوەکارییە جوانەکان، کۆشکە رازاوەکانو رۆژانی جەژنو شادی هەستی پێ دەکرێت، راستە. ئاشکرایە کە مرۆڤ مافێکی زاتیی بۆ شادی، بەختەوەریو خۆشگوزەرانی هەیەو، ئەم مافە ئامانجی گونجاو دروستی چالاکی مرۆڤ لەقەڵەم دەدرێت، چ ئابووری بن چ نەبن.

رۆحی بۆرژوازی گۆڕانکارییەکی جدی لەم چۆنایەتییەدا دروستکرد: ئیدی شادیو بەختەوەری ئامانجی بێ قەیدو مەرجی ژیان نەبوو و بەهایەکی دیکە شوێنەکەی پڕکردەوە: ئەرك. "کراوس"[1] ئەم کارە بەیەکێك لەجیاوازییە دیارییەکانی نێوان خواستی سکولاستیك و کالڤینیزم[2] دەزانێ. ((ئەوەی کاری کالڤین لە سەردەمی سکۆلاستیك جیادەکاتەوە، هەڵگرتنی شێوازێکە کە بەگوێرەی ئەوە راستەوخۆ بەرو ئامانج دەڕۆیو دیسان جەختکردنەوە لەسەر فەرمانبەری ئاشکرا لەپێویستییەکانی ژیان ئامرازی ئەو بوو. ئیدی خودی ئەو کارەی کە

---

[1]. Kraws

[2] سکۆلاستیك بەواتای رێبازو قوتابخانەیەکە کە گرێدراوی مامۆستاکانی چاخەکانی ناوەڕاست یان لۆژیکی ئەوانە. و.

ئەنجام دەدرا گرنگ نەبوو. دیسپلینی ئاسنین پێویست بوو تا کار بەگوێرەی هەستی قووڵی فەرمانبەریو ئەرك بێت)). کراوس سەرەڕای ناکۆکی زۆری لەگەڵ ((ماکس ڤیبر)) لەم خاڵەدا لەگەڵ ئەو هاوڕایە: ((ڤێبر بە دڵنیاییەوە لەم گوتەیەی خۆدا کە لەکڵێسای سەرەتاییو چاخەکانی ناوەڕاستدا هەرگیز ئەم بڕوایە پەیدا نەبووبوو کە راپەڕاندنی ئەرك لەکارو پیشەی دونیاییدا بەرزترین شێوەی خۆڕێکخەری ئاکارییە، راستگۆبوو)). ئەرك (لە باتی شادیو بەختەوەری) وەك بەرزترین بەها لەکالڤینیزمەوە بۆ تێکڕای هەرێمی بیری بۆرژواری بڵاوبوویەوە- لەزانستی خواناسی یان لۆژیك.

ئیدی گۆڕانکاری کاتێك روودەدات کە ئەرك وەك سەنتەرو ناوەند لەقەڵەم بدرێت. ئیدی ئامانجی خەڵك لەچالاکییە ئابوورییەکان بەدەستهێنانی بژێوی ژیانی گونجاوی نەریتی نەبوو، بەڵکو موڵکدارێتیو کۆکردنەوە بووبوە نەریتێکی ئاکاری، بەبێ سەرنجدان بەوەی کە ئایا لەم داراییە کەڵك وەردەگیرێت یان نا؟ جگە لە باسکردنیچەند نمونەیەکی دیکە، شیکردنەوەیەکی دیکە بەپێویست نازانم.

سومبارت ((دەفتەری حساباتی)) بنەماڵەی ئالبرتی وەك نموونەیەکی هەژێنەر لەبەهایەك کە بەکۆکردنەوە و کەم خەرجکردن درابووناوزەد دەکات. چەند دێڕێك لەو دەفتەرە دەهێنمەوە: لەزۆر خەرجکردن خۆ دوور بگرە بەهەمان شێوە لەتاعون خۆ دوور دەگریت.

خەرجکردنێك کە پێویستییەکی رەهای نەبێت، شێتیەتییە.

هەرچەندە کەم خەرجکردن‌و خەرج نەکردن شتێکی باشە، خەرجکردنی بێهودە، ناشیرین، نەفرەتبارە.

خەرجنەکردن زیان بە کەس ناگەیەنێت‌و یارمەتی بنەماڵە دەدات.

عەقڵ موچەی بەرەکەتە.

ئایا دەزانن زیاتر چ کەسانێکم خۆشدەوێت؟ ئەو کەسانەی کە تەنها بۆ پێویستی رەها خەرجدەکەن‌و پاشماوەکەی پاشەکەوت دەکەن، من ئەوانە بەکەسانێك دەزانم کە خاوەن عەقڵی مووچەن.

ئالبرتی هەروەها خەرجنەکردنی وزەی تاکیش دووپات دەکاتەوە: ((لەبەکارهێنانی سێ شت کە هی ئێمەیە دەبێ وردبینبین: ١- رۆحمان. ٢- جەستەمان. ٣- لەهەمووی گرنگتر کاتمان.))

((بەمەبەستی خۆ دوورگرتن لەبەفیڕۆدانی کاتی بەنرخ ئەم یاسایەی خوارەوە جێبەجێدەکەین: هەرگیز تەسلیمی تەمبەڵی نابین، تا ماندوویی هیلاکم نەکات ناخەوم... لەم رووەوە بەدانانی هەندێك ئەرك بۆ خۆم خۆم لەتەمبەڵی‌و خەو رزگار دەکەم. کە لەجێگەی نوستن دەرکەوتم بەرنامەی کاتی کارە پێویستەکانی رۆژ دادەڕێژم. بۆ هەر کارێك کاتێك تەرخاندەکەم‌و بۆ بەیانی‌و عەسرو شەو بەرنامە دادەڕێژم. بەم شێوەیە بەبێ هیچ گرفتێك کارەکانم رێك‌وپێکە. شەو بەر لەنوستن، ئەوەی بەدرێژایی رۆژ ئەنجاممداوە لەزەیندا دووبارەی دەکەمە. ئامادەم خەو لەخۆم حەرام بکەم بەلام کاتم بەفیڕو نەدەم)).

هەر ئەم رۆحی ئاکاری ((پیورتین))[1]، قسە نەستەقەکانی بنیامین فرانکلین‌و هەڵس‌وکەوتی شارنشینەکانی سەدەی نۆزدەیەمیشی پڕکردووە.

لەگەڵ ئەم خواستی موڵکدارێتییە، تایبەتمەندییەکی دیکەش لەرۆحی بۆرژوازییدا بوونی هەیە: گرنگی گرێدراوی بەناوچەی تایبەتی. بە چاوپۆشی لەناوەڕۆکەکەی کە رەنگە ماددی یان مەعنەوی بێت نارچەی تایبەت شتێکی پیرۆزە، هەر جۆرە دەستدرێژییەك بۆ سەر ئەم ناوچەیە تاوان‌و بێ حورمەتییەکی گەورەیە (پەرچەکردارە کاریگەرە بەهێزەکان لەهەمبەر سۆسیالیزم، تەنانەت لەلایەن ئەو کەسانەشەوە کە هیچیان نییە، دەتوانی لەپێوەرێکی فراواندا ئەم راستییە جێبەجێ بکات کە سوسیالیزم هەڕەشەیە بۆ سەر ناوچەی تایبەتی).

چ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ کەسانی دیکە لەتایبەتمەندییەکانی ((رۆحی)) سەرمایەداری بۆرژوایە؟ سنوورداركردنەوەی توندی چێژی جنسی کە ئاکاری جنسی بۆرژوای داسەپاند. ئاکاری کاسۆلیکیش لەگەڵ چێژێکی وەهادا نییە، بەڵام بێگومان لەکرداردا هەڵس‌وکەوتی جیهانی بۆرژوا- پرۆتستان بەتەواوەتی لەگەڵ ئاکاری دونیای بەر لەبۆرژوازیدا جیاوازە. بەڵگەکانی پیاوێك وەك بنیامین فرانکلین نە تەنها رەنگدانەوەی

---

[1] Puritan باڵێکی ئاینزای پرۆتستانە.

نەریتێکی ئاکاری، بەڵکو ڕەنگدانەوەی کرداری بۆرژوازیشە. ئەو لەپێناسەکەی خۆی سەبارەت بە بالأبوون، داوێن پاکیو پاكوخاوێنی وەها دەڵێ: ((تەنها بەمەبەستی تەندروستیو زاوزێ لەچێژی جنسی خۆتان دووربگرن. لەکارێکی جنسی کە لاوازی خۆتی لێبکەوێتەوە یان ئاسایشو ئۆقرەیی هەر کەسێکی دیکە تێکبدات خۆ دوور بگرن))[١].

بێ قەدرو قیمەتکردنی چێژی جنسی بە تجسد (جەستەیی کردن) گرێدراوی تێکڕای پەیوەندییە مرۆییەکانی کۆمەڵگە بۆرژوازییە. بەتایبەت پەیوەندی خۆشەویستی کە ملکەچی تێبینییە ئابوورییەکان بوو. لەگەڵ ئەم جەستەییکردنەدا، کەمتەرخەمی بۆ چارەنووسی هاوڕەگەز بووبەیەکێك لەتایبەتمەندییەکانی پەیوەندی لەجیهانی بۆرژوازیدا. هەڵبەت مەبەست ئەمە نییە کە لەسەردەمی سەرمایەداریدا کەمتەرخەمیێکی وەها بوونی نەبووە یان توندوتیژنەبوو. خاڵەکە لێرەدایە کە کەمتەرخەمی بۆرژوازی تایبەتمەندی تایبەتی خۆی هەیە: لەم ڕێبازەدا بەرپرسیارێتی سەبارەت بە چارەنووسی کەسانی دیکەو تۆزقاڵێك خۆشەویستی بێ مەرج بەرچاوناکەوێت[٢].

---

[١] بنیامین فرانکلین– ئوتوبیوگرافی.

[٢] فرانکلین ئەم کارە باشوبالأیانە گرنگتر لە قەڵەم دەدات: کەم گوتن، دیسپلین، ڕیزبەندی، کۆڵنەدان، عەقڵی مووچە، سەبر، گەرموگوڕی، بێ کینەیی، بێ لایەنی، سەقامگیربوون، داوین پاکیو خاکی بوون. بەشێوەیەك کە دەبینن یارمەتی، خۆشەویستیو میهرەبانی باسی لێوە نەکراوە.

((دەفۆ)) پێناسەیەکی کلاسیکی لەم کەمتەرخەمی بۆرژوازییە هەیە، ئەو هەژاران بە جەماوەرێکی هاوارکەر دەزانێت کە قەت کارێکی باش ئەنجام نادەن‌و بارێکی نەگونجاون لەسەر شانی کۆمەڵگا، یاسایەکی تایبەتیان پێویستە. هەروەها کە دەبینن سەرمایەداری ئەم ئایدۆلۆژیایەی جێبەجێکرد، بەتایبەت لەسەدەی (١٨-١٩)دا. تەنانەت تا ساڵی ١٩١١ تراستی توتونی ئەمریکا بە هەبوونی هەمان شێوزا تاوانبار دەکرا. بەگوتەی سومبارت: ((لەهەرێمی رکەبەرایەتیدا مرۆڤ بێ بەزەییانە بەلاوەنرا بوو)). ژیانی زۆربەی رێبەرانی پیشەسازی ئەمریکا بەڵگەی ئەم لافەن.

لەهەستی بۆرژوادا ئەم نەبوونی گشتیی دڵسۆزی‌و بەزەییە، قەت بەشتێکی بەدرەوشتی لەقەڵەم نەدەدرا. بەپێچەوانەوە، ئەم کارە تەنانەت پشتی بە چەمکە ئاینییەکان دەبەست. لەباتی بەختەوەری گەرەنتی کراو بۆ ئەو کەسانەی کە منداڵانی باوەڕمەندی کڵێسا بوون، لەروانگەی بۆرژوازییەوە شادومانیی پاداشتی راپەڕاندنی ئەرك لەقەڵەم دەدراو، ئەم تیۆرییە کە لەسیستەمی سەرمایەداریدا سەرکەوتن سنوور ناناسێت، بیروبڕوای ناو هاتووی بەهێز دەکرد.

ئەم بەتاڵبوونەی بۆرژوازی لەبەزەیی، نیشاندەری پێکەوە گونجانێکی پێویست لەگەڵ بونیادی ئابووری سیستەمی سەرمایەداری بوو. بنەچەی کێبەرکێی ئازادو بیروبڕوای پێویست بەوە سەبارەت بە مانەوەی گونجاوتر پێویستی بە کەسانێك بوو کە لەکاروکاسبی

خۆیاندا پابەندی بەزەیی‌و هاوڕەگەز دۆستی نەبن، هەرچەندە بەزەیی کەمتر بێت سەرکەوتن زیاترە.

لەکۆتاییدا دەبێ ئاماژە بە تایبەتمەندیەکی دیکەش بکەم کە گەلێك نووسەر لەسەر گرنگی ئەوە جەختیان کردۆتەوە: ئاوڕدانەوە لەخۆ، بنەچەی حەسابگەری‌و ئامانج گەری. لەڕوانگەی منەوە ئەم عەقڵگەرایی بۆرژوازییە، کە هیچ پەیوەندییەکی بەشێوەکانی دیکەی چالاکی عەقڵییەوە نییە، لەگەڵ چەمکی دەروونی دیسپلین کە پێشتر شرۆڤەمانکرد پەیوەندی هەیە.

ئۆتۆبیۆگرافی فرانکلین کە گەلێك نموونەی کاملی لەم ((دیسپلینی‌و عەقڵگەراییە))ی بۆرژوازی تێدایە[1].

---

[1] نموونەیەکی بەرچاو لەم دیسپلینە بەرنامەی رۆژانە فرانکلینە کە لەئۆتۆبیۆگرافییەکەیدا هاتووە: دیسپلین وا دەخوازێت کە هەر بەشێك لەچالاکی من کات‌و شوێنی گونجاوی خۆی هەبێت. لەم رووەوە ئەم بەرنامەیەی خوارەوەم بۆ سەرانسەری رۆژ داڕێژاوە.
سەعات (٥) هەستان لەخەو، خۆشوشتن، ڕێوڕەسمی نوێژ، بەرنامەڕێژیی.
سەرەتای بەیانی دەبێ چ کارێکی باش ئەنجامبدەم؟ . (٦) چاوخشاندنەوە بەکارەکان، خواردنی نانی بەیانی‌و.....

(٧)

(٨)

کار تا

(١٢)

خوێندنەوە، چککردنی حسابەکان‌و خواردنی نانی نیوەڕ تا کاتژمێر (١).

کار تا عەسر

(٥)

بەکورتی: تایبەتمەندی سەرەکی سەرمایەداری بۆرژوازی کە پێی ئاشنابووین بریتین لە:

١. سنورداری رۆڵی چێژ وەك ئامانج و مەبەست. (بەتایبەت چێژی جنسی).

٢. هەڵگەڕانەوە لەخۆشەویستی و گرنگیدان بە بەدەستێهنانی، موڵکداریێتی و کۆکردنەوە وەك مەبەست و ئامانج.

٣. ئەرکی تایبەتی وەك بەرزترین بەها.

٤. جەختکردنەوە لەسەر (دیسپلین) و گوێنەدان بە بەزەیی و هاوخەمی دەربڕین لەگەڵ هاورەگەز.

ئەگەر ئەم تایبەتمەندییانە لەگەڵ نیشان تایبەتمەندییەکانی پاشی کە پێشتر باسمانکردووە بەراورد بکەین، بەئاسانی بۆمان دەردەکەوێت کە گەلێك لێکچوون و لەهەڤهاتن لەنێوانیاندا بوونی هەیە. ئەگەر ئەم لەهەڤهاتنە راستبێت، کەواتە مافی ئەوەمان هەیە بڵێین کە بونیادی لیبیدۆی کەسی بۆرژوا خاوەن لیبیدۆی پاشی توندبووە. توێژینەوەیەکی تەواو وەسفکردنێکی کامڵی و دەروون شیکارانەی لە تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری بۆرژوا سەرمایەداری ئاشکرا کردووە و

---

سەرەتای شەوە، چ کارێکی باشم ئەنجامداوە (٦) تا (٩) هەموو شتێك لەشوێنی خۆی دابنێمەوە، شێو بخۆم، گوێ لەمۆزك بگرم بحەسێمەوە، قسەبکەم، چاوێك بە بەرنامەکەی رۆژدا بخشێنمەوە.

(١٠) شەو تا (٤) بەیانی خەو

فرانکلین هەروەها لیستێکی (١٣) کاری باش و باڵای ئامادەکردووە کە خاوەن هەمان دیسپلینی مەبەستی ئەوە.

نیشاندەدات کە چۆن و تا چ ئاستێك ئەم تایبەتمەندییانە لەگەڵ پێویستە ئابوورییەکانی سەرمایەداریدا دەگونجێت، لەلایەکی ترەوە وروژێنەرە پاشییەکانی دیکە خۆیان وەك هێزێکی بەرهەمهێنین لە کامڵبوونی ئابووری سەرمایەداریدا[١].

بەهەمان شێوە کە پێشتر گوتمان لەم وتارەدا باس لەمێژووی دەستپێکردنی سەرمایەداریو رۆحی سەرمایەداری ناکەم. بەڵام بۆ دورکەوتنەوە لەهەندێك نادیاریی و لێڵی دەبێ بەفراوانبوونی سەرمایەداری پاوانخوازانە بایەخێك بدەین. ئاشکرایە کە تایبەتمەندی کاراکتەری بۆرژوازی سەدەی (١٩) وردە وردە لەناوچوو، هەروەها سەمایەداری خۆ پێگەیشتووی کلاسیك کە هەم بەرپرس و هەم خاوەن و هەم بەرێوەبەری رێکخراوەکەی خۆی بوو لەحاڵەتی لەناوچووندایە. تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری مامەڵەچی پێشوو زیاتر لەبەردەم سەرمایەداری تازەدا ئاستەنگە نەك یارمەتیدەر. شرۆڤەکردن و شیکردنەوەی رۆحی سەرمایەداری نوێ لەسەرمایەداری هەنووکەییدا لەناوچەی دەروونناسی کۆمەڵایەتی و دەروونشیکاریدایە.

---

[١] پێشتر گوتمان کە لەلایەنی تیۆری سەرەکییەوە ئەم وتارە گرنگییەکی ئەو تۆی نییە، کە بەگوێرەی تیۆری لیبیدۆ قسە بکرێت یان بەهەمان شێوە کە من لەساڵەکانی دواتردا ئەنجامىدا، دەستەواژەی جۆش و خرۆشەکانی لێوانلێو لەوزە بەکاربرێت. دەبێ دوپاتی بکەمەوە کە وەك من پێناسەی کاراکتەری پاشیم لەفرۆیدو نوسەرەکانی دیکەوە وەرگرتووەو بە توێژینەوەی کلینیکی سەلمێنراوە. پێداچوونەوەی من لەکتێبی، "مرۆڤ بۆ خودێتی خۆی" کە تێیدا دەستەواژەی (Hoarding)م لەباتی کاراکتەری پاشی داناوە تەنها ئاماژەکانی نەخۆش وەسف دەکات نەك لەناوچەی ئارەزووە پاشییەکاندا ریشەی داکوتابێت............١٩٧٠.

بەلام لەچینێکی کۆمەڵگادا تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری پێشوو ماوەتەوە: لەچینی ناوەڕاستی خوارەوەدا. لەولاتە پێشکەوتووە سەرمایەدارییەکاندا، وەك ئەڵمانیا، ئەم توێژە هێزی سیاسیو ئابووری خۆی لەدەستداوە، بەلام بەم حاڵەشەوە ئەرکە ئابوورییەکانی خۆی لەشێوەی لەبرەوکەوتووی سەرمایەدارە کۆنەکان (لەسەدەی ١٨-١٩) رادەپەڕێنن. لەوردە بۆرژوازیی هەنووکەیدا هەمان تایبەتمەندی کاراکتەری پاشی کە دەگوترێت تایبەتی رۆحی سەرمایەدارییە دەبینرێت[1].

وا دیارە چینی کرێکار کەمتر لەچینی ناوەڕاستو خواروو خاوەن ئەم تایبەتمەندییە پاشیانە بن یان کەمتر نیشانی دەدەن. ئەم جیاوازییە بەباشی هەستی پیٚ دەکرێت، بەو مەرجەی کە وا گریمانە بکەین کە پێگەی کرێکار لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا ئەم تایبەتمەندییانە رەتدەکاتەوە. دژوارترین پرسیار ئەمەیە: بۆچی ئەندامانی پرۆلیتاریا و

---

[1] شیکردنەوە کاراکتەری چینی ناوەڕاستی خواروو لەئەرکە گرنگە دەروونناسیو کۆمەلایەتییەکانە. خواستی شۆڕشگەرانەی ئەم چینەش شایستەی توێژینەوەیە. ئەم خواستی یاخیبوونو حورمەت بەکەسانی پلەوپایەداری باوك ئاساو دیسپلین لەتایبەتمەندییەکانی کاراکتەری پاشییە. یاخیبوون لەهەمبەر پلەی باوکی نییە کە سەرەڕای هەموو شتێك وەك خۆی ماوەتەوە. ئەم خواستە دوو پێوەرەییە بابەتەکانی دامرکاندن دەکاتە دوو بەشەوە. بایەخدان بە سەرچاوەی دەسەلات بەرەو رێبەری بەهێز ئاراستە دەبێتو، بەشەکەی دی سیمای باوکی رووبەڕووی یاخی بوون دەبێتەوە.
جیاوازی نێوان چینی خوارووی بۆرژوازیو چینی سەرەوە لەنوکتەکانی ئەم دوو چینەدا بەرچاو دەکەوێت کە یەکەمینیان لەمەیخانەکاندا نوکتەی گرێدراوی پاش دەڵێنەوەو دووهەمینیان لەهۆڵەکانی خواردنەوەدا نوکتەی زاوزێی دەگێڕنەوە.

چینی ناوەڕاستی خواروو، کە نە سەرمایەیەکیان هەیە و نە پاشەکەوتێك، هێشتا نیشانەی پاشییەکان لەخۆیان نیشان دەدەن و بەئایدۆژیاکەی پابەندن[1]؟ بەبڕوای من هۆکاری رازیکەر ئەمەیە کە بونیادی لیبیدۆیی لەبن ئەم نیشانانەدا لەرێگەی بنەماڵەو هۆکارە فەرهەنگییەکانی دیکەوە شەرتی (مەرجیکراوە)[2] و لەم رووەوە خاوەن کێش و قورساییەو هێدی تر لەهەل و مەرجی ئابووری ئاماژە پێکراو گۆڕانی بەسەردا دێت.

گرنگی و واتای ئەم جۆرە دەروونناسییە کۆمەڵایەتییە بۆ کۆمەڵناسی چییە؟ یەکەمین بەها لەم راستییەدا شاراوەیە کە دەرفەتی

---

[1] پرسیارێکی گرنگی دیکە ئەمەیە کە تا چ ئاستێك دەتوانین سەبارەت بە زیادبوونی تایبەتمەندییەکانی کاراکتەری زاوزێیی لەنێو چینی ناوەڕاستی سەرەوە قسە بکەین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دژوارە چونکە کاراکتەری زاووزێیی لەدەروونناسی تایبەتی و کلینیکی بەگوێرەی پێویست توێژینەوەی لەسەر نەکراوە.

[2] ئاشکرایە کە شیکردنەوەیەك لەتایبەتمەندییە جیاکەرەوەکان کاراکتەری پرۆلیتاریا بۆ تێگەیشتن لەهۆکارەکانی سەرکەوتن یان بن کەوتنی سۆسیالیزم لەنێو ئەم چینەدا گرنگە. لێرەدا تەنها بەناکۆکی نێوان بۆچوونەکانی مارکس (کە بالابوونی ئازادی مرۆڤ لەسەرووی چالاکی ئابوورییەوە دەبینێت و، مافی بێ شەرت و مەرجی شادی و خۆشحالی مرۆڤ! دەگەیەنێت و لەپەیوەندییە مادیکراوەکانی مرۆڤ لەگەل سەرمایەداریدا رەخنە دەگرێت)و تایبەتمەندییە پاشییەکانی رۆحی بۆرژوازی کە بەهەڵە مارکسیزم بەرژێمێك بۆ دابەشکردنی یەکسانی داهات دەزانێ ئاماژە دەکەم.

پرسیارێکی دیکە لەپەیوەندی لەگەل ئەم بابەتەدا بوونی هەیەو ئەویش سەبارەت بە پاشەکشەی هێزی باوك ئاسا لەئاستی دەروونی و دەرکەوتنی نیشانەکانی دایك سالارییە. بۆ نموونە زەوی دایکی خێرخوازو فێرکارە بۆ منداڵان. لەحالێکدا کە ئازادی ژن خراوەتەڕوو، تایبەتمەندییە فاشیستییەکانی چینی ناوەڕاستی خواروو هێشتا پشت بە دەسەڵاتی پیاو بندەستی ژن دەبەستێت. پەیوەندی ناسیۆنالیزم لەگەل بونیادێکی باوك سالاری فاشیزمیش بۆ خۆی جێگای پرسیارە.

ئەوەمان پێدەدات تا بەهێزە لیبیدۆییەکان لەکاراکتەرو ڕۆڵی ئەوان وەك هۆکارگەلێك کە کامڵبوونی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا و هێزە بەرهەمهێنەرەکانی بەرەو پێش دەبات (یان ئاستەنگ دەکات) تێبگەین. لەم ڕووەوە دەرفەتێك دەرەخسێت تا واتایەکی هەستپێکراو لەلایەنی زانستییەوە کوت‌ومت بۆ واتای "ڕۆح" سەردەمێك تەرخان بکەم. ئەگەر چەمکی ڕۆحی کۆمەڵگا بەم شێوەیە دەرك بکرێت گەلێك ناکۆکی کە لەنوسراوە دەروونناسییەکاندا بوونیان هەیە لەناو دەچن. چونکە زۆربەی ئەم ناکۆکییانە لەم ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرن کە چەمکی "ڕۆح" ئاماژە بە ئایدۆلۆژی دەکات نەك تایبەتمەندییەکانی کاراکتەر کە دەتوانێ بەجۆراوجۆرییەکی زۆرەوە لەئایدۆلۆژیا جۆراوجۆرەکانداو تەنانەت دژە واتایەك پەیدابکات. بەکارهێنانی دەروون شیکاریی گەلێك ڕوانگەی سودبەخش لەتوێژینەوە پرسەکاندا پێش بە کۆمەڵناسان دەکات‌و، هەروەها لەبەردەم بەکارهێنانی نارەخنەگرانەی بابەتە دەروونناسییە دروێنەکان ئاستەنگ دروست دەکات[1].

---

[1] کاری بابەتە دەروونناسییە درۆیینەکان‌و ئاستێك کە سومبارت دیایکردووە. ئەو باسی مرۆڤی سەردەمی بەر لەسەرمایەداری دەکات: ((ئەو مرۆڤێکی سروشتییە، هەمان ئەو مرۆڤەی کە خوا خەلقیکردووە....شێوازە ئابوورییەکەی لەپێش چاوی ئێمەیە، کە لەسروشتی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە)).

ئەم ڕووەکی بوونە لەشیکردنەوەکەی ئەو لەڕۆحی سەرمایەداری ڕژێمی سەرمایەداری کە بەگوتەی ئەو وەك منداڵە، بەرچاودەکەوێت: ((بەهای کۆتایی ئەم جۆرە کەسانە نیشانەری کەمبوونەوەی پرۆسەی شیکردنەوەیی تا سادەترین توخمەکانە.... گەڕانەوەیەك بۆ قۆناغی سادەی ڕۆحی منداڵی. ڕێگەم بدەن ئەم بابەتە بسەلمێنم. چوار کۆمەڵ بەهای سەرەتایی بەسە ر ژیانی منداڵدا زاڵە: (١) بەژن‌و باڵا. (٢) جموجۆڵی خێرا. (٣) نوێبوون. (٤) هەستکردن بەهێز. ئەم بەهایانە، دووپاتی دەکەمەوە تەنها ئەم بەهایانە، لەسیستەمی بەهای مرۆڤی هەنوکەییشدا بەرچاو دەکەوێت)).

# دوایین وتە

لەم کتێبەدا باسی قەیرانی دەروونشیکاریمان کرد. بەلاّم دەبیّ بزانین کە ئەم قەیرانە خۆی لەقەیرانێکی گەورەترەوە سەرچاوەی گرتووە. ئایا ئەم قەیرانە گەورەیە لەکۆمەڵگەی هەنووکەییدایە؟ ئایا لەمرۆڤ دایە؟

سەرەڕای ئەوەی وەلاّمی هەردوو پرسیارەکە پۆزەتیڤە، بەلاّم قەیرانی راستەقینەی هەنووکەیی قەیرانێکە کە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بیّ وێنەیە: **ئەویش قەیرانی خودی ژیانە**. هەڵبەت ئەوانەی کە دەزانن و بایەخدەدەن دەیانەوێت تێگەیشتنەکانی خۆیان روونتر بەیان بکەن. ئێمە رووبەڕووی ئەم ئەگەرە بووینەتەوە کە لەماوەی (٥٠) سالّو- یان رەنگە زووتر- ژیان لەنێو ئەم هەسارەیەدا لەناوبچێت، نەك تەنها بەشەرێکی ناوەکی، کیمیایی، بیولۆژیکی (پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیکی کە هەر ساڵێك چەکی کوشندەترو روخێنەرتر دروست دەکات) بەڵکو: پێشکەوتنی پیشەسازی خاك، ئاو و هەوای پیس کردووەو، پاراستنی ژیان لەرێگەی ئەم سیّ توخمەوە نامومکین دەکات.

ئایا دەروونشیکاری بەم قەیرانەی ژیانەوە پەیوەندی هەیە؟

رەنگە نا! و رەنگە چارەنووسی حاشاهەڵنەگر، ئەمە بێت کە رێبەرانی جیهان و شوێنکەوتووەکانیان لەکاریگەری رق، بەرزەفڕی، نا

وردبینیو دۆگمایی فکری خۆیان بەرەو کارەساتێك دەڕۆن کە کەمینە، کەدەبینین چارەنووسێکی رەش بەرێگەوەیە، لەبەرامبەر ئەوانە وەك گۆرانیبێژەکانی درامی یۆنانی: دەتوانن مەترسییەکە رابگەیەنن بەڵام توانای گۆڕینیان نییە.

بەڵام تا کاتێك ژیان بوونی هەیە کێ دەتوانێت نائومێد ببێت؟ مادام ملیۆنان مرۆڤ دەژین، هەناسە دەدەنو پێدەکەنن، دەگرین و هیوادارن، کێ دەتوانێ بێدەنگ بمێنێت؟ زیندەوەرناسان، کیمیا ناسان، دەرونندسان، جیل ناسان[1]، ئابووری ناسان، پزیشکان، فەیلەسووفەکان، کۆمەڵناسانو فیزیۆلۆژیستەکان سەبارەت بەو هەڕەشەیە دواونو، دیسان دەدوێن، بەڵام نەزۆربەیان، بەڵکو هەندێکیان. دەروونشیکار دەبێ لەروانگەی خۆیەوە قسەبکات، ئەویش، وەك کەسانی دیکە دەزانێ کە کات کورتەو دەبێ پرسە سەرەکییەکان بخاتەڕوو.

لەم بارەدا من تەنها دەتوانم پشت بەوە ببەستم کە لەڕوانگەی فیکری خۆمەوە گرنگەو، هەوڵمداوە بۆچوونەکانی خۆم لەم وتارانەدا بخەمە ڕوو. رەنگە باسکردنی کورتەیەکیان لەکۆتایی ئەم وتارانەدا سودبەخش بێت: یەکەم ئەوەی کە دەرونشیکاریی سەرقاڵی زانیاری قەیران دەبێت، لەخەیاڵە کوشندە و لۆژیکیکردنەکان کە هێزی کار ئیفلیج دەکەن پەردە هەڵدەماڵن. دیسان لەم بڕوایەدام گرنگترین بابەتێك کە دەرونشیکاریی دەتوانێ تێیدا بەشداربێت پرسی تێگەیشتن

---

[1]. Geneticist

لەخودی ژیان و شێوازەکانییەتی. لێرەدا دەبێ دەرونشیکاریی لەفرۆید جیاببێتەوە، ئەو لەنیوەی دووهەمی ژیانی خۆیدا لەو بڕوایەدابوو کە جۆش‌وخرۆشی مەرگ و وێرانکەری وەك هەوڵدان بۆ ژیان بەشێکی بنەڕەتی و نەگۆڕی کاراکتەری مرۆڤە. ئەوانی دیکە وەك "لورتز" لانی ئەوەیان لێداوە، کە هەرچەند لەڕوانگەی تیۆرێکی جیاوازەوە، توندوتیژی و دەستدرێژی مرۆڤ زاتییەو کۆنترۆڵکردنی دژوارە.

لەم حەزو سەرنج و دۆزینەوەی تایبەتمەندی زاتی وێرانگەری (کە بۆ لۆژیکیکردنی ریکۆردو کەمتەرخەمی سەبارەت بە مەترسی شەڕ زۆر گونجاوبوو) هیچ کارێك بۆ جیاکردنەوەی بەشە جۆراوجۆرەکانی توندوتیژی ئەنجام نەدراوە. توندوتیژی پەرچەکردایی لەخزمەتی ژیان و وەك بەرگرییەکە لەهەمبەر هەڕەشە راستەقینە - یان ئەگەری لەسەر بەرژەوەندییە ژیانییەکان، **سادیزم**، ئارەزووی دەسەڵاتی رەها و کۆنترۆڵی تەواوەتی مرۆڤ، **وێرانگەریی**، نەفرەت لەژیان و ئارەزووی لەناوبردنی. بۆچی کەسێك ناتوانێ لەنێوان جۆرە جۆراوجۆرەکانی توندوتیژیدا جیاوازی دابنێت؟ هەڵبەت ناتوانێ تەنانەت هەل‌ومەرجی دەرکەوتن و توندبوونی هەر کامەیان لێکبداتەوەو رێگای کەمکردنەوەی توندییەکەیان بدۆزێتەوە.

لەڕوانگەی منەوە، بنەڕەتی ترین پرس، ناکۆکی نێوان جۆش و خرۆشی ژیان و جۆش‌وخرۆشی مەرگە. ئەم دوانە خواستی هاوتەریبی بیۆلۆژیکی نین، بەڵکو یەکدەکی (علی البدل) یەکەین. (جۆش‌وخرۆشی مەرگ پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ کاراکتەری پاشی بەدخویی فرۆید هەیە). هەردوو خواستەکە بەزۆری لەکاتێکدا کۆدەبنەوە، ئەوەی

گرنگ‌و شایانی سەرنجدانە توندی هەر کام لە جۆشانەیە. زۆربەی خەڵك جۆش‌وخرۆشی مەرگییان نییە[1]. بەڵام لەکاتی قەیراندا دەکەونە ژێر کاریگەری جۆشی مەرگەوە، ئەوانەی کە جۆش‌وخرۆشی مەرگیان هەیە، هەمیشە نائومێدن. رەنگە خەڵك بکەونە ژێر کاریگەری دروشم‌و ئایدۆلۆژیاکانی خۆیان، هەڵبەت ئامانجی راستەقینە واتە وێرانگەری شاردراوەیەو عاقڵانە دەرکەوتوون. شەیدایانی مەرگ بەناوی شانازی، دیسپلین، دارایی‌و، رابردوو دەدوێن. بەڵام هەندێك جاریش بیانوویان داهات‌و، ئازادی‌و دادپەروەرییە. دەروونشیکاری فێرماندەکات کە گومان لەقسەکانی خەڵك بکەین، چونکە قسەکانی ئەوان تەنها ناوەڕۆکی هەستی ئەوان لەخۆدەگرێت. هەروەها فێرمان دەکات کە چۆن ئەوەی لەنێوان دێڕەکاندا نوسراوە بخوێنینەوە، چۆن بەگوێچکەی "سێهەم" ببیستین، چۆن لەئاماژەکانی سەرو دەست‌و شوێنەکانی دیکەی جەستە لە ناخی خەڵك ئاگاداربببینەوە.

دەروونشیکاری دەتوانێت یارمەتی خەڵك بدات تا شەیدایانی مەرگ لەپشت دەمامکە ئایدۆلۆژیکەکانی ئەوانەوە بوەستێنن‌و، چییەتییەکەیان ببینن نەك تەنها قسەکانیان ببیسن، دیسان با شەیدایانی ژیان، نەبەقسەکانیان، بەڵکو بەبوون‌و چیەتییەکەیانەوە پەی ببەن گرنگتر ئەمەیە کە دەروونشیکاری یارمەتیمان دەدات تا

---

[1] مایکڵ ماکۆبی نیشانی داوەکە نزیکەی ١٠٪ خەڵکی ئەمریکاو مەکسیك جۆش‌و خرۆشی مەرگیان هەیە.

جۆش‌وخرۆشی ژیان‌و جۆش‌وخرۆشی مەرگ لەبوونی خۆماندا بدۆزینەوە، ململانێی نێوان ئەو دووانە ببینین‌و خوازیاری سەرکەوتنی جۆشی ژیان، بە سەر دوژمنەکەیدا واتە جۆشی مەرگ بین. قسەکردن بەدروشم گەلێك بە ناوی ویژدان، ئاشتی، مرۆڤایەتی نادیارو بێ کاریگەرن، مەگەر بەدروشمێك کە قسەکردن بەوەدەست پێ بکات‌و کۆتایی پێبێت: "**بەناوی ژیان**".